# چەند لێکۆڵینەوەیەک

# دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد



کامەران جەمال بابان زادە

2005

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٢٤)

# چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزافی هاوچەرخی کورد

نووسینی/ د.عوسمان عەلی

و/ کامەران جەمال بابان زادە

سلێمانی ٢٠٠٥

# چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزافی هاوچەرخی کورد


نووسینی/ د. عوسمان عەلی

وەرگێڕانی /کامەران بابان زادە

بابەت: لێکۆڵینەوە

تایپ و نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

هەڵەبڕی: ئەکرەم ئەحمەد

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

بەرگ : دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی دێکان

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٢٣٣)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnbiri . org

# نـــــــــــــــا وه رۆ ك

=== === === === ===

# پێشـــەکی

بەشـــی یەکـــەمی کتـــێبی (چـــەند لێکۆڵینەوەیـــەك دەربـــارەی بزاڤـــی هاوچـەرخی کـورد) دەکەوێتـە بەردەسـتی خوێنـەران. لای مـن بیرۆکەیـەکی سادەتری هەبوو لەوەی لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەو بەشەکانی‌تر دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران، کاتی خۆی کۆمەڵێك وتاری پڕ بایەخی بەڕێز دکتۆر عوسمـان عـەلی لـەگۆڤاری (ئـاڵای ئیسـلام) بڵاوکرایـەوە، لەگـەڵ زنجیرە موحازەرەیەکی ئێوارانی بەڕێزیان لەکۆتایی ساڵی ١٩٩٢لەبینایەی ئەوکاتی (پەیوەندی .أ . خ. ل.ك). ئەوکات تێگەیشتم دکتۆر خویندنەوەیەکی تازەی بۆمێژووی کورد پێیە لەگەڵ پشت بەستن سەرچاوەو دیکۆمێتی تازە، دواتر لەمیانەی خوێندنەوەی کۆمەڵە وتارێکی دکتۆر بەزمانی عەرەبی وەرگێڕانیم بۆ سەر زمانی کوردی بەپێویستزانی، لەسەرەتاوە لەئابی ٢٠٠٠ لەو چەند وتـارەوە دەسـتم پێکـرد، هـەتا لەقـەبارەی کتێبێکـی مـام ناوەنـدی بـڵاوی بکەمەوە، هەواڵم بەنووسەردا، سەرەڕای خۆشحاڵی هەموو ئەو نووسینانەی دەســتنووس بـوون لەنامـەی دکتۆراکـەی‌و ئـەوانی‌تری بۆنـاردم، لـەدوای بـەردەوام شـەونخونی بـەوەرگێڕان‌و پێداچوونەوەو پـەراوێزدانان بـۆ ئـەم بەرهەمـە خوازیـارم بۆشـاییەکی بەسـوودم لەپەرتوکخانـەی کـوردی لەسـەر مێژووو فەرهەنگی میللەتەکەم پڕکردبێتەوە.

ئەمەی بەردەستان لەزمانی عەرەبی وەرگیراوەو بەشی یەکـەمی کتێبێکـی قـەبارە گەورەیـە، بەشـی سـەرەکی لـەم کتێبـە نامـەی دکتـۆرای نووسـەرە کەلەساڵی ١٩٩٣پێشکەشی بەشی دیراساتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی زانکۆی

تۆریتـۆی وڵاتــی کەنــەدای کــردووە ، ئـەوانی‌تری بەپێویســتی زانیـوەو بەدواداچوونی لەسـەر کردوون. هـەروەها چەند بابـەتێکی بـەپێزی فیکریو سیاســی نووســەر کــە دەچــنە خانــەی مێــژووی فیکــریو سیاســیەوە، وەرگێڕاوەتـــە ســـەر زمــانی کــوردی ئـــەویش ئامــادەی چــاپەو بــۆ دەرفەتێکی‌ترمان هەڵگرتووە .

نووسـەر لـەدایکبووی کەرکوکـەو لەسـەرەتای هەشـتاکانەوە لـەدەرەوەی وڵات دەژی، سەرەڕای کاری ئەکادیمی رۆشنبیرێکی دیارەو لەگەڵ خۆزگەو ئاواتەکانی گەلەکەی دەژی، نووسەرو رۆژنامەنووسو مامۆستای زانکۆیـە، ئەم بەرهەمەی سەرەڕای خوێندنەوەیەکی تازەی بۆمێژوو پشت ئەستوورە بەسەرچــاوەو دیکــۆمێنتی مێــژوویی، ئێمــە زۆر پێوســتمان بــەم جــۆرە خوێندنـەوە واقیعـیو فـرە رەهەندانە هەیـە بۆمێـژووی میللەتەکـەمان. لەناو رەهەنـدە جیاجیاکــان کاریگــەری دەولــی شــوێنی دیــاری لــەناو رەهەنــدە کاریگەرەکانی خوێندنەوەی نووسەردا هەیە.

لەم پێشـەکیەدا نامـەوێ باسـی نـاوەرۆکی ئـەم کتێبـەو ئەو دیکۆمێنتانـە بکەم کە لێرەدا بڵاوکراونەتـەوە، لەبەردەستدایەو خوێنـەر بەپـێی سـەلیقەو لێووردبوونـەوەی دەتوانێـت سـوودی لێوەربگرێـت، بـەڵام بـۆوەرگێڕدراوی کوردی دەمەوێ چەند سەرنجێك بخەمەڕوو

* ئەمە بەشی یەکەمەو لەبەشەکانی‌تر دێنە سەر دوا لێك هەڵوەشانەوەی دەوڵـەتی عوسمـانیو بـارووددۆخی کوردسـتانو بەرئـەنجامی خـزینی هێـزە ئەورووپیـەکانو چارەنووسـی کـورد لـەم وەرچـەرخانە تـازەی دوای شـەڕی یەکـەمی جیهـانی، لەگـەڵ دوو بابـەتی تایبـەت بەجولانەوەی بـارزانی١٩٤٢-١٩٤٤ز و کۆمــاری کوردســتانی ١٩٤٦-١٩٤٧. نووســەریش لەپێشــەکی

عەرەبییەکـەی رایگەیانـدووە ئەمـە هـەموو پێکـەوە بـەرگی یەکەمـەو بـەرگی دووەمی بەدوا دادێت.

*چـەندەی بلـوێ هـەوڵم داوە خـۆ لـەوەرگێڕانی وشـە بەوشـە ببـوێرمو تێگەیشـتنی نووسـەر بگەیەنمـە خوێنـەران بێجگـە لەدەقـە دیکۆمێنتـەکان چـەندە لـەم هەوڵەمدا سـەرکەوتووم خوێنـەرانو رۆشـنبیران حـوکمی لەسـەر دەدەن.

* ئەو دەقە عەرەبییەی من پشتم پێ‌بەستووە کەمێکیان دەقی بڵاکراوەو ئەوانی‌تر بەپۆستی ئەلیکترونی لەنووسەرەوە بەدەستم گەیشتووە، لـەدوای بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە بـەزمانی عـەرەبی لەچـەند شـوێنێك گۆڕانکـاریو دیکـۆمێنتی زیـاتری مێـژوویی تیـا بـوو کـە پێشـتر بەدەسـتم نەگەیشـتبوو. بـەگوێرەی توانـا پیاچـوومەوەو ئەوانیشـیم وەرگێـرا بـەڵام ئـەوەی پێویسـتی بـەئامـاژە هەیـە ئـەو بابەتـەی لەسـەر شـێخ عوبێدوڵڵایـە زۆر درێـژترو پڕلەدیکۆمێنترو دەوڵەمەنـدتر بـوو لـەوەی پێشـتر بـۆی رەوانـەکردبووم، هـاتم دەقـی یەکـەمم بـەهـی دووەم دەوڵەمەنـد کـرد، ئـەوەی لـەو بابەتـە دەقـە عەرەبییەکـە بخوێنێتـەوە لـەرووی داڕشـتنەوە جیاوازیـەك هەسـت پێ‌دەکـات. هـەروەها بابـەتێك لەسـەر مـیری رەوانـدز هـەبوو پـێم وابـوو کورتـەو زیـاتر رووخساری وتاری سیاسی دەنواند بۆیە دام نەبەزاند.

* لەو شوێنەی بەپێویستم زانیبێت پەراوێزم بەئیشارەتی (*) بۆ داناوە بەڵام بەگشتی خۆم لەپەراوێز بواردووەو بەپێویستم نـەزانیوە لەهـەر جێیـەك بۆچـوونی جیـا یـان روونکردنـەوەم هـەبێت قسـەی لەسـەر بکـەم ئـەگینا سـەرەڕای هـاوڕایی لەگـەڵ زۆربـەی هـەرە زۆری بابەتەکانـدا، کۆمـەڵێك قەناعـەتی جیـام هەیـە لەگـەڵ نووسـەر، ئەمـەی منـیش هـەردوو ئەگـەری هەڵەبوونو هەڵەنەبوون هەڵدەگرێ.

* ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی مێژوویەك بەکارهاتووە تایبەتە بەکەلتووری عوسمانیو هەندێکیان لەبەرامبەردا وەرگێری عەرەبی بەمێژووی زاینیی بەراوردی کردووە، بەڵام هەندێکیان وەکو خۆی هێشتۆتەوە منیش قسەم لەسەر نەکردووە.

لەکۆتایی سوپاس‌و ڕێز بۆئەوانەی هاندەرو هاوکارم بوون لەم پڕۆژە بەنرخەدا، خوازیارم کەلێنێکی باشم لەکتێبخانەی کوردی بڕکردبێتەوە، خوا یاربێت بەشەکانی‌تریش بەم زووانە دەگاتە دەستی خوێنەران.

کامەران بابان زادە

# ململانێی رووسی ـ عوسمانی لەناو دەوڵەتی عوسمانی دا(*)

- ململانێ رووسی ـ عوسمانی لەناو دەوڵەتی عوسمانی
- کۆمەڵگای کوردی لەسەدەی نۆزدەهەم
- کورد لەشەڕی رووسی ـ عوسمانی ( ١٨٢٨- ١٨٢٩ )
- راپەڕینەکانی کوردو ململانێی عوسمانی ـ رووسی ـ ئینگلیزی
- کوردو شەڕی قەرم ١٨٥٣-١٨٥٦
- شەڕی رووسی ـ عوسمانی
- پوختەی توێژینەوە

بەدرێـژایی ململانێـی سـەدەی نۆزدهـەمی نێـوان دەوڵـەتیعوسمانیو
رووسی کورد رۆڵـی بەرچاوی هـەبووە. تـێ گـەیشـتن لـەرۆڵـی ئەوکاتـەیکورد
گرنگـە بۆتێگەیشـتن لـەرۆڵـی کـورد لـەململانێ ئیقلیمیـەکانی ئـەمرۆ. ئـەم
لێکۆڵینەوەیە بۆمەبەستی رۆڵیکوردو هۆکارە کاریگەرەکانیەتی، هەریـەك لـە
دەوڵـەتی عوسمـانیو ڕووسـیای قەیسـەری بەدرێـژایی مـاوەی ململانێـی
نێوانیـان لـە هـەوڵـی ئـەوە دابـوون کـورد بـەلای خۆیانـدا ڕابکێشـن .
کوردەکـانیش لـە هـەوڵـی ئـەوەدابوون سـوود لـەو ناکۆکیـە وەربگـرن بـۆ
گەڕاندنەوەی دەسەلاتی میرنشینە سەربەخۆکانیان کە سوڵتان مەحموودی
دووەم لە نیووەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لەناوی بردبوون.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە رۆڵـی کـورد لـەو ناکۆکیانـە جـەخت دەکەینـە سـەر
هۆکارە کاریگەرەکانی کۆمەلگای کوردی لە سەدەی رابردوو. بەریتانیا وەکو
هێزی سێیەم رۆڵی بەرچاوی لە ناکۆکی عوسمانی ـ رووسی دا بینی، بۆیە
لـە سـەرەتاوە پێویسـتمان بـە باسـکردنی هۆکـارە کاریگـەرەکانی رۆڵـی
بەریتانیا هەیـە کـە لـەدواین نـاکۆکی لەگـەڵ رووسیاو هەوڵـەکانی دەوڵـەتی
عوسمـانی بـۆ سـەرکوتکردنی ڕاپەڕینـەکانی کـورد لایـەنگری دەوڵـەتی
عوسمانی بووە، دوایی دەچینە سەر لێکۆڵینـەوە لەڕۆڵی کورد لەشـەڕەکانی
رووسی ـ عوسمـانی بەتایبەتی شەڕەکانی سالانی١٨٢٧ـ ١٨٢٨ز و شـەڕی
قەرمی١٨٥٤و شەڕەکانی١٨٧٧و١٨٧٨.

لـە سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهـەم نـاکۆکی رووسـی ـ بـەریتانی چـووە
قۆنـاغێکی هەسـتیارترەوە، ئـەو دەسـتکەوتانەی رووسـیای قەیسـەری لـە
شەرەکانی لەگەڵ هەریەك لـە ئێـرانو دەوڵـەتی عوسمـانی بەدەسـتی هێنـابوو
مەترسی هەبوو بۆ سەر بـەریتانیا، ئەو بەگومانەوە دەیڕوانیە چاوتێبڕینی

رووسیا بۆ گەیشتنی بەئاوەگەرمەکان لەکەنداوی فارسی (کەنداوی عەرەبیشی پێدەڵێن).

بەریتانیا فراوانخوازی رووسی بەرەو باشوور بەهەرەشە دانابوو بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی ئەو لەکەنداو، پێی وابوو دوائامانجی رووس کەنداو نیە بەڵکو کۆنترۆڵکردنی ئەو رێرەوەستراتیژیە ئاویەیە کە بەریتانیا دەگەیەنێتە بەرژەوەندیە گرینگەکانی لە نیوەدوورگەی هیند. ئەوەی شایانی باسە ئێران بەهۆی تێکشکانی لەبەرامبەر رووسیا ناچاری مۆرکردنی رێکەوتنامەی گوڵستانی ساڵی١٨١٣ز بوو، بەپێی ئەو رێکەوتنامەیە وازی لە هەرێمەکانی دەربەندو قەرەباغ هێنا بوو. رێکەوتنامەی (تورکمانچای ) ساڵی ١٨٢٧ز کە دوای شەڕی رووسیای - عوسمانی ئیمزا کراو پێگەی دەستکەوتەکانی رووسیای لەقەوقاز بەهێز کرد، هەرێمەکانی یەرڤان ونەخچەوانی بۆ زیاد بوو(١).

ئەو دەستکەوتە گرنگانەی رووسیا لە ناو دەوڵەتی عوسمانی بەدەستی هێنا بوو کەمتر نەبوو لەو دەستکەوتانەی لە هەرێمەکانی ئێرانی بەدەستی کەوتبوو، لەدوای تێکشکانی گەورەی هێزەکانی عوسمانی لەبەرامبەر هێزەکانی موحەمەد عەلی پاشا (١٨٠٥-١٨٤٨) کە بووە هۆی لەدەستدانی زۆربەی ولایەتەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆل، سوڵتانی عوسمانی هەستی کرد دەسەڵاتی لە ئەستەمبوڵ لەمەترسی دایە، بۆیە ناچار کرابوو رێکەوتنامەی (ئەنکیار سکیلسی) ساڵی ١٨٣٣ز ئیمزا بکات، بەپێی ئەو رێکەوتنامەیە دەوڵەتی عوسمانی پارێزەری بەرژەوەندیەکانی رووسیایە، ئەو رێکەوتنامەیە کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر پێشبرکێی بەریتانیو رووسی بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی زیاتر لە ناو دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە هەریەك لە(بالمرسۆن) سەرۆکی وەزیرانی بەریتانی و(ستافۆرد کانتیگ)ی

بالّویزی بەریتانی لە دەولّەتی عوسمانی بوونە ناحەزترین کەسی دژ بە رووسیا(٢).

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ناکۆکی رووسی - بەریتانی لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست پەیوەست بووە بەراگرتنی هاوسەنگی هاوکێشەی ساحەی ئەوروپی، بەریتانیا هەستی کرد کە زیاد بوونی دەسەلاّتی ڕووسیاو پەیدابوونی بەرژەوەندیەکانی لە دەرەوەی ئەوروپا دەسەلاّتی لەسەر ساحەی ئەوروپی بەهێز دەکات کە بەریتانیا خۆی بە پارێزەری دەزانی و توانای خۆی لەمانەوەی موستەعمەراتەکانی دا دەبینێتەوە و نایەلّی ئەوانی تر هاوکێشەکە تێك بدەن، بۆیە بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم پاراستنی دەولّەتی عوسمانی و ڕێگەگرتن لەخزینی رووسیا بەئاڕاستەی ئاوەگەرمەکان (کەنداوو ئۆقیانووس) لەئەولەویاتی سیاسەتی بەریتانیا بووە.

## کۆمەڵگای کوردی لەسەدەی نۆزدەهەم دا

جوگرافیای سیاسی و سروشتی کۆمەڵگای کوردی رێگربووە لەبەردەم کورد تا رۆڵی گرنگ بگێرێ لەناکۆکی رووسی - عوسمانی کە کوردستان ببێتە پێگەی زۆربەی شەرەکان، ئەوەی ئێستا بۆ ئێمە گرنگە دیاری کردنی هەرێمە کوردیەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیە.

توێژەرەوانی رۆژاوا لەکاتی وەسف کردنی هەرێمە کوردیەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی دەمارگیرن بۆیە ئاماژە دەکەن بە(ئەرمینیا) یان (کوردستان).

بەر لەشەری یەکەمی جیهانی دەبینین یەکەمیان زۆرتر بەکار هاتووە کە ئاماژە بووە بۆ ئەو دەڤەرانەی زۆرینەی کوردن لەولایەتەکانی ئەنادۆڵ وەکو وان، بەدلیس، مەعموریەی ئەلئەزیز، ئەرزرۆم، سیواس، دیاربەکر، بەلآم زاراوەی کوردستان لەزۆربەی ئیشارەتەکان بۆهەردوو ولایەتی وان و دیاربەکر لە باشووری رۆژهەلآتی ئەنادۆڵ و ولایەتی موسڵ (باکوری عێراق) بەکاردەهات بەلآم لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتی عوسمانی ولایەتێکی تازەی پێك هێنا و ناوی نا (کوردستان) ئەو ولایەتانەی دەگرتەوە زۆرینەی کوردن لەباشووری رۆژهەلآتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) کە لەچیای تۆرۆسەوە درێژ دەبۆوە بە درێژایی (ئەدەنە) هەتا دەگاتە سنووری تورکیا و ئیران لە رۆژهەلآتی دەریاچەی ورمێ. بەوە زۆربەی ئەو قەزاو ناحیانەی دەگرتەوە کە دەکەونە رۆژهەلآتی ئەرزرۆم و بەرێکی و بەدرێژایی

سنووری تورکیا بەختێکی باریك دەچێتە نێوان هەردوو دەوڵەتی ئازەربێجان و ئەرمینیا(٣).

لێرەوە بەدیار دەکەوێ کە کورد زۆرینەی دانیشتوانی ناوچە سنوورییەکانی تورکیا لەگەڵ ئێران و تورکیا لەگەڵ ڕووسیا پێك هێناوە، ئەم هەڵکەوتنە جوگرافیەش گرنگی سیاسی هەیە لەناکۆکی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ هەریەك لە رووسیا و ئێران.

لە *تایبەتمەندییەکانی* دەسەڵاتی عوسمانی لەماوەی نێوان سەدەی شازدەهەم بۆ هەژدەهەم سەربەخۆیی میرنشینە کوردیەکان بوو، ئەو میرنشینانەی لەلایەن میرە کوردەکانەوە پشتاوپشت کاروباری خۆیان بەسەربەخۆیی بەڕێوەدەبرد(*) بەڵام سوڵتان مەحمودی دووەم لە ژێرکاریگەری ڕاوێژکارە غەربزادەکانی و لە چوارچێوەی نەخشەی چاکسازی‌دا بەسەر ئەو میرنشینانەدا زاڵ بوو، لەجێگەی ئەوە بەڕێوەبەرایەتی مەرکەزی (زۆربەی کاربەدەستەکانی تورك بوون ) دانا، هەروەها تەنزیمات (چاکسازی لەسەر شێوازی رۆژاوا) لەساڵانی ١٨٣٩-١٨٧٦ز کۆمەڵە هەنگاوێکی دەوڵەتی عوسمانی بووە بۆچەسپاندنی دەسەڵاتی دەوڵەت، بەمەش دەستی گرت بەسەر سەرکردە تەقلیدیەکانی کورد.

بەهۆی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لەناو فەرمانبەرو جەندرمە (هێزی پۆلیسی عوسمانی)و بێئاگایی ئەوان لەحالەتی ئیداری و سیاسی کورد و بەڕێوەبردنێکی پاك، ئاکامێکی باشی لێنەکەوتەوە، کوردستانیش هەرگیز ئیدارەی مەرکەزی بەخۆوە نەدیبوو، بۆیە کارگەیشتە دروستبوونی بۆشایەکی ئەمنی لەناوچەکەداو بووە هۆی بڵاوبوونەوەی دزی و دەست بەسەراگرتن و شەڕی نێوان هۆزەکان، هەروەها بووە هۆی سەرهەڵدانی

شەڕیکوردو ئەرمەن. هەر لەوماوەیەدا ئەرمەن بەبێماندوبوون دەستیان گرتبوو بەسەر بازرگانیناوچەکە، لەلایەکیترەوە چینیئاغاکان (سەرۆك خێڵەکان) هاوشان لەگەڵ ئەرمەن ئەمەیان بەدەرفەت زانی بۆچەوساندنەوەی جوتیاران و توێژەکانی تری کۆمەڵگا(٤).

کۆمەڵگای کوردی بەگشتی لەوبارودۆخە گرانەدا هیچ داڵدەو ڕێگەچارەیەکی نەبوو پەنای بۆببات بێجگە لە شێخەکانی تەریقەت، کەلەو ماوەیەدا لە کوردستان زۆر بلاّوببوونەوەو پەرەیان سەندبوو بەتایبەتی هەردوو تەریقەتی نەقشبەندیو قادری، ئەمانە دەسەلاّتی سیاسیان پەیداکرد هەتا سەرۆك خێڵەکان حەسوودیان پێ دەبردن، سەرەڕای پەیدابوونی دەسەلاّتی روحی تەکیە (مەڵبەندی بانگەوازی سۆفیگەری)کانو مەرکەزیەتیان لەناو کورد. شێخەکان بەرگریان لەبەرژەوەندی جوتیاران دەکردو لەهەوڵی ئەوە دابوون سنوورێك بۆ هەڵپەرستیو خۆسەپاندنی ئاغاکانی کورد دابنێن، لەلایەکیترەوە ببوونە جێی ئومێدی کورد بۆ پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانیان لەلای حکومەتی عوسمانیو لەلای بەڕێوەبەرایەتی هەرێمە کوردیەکان لەبەرامبەر سەپاندنیباج ئەو باجو سەرانەی کە جوتیاری کورد هیچی بۆ نەدەمایەوە، سەرەڕایی خۆسەپاندنو خزمەتی بەبێگارو بەکارهێنانیهێز لەبەرامبەر جوتیاریکورد(٥).

بەم پوختە باسەی کۆمەڵگایکوردی لەسەدەی نۆزدەهەم دوو راستی بنەڕەتیمان بۆبەدیار دەکەوێ :-

یەکەمیان:- زۆربەی کوردەکانو سەرکردە کلاسیکیەکان ناڕازیبوون لەدەسەلاّتی عوسمانی چونکە دەستیگرتبوو بەسەر ئەو ڕژێمە تایبەتیەی کەچەند سەدەی رابردوو لەکوردستان باوبووە، لەجیاتیئەمە دەسەلاّتی تورکیسەپاند کەدەست پاك نەبوونو بەزەبری هێز حوکمیکوردیان دەکرد.

دووەمیـان :ــ لاوازی لەبـەڕێوەبردنی عوسمانیولـەدە سـتدانیئەمن و ئاسایشو بلاٌوبوونەوەی بەرفرانی زولٌمو زۆرداری کاربەدەستانی تورك یان ئاغاکـانی کـورد، زەمینـەی لـەباری خۆشـکرد بـۆ سـەرهەڵدانی شـێخایەتیو سۆفیگەری وەك ڕژێمێکیچالاك لەناو کورد.

ئەم دوو هۆکارە ڕۆڵیگەورەیان هەبووە لەسەر هەڵوێستی کورد لە ماوەی ناکۆکی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ڕووسیا کە لەمەودا ڕوونی دەکەینەوە .

## کورد لە شەڕی عوسمانی ـ ڕووسی١٨٢٨ ك ـ١٨٢٩

بایـەخ پیـدانی ڕووسـیا بـەکورد دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەرەتایی سـەدەی نۆزدەهـەم، بۆئەمـەش کۆمـەڵێك هۆکـار هـەبوون بۆئـەو فراوانخوازیـەی قەیسـەرەکانی ڕووس لـە نـاو خـاکی دەوڵـەتی عوسمـانی. بەسـەرهاتی ئـەم گرنگـی پێدانـە بـە درێـژی لـە کتێبـی (کوردسـتان لـە سـالانی شـەڕییەکەمیجیهانیدا)ی د.کـەمال مەزهـەرو کتێبـی (گـەڕۆکی ڕووس)ی د.مارف خەزنـەدار باس کـراوە. ئـەوەی شایانیباسـە گـەڕۆكو دیبلۆماسو نوسـەرانی ڕووسـی کۆمـەڵیك لێکۆڵینـەوەیان بـۆ بەجێهێشـتووین لەسـەر حالـەتی کۆمەلاٌیـەتیو سیاسـی ئـەو سـەردەمە، لـە پێشـەوەی بایەخـداران (فلادمێر مینۆرسکی)و توێـژەرەوەی ڕووسـی جولەکە (لازاریـف)و (ئیڤانۆڤ) کە بایەخیان بە دیراساتیکوردی داوەو بە شێخی ڕۆژهەلاٌتناسان ناسراون.

ڕووسـەکان لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم بـۆ مەبەسـتی بەدەسـتهێنانی دەسکەوتی ئیستعماری لـە نـاو خـاکی هـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانیو ئیرانـی زیـاتر بایـەخیان بـە کـورددا. بەمـەش سـنووری ڕووسـیا لـە دەوڵـەتی عوسمانیو بەتایبەتی لە ئەنادۆڵی خۆرهەلاٌت ڕاستەوخۆ بەیەك گەیشتن کە

ئەو هەرێمە کوردیانە دەگرێتەوە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن. سوڵتان مەحمودی دووەم لە ساڵی١٨٢٦ز بە ئامۆژگاری راویژکارە رۆژاوایەکانی لە باڵەخانەی عوسمانی قەسابخانەی بۆ سوپای ئینکشاری (سوپای تەقلیدی عوسمانی) دانا. ئەم کارە ئاکامی باشی نەبوو، پێش ئەوەی کاتی خۆی بێت ئەنجام درا، سوڵتان سوپای جێگرەوەی هاوچەرخی بۆ ئامادە نەکردبوو. ئەمەش بۆشاییەکی سەربازی لەسنوورەکانی ڕووسی — عوسمانی دروست کرد، لە شەڕەکانی(نیڤاریا) لەیونان لە ساڵی١٨٢٧ز کەشتیگەلی بەریتانیو فەڕەنسیو کەشتیگەلی عوسمانی کەشتیگەلی محەمەدعەلی پاشایان تێکشکاند، بەمەش ڕێگە کرایەوە لەبەردەم هێزەکانی ڕووسی پێشڕەوی بکەن بۆناو دەوڵەتیعوسمانی، لە ساڵانی١٨٢٧-١٨٢٨ز بەبێ هیچ بەرگریەك جێگای باس بێت توانیان زاڵ بن بەسەر زۆربەی شارە گرنگەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵو بەتایبەتی شاری قارسو بایەزیدو ئەرزڕۆم.

ئەو هێزە کەمەی رووس بەهۆی هەڵوێستی بێلایەنی کورد بەبێ هیچ بەرگریەکی هۆزە کوردەکان هاتنە ناو هەرێمە شاخاویە سەختو دۆڵە قوڵەکان، توێژەرەوان ئەم هەڵوێستەی کورد دەگەڕێنەوە بۆ هەوڵی میر (گراف باسکۆفیچ) جێگری مەلیکی قەوقازو فەرماندەی باڵای هێزەکانی رووس، باسکۆفیچ بۆ گرێدانی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات بە ئیمپراتۆریەتەکەی نەخشەی داگیرکردنی ئەو هەرێمانەی دارشت، ئەمەش لە چوارچێوەی نەخشەی بایەخدان بە هۆزە کوردەکانی سەر سنوور لە دیراسەکردنی لایەنی کۆمەڵایەتیو سیاسیو دابین کردنی دۆستایەتی لە ریگەی بەستنی هاوپەیمانیەتی هاوبەشو بەخشینی پلەوپایەی شانازیو دیاریو پارە بەسەرۆك هۆزە چالاکەکان. هەندێ جاریش سزای توند لەگوند سووتاندنو

سەروەتو سامان بەتالآن بردنو زەوتكردن بەسەرا دەدرا هەتا ببێتە پەند بۆ ئەوانیتر، باسكۆفیچ باش شارەزایی هەبوو بە كۆمەڵگای خێلایەتی كوردو هەوڵی دەدا سوود لە ناكیەكان وەبگریٚ بۆ بەرژەوەندی خۆی. لە بروسكەیەكی تشرینییەكەمی ١٨٢٩ز بەم شێویە دەنووسیٚ:_هەموو دەسكەوتەكانمان تووشی مەترسی دەبێت ئەگەر نەمانتوانی سەرنجی كورد بەلای خۆماندا رابكێشین، چونكە گەلێكی نەبەردو ئازاترین چەكداری رۆژهەلآتیان هەیە، دەتوانن رێگای پەیوەندی هێزەكانمان ببڕنولە هەموو لایەكەوە هێرشمان بۆبهێننو گەورەترین زیان بە هێزەكانمان بگەیەنن(٦).

سیاسەتی سوڵتان مەحموودی دووەم هۆكارێكی گەورە بوو بۆ یارمەتیدانی باسۆفیچ تابتوانیٚ تۆڕێكی پەیوەندی تووند لەگەلٚ سەرۆك هۆزە بەهێزەكانی سەرسنوور دابمەزرێنی،جونكە وەك باسمان كرد سوڵتان زۆربەی میرنشینە كوردیەكانی لە ناوبرد (كە ژمارەیان هەژدە میرنشین دەبوو)، باسكۆفیچ توانی پەیوەندی لەگەل ئەوانەدا دروست بكاتو بەڵێنی پێدابوون لە حالەتی هەڵگەڕانەوە لە دەولەتی عوسمانیو رازی بوون بەدەسەلآتی رووسی هەموو ئیمتیازاتێكی رابردوویان بۆ دەگەڕێنێتەوە(٧).

دیارە باسكۆفیچ متمانەی هەبووە بە پەیوەندیە بەهێزەكانی لەگەلٚ سەرۆك هۆزەكانی سەرسنوور، بۆیە لە ساڵی ١٨٢٨ز واتە دوای ساڵێك لە دەست پیٚكردنی چالاكیە جەنگیەكانی ویستی هێزێك تەشكیل بكات لە كوردە بەكرێگیراوەكان كە لە ١٠٠هەزار سوارە پێك هاتبوو، ئەمەی بۆقەیسەری رووسی پێشنیار كردو ئەویش رەزامەندی دەربڕی لەسەر تەشكیلكردنی ئەو هێزەو سەد هەزار پارچە زێری بەخشی بۆ دابین كردنی خەرجیەكانی(٨).

لەبەر چەند هۆیەك تەشكیل كردنی هێزی كوردی دۆست بە رووسیا بە ئاكام نەگەیشت، یەكەم هۆكاری هەرسهێنانی ئەو پڕۆژەیە دەگەڕێتەوە بۆ ناعەمەلی و نابابەتی بوونی ئەندازەی پیشتیوانی رووسیا لە باسكۆفیچ و سەرۆك هۆزەكانی كورد، لەلایەكیترەوە بیجورئەتی سەرۆكە كوردەكان لەبەرانبەر بەو بەڵێنانەی بە باسكۆفیچیان دابوو لەسەر هەڵگەڕانەوەیان لە دەوڵەتی عوسمانی ئەمەیان ئاشكرا نەكردو زۆربەیان دەیانویست دۆستایەتی هەردوولا مسۆگەر بكەن. بەكورتی هەڵوێستی سەرۆك هۆزە كوردەكان لەماوەی شەڕ (هەروەك لەمەودوا باسی دەكەین) هەڵوێستێكی براگماتی بووە، لەسەرەتاوە سەیری بارودۆخەكەیان كردووەو دوایی بەلای سەركەوتوودا دایان شكاندووە(٩).

ئەم هەڵوێستە براگماتیەی كە كورد فێری بووە بەرهەمی ئەزموونی تاڵی سەدەكانی ڕابردووی ماوەی شەڕەكانی ئیرانی و عوسمانی‌یە.

باسكۆفیچ هۆكارێكیتر باس دەكات لە هەرەسهێنانی پڕۆژەی دامەزراندنی هێزێكی كوردی دۆستی رووسیا، ئەو قەناعەتی وایە سیخوڕیەتی رۆژئاوایەكان بەتایبەتی ئینگلیزو فەڕەنسا وایكردووە كورد جورئەت نەكات بچێتە ناو ئەو هێزانەی رووسیا دەیوسیت دروستی بكات، باسكۆفیچ باس لە هەوڵی چڕی ئەو دیبلوماسیانە دەكات بۆ قەناعەت پێهێنانی كورد بەوەی رووسیا دەكشێتەوەو دەسەڵاتدارانی عوسمانی دووبارە دەگەڕێنەوە هەرێمەكەو سزای توندی ئەوانە دەدەن هاوكاری دەوڵەتی رووسیایان كردووە(١٠).

ناشتوانین هەوڵەكانی باسكۆفیچ هێندە بێبەرهەم دابنێین، بەڵكو رووسیا توانی لە كوردە ئیزیدیەكانی ناحەز بەعوسمانی و دۆستی رووسیا لەیەریڤان هێزێك پێك بهێنی كە لە شەڕەكانی سەرسنوور ڕۆڵیان هەبێت،

هەروەها رووس لەبێلایەنکردنی زۆربەی زۆری هۆزە کوردەکان سەرکەوتوو بوو، سەرەڕایی بانگەوازی چەندین جارەی سوڵتان بۆ کوردەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی رووس بەو ئەندازەیە نەبزاوتن و بەشداری چالاکیە سەربازیەکانی دژ بە رووسیایان نەکرد(١١).

لێرەدا ئەوەندە ئاماژە بەسە، هێزێکی بچوکی رووس لە تەمووزی ساڵی ١٨٢٨ز لە بەرچاوی کوردان هاتە ناو شاری بایەزیدو ژمارەیان لەهەزار سوارە تێنەدەپەڕی بێ ئەوەی کەس بەرگری لێبکات. ئەمە تەنها لەبایەزید نەبوو بەڵکو لە زۆربەی ناوچەکان دووبارە بۆوە، ئان-ت-والت و ب-مۆلتیف هەڵوێستی کورد لە شەڕەکانی ١٨٢٧-١٨٢٩ز بەم شێوەیە پوخت دەکەنەوە:-

(سەرەڕایی ئەوەی کورد وەکو هۆکارێکی متمانە پێنەکراو مایەوە بەڵام ئەم بێلایەنیە بەدرێژایی شەڕ سوودی بەباسکۆفیچ گەیاند وەکو ئەو سوود پێگەیاندنەی (ناییر) لەدوای چل ساڵ بەدەستی هێنا لەداگیر کردنی حەبەشـــە، لەهەردوو حالەتدا هێزی داگیرکەر توانی بچێتە ناو قولایی خاکی دوژمن لەدوای مسۆگەرکردنی بێلایەنی هۆزەکان کە دەیانتوانی لەبەرامبەردا مەترسی گەورە دروست بکەن)(١٢).

## راپەڕینەکانی کوردو
## ململانێی عوسمانی - ئینگلیزی

ڕاپەڕینەکانی کورد لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لایەنێکی تری ململانێی (عوسمانی - ڕووسی)مان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئەو ململانێیە کاریگەری خراپی لەسەر ڕاپەڕینەکان بەجێهێشتووە.

ڕاپەڕینی میری کۆر (١٨٣٢ـ١٨٣٦ن) لەکوردستانی عێراق بەرەنگاربوونەوەیەکی گەورە بوو بەرووی دوڵەتی عوسمانی. میری سۆران دەیویست لەژێر فەرمانڕەوایەتی خۆی هەموو کوردەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی یەك بخات، میری کۆر پیاوێکی سیاسی و عەسکەری و چاکسازی نمونەیی سەدەی نۆزدەهەم بووە، ڕاپەڕینەکانی بەیەکەم ڕاپەڕینی نوێی کورد دەژمێردرێ کەئامانجی یەکخستنی هەموو کورد بووە لەکوردستانێکی سەربەخۆدا ، چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنە جیاجیاکانی ئەو ڕاپەڕینەو هۆکارەکانی لەناوچوونی هەیە بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە بەتەنها خستنەڕووی هەوڵە چڕەکانی بەریتانیایە لەهاوکاری کردنی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرانبەر ئەو ڕاپەڕینە، هەر لەگەڵ دەست پێکردنی دەوڵەتی ئینگلیز لەچەندان ئاستی جیاجیا کەوتە هەوڵی دیبلۆماسی گەرم بۆ دوایی هێنان بەو ڕاپەڕینە، بەجۆری (دیبلۆ تایلەر)ی موقیمی بەریتانی لە بەغدا و(ئا. بۆنسیۆ) باڵوێز لە ئەستەنبوڵ چەندان بروسکەیان نارد بۆ قونسوڵیەکانی بەریتانیا هەتا پەیوەندی بکەن بەسەرکردە کوردەکانەوە بۆ ئەوەی پشتگیری لەهەوڵەکانی میری کۆرە

نەکەن لەبەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان، هەروەها داواکرا لەکاپتن (شیل) قونسوڵی بەریتانی لەوورمێ ئەرکی لێك نزیکخستنەوەی هێزەکانی عوسمانی و ئێرانی بگرێتە ئەستۆ هەتا پێکەوەو بەئاراستەی هاوبەش لەهێزەکانی میری کۆرە بدەن و ناچاری بکەن لەبەرامبەر وەرگرتنی زەمانەتی گیانی خۆی بداتە دەست هێزەکانی عوسمانی، میری کۆر ئەمەی قبوڵ کردو خۆیدا بەدەست هێزەکانی رەشید پاشای سەرۆکی هێزەکانی عوسمانی ئامادەکراو بۆ سەرکوتکردنی رابەڕینی کورد(١٣).

لێرەدا پێویستمان بەو روونکردنەوەیە هەیە، بۆچی بەریتانیا پشتیوانی لەدەوڵەتی عوسمانی دەکرد بۆسەرکوتکردنی راپەڕینی کورد؟ دیبلۆماسەکانی ئینگلیز هەموو لەسەر ئەوە کۆك بوون مەترسیان هەبێت لەسەربەخۆیی کوردستان ،چونکە هەنگاوێکی گەورە دەبێت بۆ هەرەسهێنان و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی، لەم هەرەسهێنانەش بەتەنها رووسیا سوودمەند دەبێت، ئەم چاوتێبڕینەی رووسیا پاڵی بەبەریتانیاوە نا پشتیوانی لەدەوڵەتی عوسمانی بکات بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکانی کورد(١٤)(*).

ڕاپەڕینی میر بەدرخان(١٨٤٧.١٨٤٢ز) لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) نمونەیەکی ترە لەسەر شوێنەواری کاریگەری ململانێی رووسی ـ بەریتانی لەناو دەوڵەتی عوسمانی لەسەر پەیوەندی عوسمانی _ کوردی، بۆ سەرهەڵدانی ئەم راپەڕینە هۆکاری ئیقلیمی و نێوخۆیی هەبووە، سەرەڕای هۆکاری خۆیی کەپشتگیری چەندین لێکۆڵینەوەی تازەی لەسەرە، ئێمە بەکورتی قسە لەسەر لایەنی دەولی و بەتایبەتی ململانێی بەریتانی – رووسی دەکەین.

سەرۆکی راپەڕین میر بەدرخان پاشا میری بۆتان بووە، بەهۆی بەهێزیو خۆڕاگریو خواناسی توانیبووی خۆی بەسەر زۆربەی سەرۆك هۆزو ئەمارەتە کوردەکانەوە فەرز بکات، بەدرخان پاشا دەیوست سەرکردایەتی کورد بکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوڵتانی عوسمانی کەبەناوی تەنزیماتەوە لەهەوڵی سەپاندنی چاکسازی رۆژاوایی دابووە لەکوردستان..

راپەڕینی ساڵی١٨٤٤ز زۆربەی هۆزەکوردەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی گرتەوە، راپۆرتەکانی بەرپرسانی ئینگلیز لە ناو دەوڵەتی عوسمانی ئەوە دەگەیەنن کەحکومەتی بەریتانی زۆر نیگەران بووە لە ئاکامەکانی ئەو راپەڕینە، دیبلۆماسەکانی ئینگلیز لەو باوەڕە دابوون رووس لەپشتەوەی ئەو راپەڕینەوەیە، هەتا یەکێك لەوان ئەو نائارامیەی دەربڕی بەوەی کەئەگەر بەدرخان سەرکەوتوو بێت ئەوە دەوڵەتی عوسمانی بێبەش دەبێت لە٧٢فەوجی سوارەی کورد، ئەو فەوجانەی کۆڵەکەی هێزەکانی عوسمانی پێك دەهێنن لەبەرەنگاربوونەوەی رووسی(١٥).

بۆ سووربوونی ئینگلیز لەسەر یەکیەتی خاکی عوسمانیو لێکنەترازانی ئامۆژگاری دیبلۆماسەکانی خۆی دەکرد لەشوێنی رووداوەکانەوە هەموو هەوڵێکیان بخەنە کار بۆ هاوکاری دەوڵەتی عوسمانیو کۆتایی هێنان بە هەڵگەڕانەوەی کوردان، (نەمرود رەسام)ی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەموسڵ هەموو پشتگیریەکی خستە ئەستۆی خۆی بۆ کۆتای هێنان بەراپەڕینی کورد. مارشەمعۆن سەرۆکی رووحیو دونیایی تایەفەی مەسیحی رۆژهەلاتی بووە کە(سریانی) یان (ئاشووری)یشیان پێدەڵێن، ئەمانە لەهەرێمی هەکاری لەژێر دەسەلاتی بەدرخان نیشتەجێ بوون، رەسام داوای لەمارشەمعۆن کرد گوێڕایەڵی بەدرخان پاشا نەکاتو کێشە لەنێوان مسوڵمانو مەسیحیەکاندا بخولقێنێ هەتا دەرفەت لەباربێت بۆ وڵاتانی

رۆژاوا بەبیانووی پاراستنی مەسیحیەکان دەست لەکاروباری ناو دەوڵەتی عوسمانیو کوردستان وەربدەن، مارشەمعۆن ببووە ئامرازی دەستی رەسامو کێشەو ئاشووبی لەنێوان مەسیحیو مسوڵمانەکان نایەوەو لەدەسەڵاتی بەدرخان هەڵگەڕایەوە، بەدرخانیش بۆ بەئاگاهێنانەوەی هێرشێکی کردە سەر مارشەمعۆنو لایەنگرانی، لێرەوە رەسام کەوتە راپۆت نووسین لەسەر بارودۆخی هەکاریو گەورەکردنی قوربانیانی ئاشووری بۆ راکێشانی رای گشتیو فشار خستنە سەر دەوڵەتی عوسمانی بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەراپەڕینی کورد، لەئاکامی ئەم هێرشی راگەیاندنە هەریەك لە بەریتانیاو رووسیاو فەرەنسا یاداشتنامەیەکیان دا بەسوڵتانو داوایان لێکرد کۆتایی بەراپەڕینی کورد بهێنێ، ئەگەر نا وڵاتانی رۆژاوا دێنە ناو کێشەکە بۆ راگرتنی وەکو دەڵێن (قەسابخانەی مەسحیەکان) بۆیە دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی گەورەی بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکە نارد(١٦).

بەهۆی ململانێی رووسی - بەریتانیلەناو دەوڵەتی عوسمانی بەریتانیا رۆڵی سەرەکی گێڕا لە لەباریەك بردنی راپەڕینی بەدرخان، ئەو راپەڕینەو ئاکامەکانی ئەوەمان بۆ بەدیاردەخا کە کێبەرکێی رووسی ـ عوسمانی لایەنی سێیەمی هەیە ئەویش رۆڵی بەریتانیایە، لەشوێنی خۆیەوە کوردیش کەوتە ژێرکاریگەری ئەو لایەنە.

## سالانی شەڕی قەرم ١٨٥٣ـ ١٨٥٤ز

لەگەرمەی شەڕی قەرمی نێوان رووسیاو دەوڵەتی عوسمانی کە بەریتانیاو فەڕەنسا پشتیوانیان لێدەکرد، فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی هەواڵێکی پێگەیشت لەسەر پەیوەندی نێوان شێخ شامیل سەرۆکی رێبازی نەقشبەندی لەداغستان و چیچان و سەرۆکی بەرگری ئیسلامی دژی داگیرکەری رووسی و شێخ تەهای نەهری سەرۆکی رێبازی نەقشبەندی لەکوردستان، رووسەکان قەناعەتیان وابووە لەحالەتی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە ئەم پەیوەندیەی نێوان شێخ شامیل و شێخ تەها دەبێتە پشتیوان بۆ دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە رووسیا پەیوەندیەکانی لەگەڵ سەرۆک هۆزەکانی سەرسنوور چڕکردەوەو کەوتە هەوڵی بەدەستهێنانی دۆستایەتی یان بیلایەنکردنیان لەململانێی چاوەڕوانکراوی لەگەڵ عوسمانی، بەڵام ئەم هەوڵانە بێئاکام بوون(١٧).

لەیەکەم قۆناغی شەڕی رووسی _عوسمانی سالانی١٨٧٨.١٨٧٧ز کورد بەگشتی بەلای عوسمانیەکانی داشکاندوە، بەزۆرترین هێزی سوارەی خۆی ویستوویەتی خزینی رووسی بۆ رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ رابگرێ، بۆ نمونە لەشەڕی (باشقاد کلیر)ی بەناوبانگ لەتشرینی دووەمی ١٨٧٧ز سوارەی کورد بەشی گەورەی هێزەکانی عوسانی پێك هێنابوو لەگەمارۆدانی هێزەکانی رووسی، بەڵام تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی هێزە ناڕێك و ئامادەنەکراوەکەی عوسمانی کە رووسەکان لەبەرامبەریدا لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتی بالاتربوون، ئەمە سام و هەیبەتی هێزەکانی رووسی لەبەرچاوی کوردان زیاتر کرد، هەروەها فەرمانـدەی هێزەکانی رووسی

لەقەوقاز کۆمەڵێك بانگەوازی بۆ کوردان کردو لەحالەتی پشتیوانی نەکردنی کورد لەعوسمانیەکان بەڵێنی سەلامەتی پیٚدان، بۆیە لەدواقۆناغەکانی شەڕ کوردەکان بەتەواوەتی وازیان هێنا(١٨)، ئەمەش سەرەڕای ئەو هۆکارانەی باسمان کرد چەندین هۆکاری تری هەیە،شەڕی قەرم هاوکات بوو لەگەڵ تێکچوونی پەیوەندی دەوڵەتی عوسمانی و کورد، لەدوای سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی بەدرخان و بەشداری کورد لەو راپەڕینە، دەوڵەتی عوسمانی کەوتە گرتنی چەندان سەرۆك هۆزی کورد، ئەمەش بۆ گرتنەبەری رێوشوێنی بەرگری لەڕاپەڕین و رازیکردنی باڵوێزی وڵاتە ئەوروپیەکان بەسزادانی ئەو میرە کوردانەی تاوانبارن بەکوشتنی گاورە نەستۆری (ئاشووری)یەکان(١٩)، شەڕی قەرم لەناوچە کوردیەکان بەرئەنجامی زۆری هەبوو هەروەکو رابردوو ناوچەکە ببووە مەیدانی گرنگی شەڕ، درێژەکێشانی ئەم شەڕەش دەوڵەتی عوسمانی ناچارکرد قەرەبووی ئابووریە رووخاوەکەی بکاتەوە بەگرتنەبەری رێوشوێنی لەسەر شانی جوتیارە کوردەکان، ئەوەش کەزیاتر بووە هۆی ناڕەزایی کورد ئەوە بوو حکومەت پەنای بردەبەر شاڵاوی توندو تیژی نیزامی بۆ سەر گوندەکان و ناچارکردنی دانیشتوانەکەی بۆ خزانە ناو تەشکیلاتی عوسمانی لەبەرەکانی شەڕ(٢٠).

سەرەڕای ئەمە لەشەڕەکانی قەڕم فەرماندەی هێزەکانی قەوقاز توانیبوی حالەتی ناڕازیبوونی کورد لەدەسەڵاتی عوسمانی لەبەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنێ(٢١).

هەر لەوماوەیەدا یەکێك لەفەرماندەکانی بەرەی قەوقاز بەناوی (بۆریس میلیکۆف) هەمان رۆڵی رابردووی (باسکۆفیچ)ی گێرا بەسەرپەرشتی کردنی پێکهێنانی هێزێکی بەکرێگیراوی کوردی هەتا لەپاڵ هێزەکانی رووسی

لەدژی عوسمانی بجەنگن، میلیکۆف لەگەڵ یەکێك لەسەرکردەکانی ناوچەی سنووری نزیك ئێریڤان بەناوی قاسم خان سەکەوتنی بەدەست هێنابوو، قاسم خان لەهەوڵی پێکهێنانی کەتیبەیەك دابوو لەسوارەی کورد بۆ لایەنگیری رووسیا، هەمان سەرکەوتنی لەگەڵ جەعفەر پاشا بەدەست هێنا کەیەکێك بووە لەناودارترین سەرکردەکانی هەرێمی بایەزید لەسەرسنوور(٢٢)، پێکهێنانی ئەو دوو کەتیبەش لەوکاتە کاریگەری هەبووە لەسەر هەڵوێستی کورد، رووسیا لەرێگەی قاسم خانو جەعفەر پاشاوە هەوڵی دەدا کورد بێلایەن رابگریٚ(٢٣)، ئەمەش باشترین دەسکەوت بووە کە ئەو خۆزگەی بۆ دەخواست. بۆ رێوشوێن دانانو هاندانی کۆچکردنی سەرۆك هۆزەکان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رووسیا، میلیکوف دەیوست ناوچەیەکی ئارام لەسەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەو هۆزانە دروست بکاتو هەموو ئەو ئیمتیازاتانەیان بداتیٚ کەدەوڵەتی عوسمانی لیٚی زەوت کردبوون(٢٤)، بەڵام دەوڵەتانی ئەوروپی رووسیایان ناچار بە پاشەکشەکرد لەهەموو ئەو خاکەی داگیری کردبوو، بەمەش پرۆژەکەی میلیۆف رووناکی بەخۆوە نەبینی.

کوردەکان لەزیادەڕۆیی مەرکەزیەتی دەسەڵاتو سیاسەتی عوسمانیەکان لە لەناوبردنی میرنشینە کوردیەکان بێزار ببوون، شەڕی قەرمیان بەدەرفەت دەزانی بۆ گێڕانەوەی سەربەخۆییە خۆجێیەکانیان کەدەوڵەتی عوسمانی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم میرنشینە خودموختارەکانی لەناوبردبووو زۆربەی سەرکردە تەقلیدیەکانیشی لەکوردستان دوورخستەوە.

یەزدان شێر لەو میرە خاوەن قەڵایانە بووە کە لەناوچە کوردیەکان مابۆوە، ئەم دواین کەس بوو لەساڵی١٨٤٧ز هاوکاری عوسمانیەکانی کرد

لەدژی جولانەوەکەی بەدرخانی مامی و ئەوانیش وەکو بەرپرسی میری لەجەزیرەی ئیبن عومەر دایان مەزراندو دواتر ویستیان سنووریێك بۆ دەسەلاتی دابنێن و لەجەزیرە دووری بخەنەوە، ئەمیش دواکەس بوو لەدەسەلاتی عوسمانی یاخی بێت و خوازیاری راپەرین بوو دژی دەوڵەتی عوسمانی(٢٥).

هۆکارێکی تری پەلەکردنی یەزدان شێر لەسەرکردایەتی کردنی جولانەوەی کورد لەماوەی شەڕی قەرم بانگەوازە یەك لەدوای یەکەکانی فەرماندەی هێزەکانی رووسی بووە بۆ پەلەکردن لەبەرپاکردنی شۆرش بەرووی عوسمانی، ئەوەندە ئاماژەیە بەسە کەفەرماندەی ئەو هێزانە لەقەوقاز نامەیەکی بۆ یەزدان شێر ناردو هانی دابوو بۆ راپەرین بەرووی عوسمانی، بەڵێنی پشتیوانی تەواوی پیێدابوو، لەنامەکەدا هاتووە: (ئەگەر توانیمان بەسەر تورکەکاندا سەربکەوین ئەوە دەتان کەین بەحاکمی جەزیرەی ئیبن عومەر..)(٢٦).

لەدوای پەیوەندی کردنی چڕوپڕی یەزدان شێر بەسەرۆك هۆزەکوردەکان و کەسایەتیە چالاکەکانەوە لەکانوونی یەکەمی ١٨٥٤ز هەڵگەڕانەوەی خۆی راگەیاند، لەسەرەتاوە هەشت هەزار چەکداری کۆکردەوە، لەو کاتەوە هەتا ئازاری١٨٥٥ز دەسەلاتی گرتەوە بەسەر زۆربەی بەشەکانی کوردستان، لەباکورەوە هەتا وان و لەباشوورەوە هەتا موسڵ، لەکوردستانی رۆژهەلاتیش ژمارەیەك لەسەرۆك هۆزەکان پشتیوانی خۆیان بۆ جولانەوەکەی یەزدان شێر راگەیاند(٢٧)، بەلام لەبەر چەند هۆکارێك شۆرشی کوردی رووبەرووی بەرەنگاریەکی گەورەی عوسمانیەکان بۆوە ،چونکە ئەو شۆرشگێڕانەی دابوویانە پاڵ جولانەوەکەی یەزدان شێر کۆڵەکەی هێزی سوارەی کوردیان پێك هێنابوو لەبەرپەچدانەوەی شالاوی

رووسی، سەرەڕای ناچاربوونی عوسمانی بەکێشانەوەی بەشێکی زۆر لەهێزەکانی لەهێڵی پێشەوەی بەرەکانی شەڕ بۆ مەبەستی بەرەنگاربوونەو سەرکوتکردنی راپەڕینی کورد(٢٨).

لەبەر چەند هۆکارێکی بابەتیو زاتی لەئیقلیمیو دەولی بەهەمان خێرایی عوسمانیەکان توانیان زاڵ ببنەوە بەسەر کوردستانو لەبەهاری١٨٥٥ز دووبارە گەڕانەوە ناوچەکەو یەزدان شێر خۆی بەدەستەوەدا.

بەخێراییلەناوچوونی ئەو شۆڕشە جێی سەرسوڕمانەو پێویستی بەلێکۆڵینەوەی وورد هەیە لەسەر لایەنە کاریگەرەکانی ئەو جولانەوەیە، ئەمەش لەبەرنامەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا نیە، بەڵام چەند هۆکارێك لە هەرەسهێنانی ئەو شۆڕشە باس دەکەین.

لەپێشەوەی ئەو هۆکارانە دواکەوتنی کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشە، یەزدان شێر کاتێك دەست بەکاربوو شەڕ بەرەو کۆتایی دەچوو، هێزەکانی رووسی خەریکی کشانەوە بوون بۆپێگەسەربازیەکانی سەرسنوور، بەمەش دەسەلاتدارانی عوسمانی توانیان ئەو هێزانە کۆبکەنەوەو جەخت بکەنە سەر رۆژهەلات بۆ لەناوبردنی یەزدان شێر(٢٩).

پێویستە ئەوەش ئاگاداربین کەرووسەکان بەجدی پشتیوانیان لەوجولانەوەکەی یەزدان شێر نەکرد، لەکاتێکدا یەزدان شێر هەموو توانایەکی خستبووە گەڕ بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی رووسی بەلام بیئاکام بوو، ئەو زیاتر لەچوار نامەو نوێنەری نارد بۆ لای رووسەکانو داوای هاریکاری لێکردبوون لەدژی هێزەکانی عوسمانی بەلام یەك وەلامی ئیجابیشی لەلایەن رووسەکانەوە پێنەگەیشت بەتەنها لەو کاتە نەبێت شۆڕشی کوردی لەدواهەناسەی دابوو(٣٠).

ئەوەی شایانی باسە یەزدان شێر یەکەم سەرکردەو دواسەرکردەی کورد نەبووە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا سەرەتای ساڵی ١٩١٤ز هەوڵەکانی بەبێئاکامی گەیشتبوو لەبەدەستهێنانی پشتیوانیەتی رووسەکان، دکتۆر وادی‌جوەیدە (پسپۆڕی عێراقی سەدەی نۆزدەهەمی جولانەوەکانی کورد) ئەم ئارەزوو نەبوونەی رووس دەگەڕێنێتەوە بۆ سیاسەتی رووسیای قەیسەری دۆست بە ئەرمەن‌و ناحەز بەکورد، کۆسپی دەخستەبەردەم هەوڵەکانی نەتەوەی ئەرمەن لەئەرمینیای رۆژاوای خۆی‌و پشتگیری لەجەماوەی ئەرمەن دەکرد لەو سنوورە بۆ جیابوونەوە، خۆزگەو ئاواتەکانی کورد لەگەڵ خۆزگەو ئاواتەکانی ئەرمەن تێك دەگیران، ئیمپراتۆریەتی رووسی نەیدەتوانی لەبانگەوازە نوێیەکانی بەتریاکی ئەرتۆدەکسی هاوسۆزی بەتریاکی ئەرمەنی دوژمنکار بەکوردی (دەمارگیرو خوێن رێژی بێتاوانەکان) دەربچێت(٣١).

نووسەری ئەم ووتارە پێی وایە هۆکاری یەکلاکەرەوە لەکۆتایی هاتنی بزاڤی یەزدان شێر دەگەڕێتەوە بۆ جەخت کردنی بەریتانیا لەسەدەی نۆزدەهەم لەسەر پاراستنی یەکیەتی خاکی دەوڵەتی عوسمانی‌و بێبەش کردنی رووسیا لەبەدەستهێنانی دەسکەوتەکانی لەناو ئەو دەوڵەتە.

هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی دەبووە هۆی تێکچوونی هێز لەنێوان وڵاتانی ئەورووپی‌و زیان گەیاندن بەبەرژەوەندیەکانی بەریتانی لەدەریای سپی ناوەڕاست‌و رۆژهەڵاتی ناوەندو بەرژەوەندیەکانی بەریتانی لەهیند، جیابوونەوەی کوردستان بەسەرۆکایەتی یەزدان شێرو لەسایەی رووسیا هەنگاوێکەو دەتوانێ ژانی لەدایکبوونی دەوڵەتی کوردی لێبکەوێتەوە، ئەمەش هەنگاوێك دەبێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیپراتۆریەتی

عوسمـــانی، لەبـــەر یەکـــدەنگ نـــەبوون لەدابەشـــکردنی میراتەکـــەی هێـــزە ئەورووپییەکان هەوڵی لێك هەڵوەشاندنەوەیان نەدەدا.

دیبلۆماسەکانی ئینگلیز رۆڵی گرینگیان بینی لەلێك نزیکخستنەوەی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی هەتا لەئاستی ئیقلیمی یەزدان شێر گۆشەگیر بکەن، هەروەها لەسەر ئاستی سەرۆك هۆزە چالاکەکانیش ئینگلیز هەوڵی گۆشەگیرکردنی یەزدان شێری دەدا بەجۆرێ قونسوڵیەکانی کەوتبوونە بەخشینی سامان و دەسەڵات بۆ وەرگرتنی بەڵێن بۆ دابڕینی یەزدان شێر(٣٢)، لەکۆتاییدا هەر ئەمانیش رۆڵی یەکلاکەرەوەیان گێڕا لەقەناعەت پێکردنی یەزدان شێر بۆ خۆ بەدەستەوەدانی بەدەوڵەتی عوسمانی و بەمەش کۆتایی بەڕاپەڕینەکە هات.

جولانەوەی یەزدان شێر نمونەیەکی زیندووە لەسەر کاریگەری کورد لەهەمبەر ناکۆکیەکان و هەروەها کەوتنە ژێر کاریگەری ناکۆکیەکان، دەبینین رۆڵی باڵادەست بەدیار کەوت وەکو لایەنی سێیەم لەسەر ناکۆکی رووسی - عوسمانی و سوور بووە لەسەر دەرفەت نەدان بەرووس بەسوود وەرگرتنی لەهۆکاری کوردی ناو دەوڵەتی عوسمانی ( هەتا لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی) لەپێناو فراوانخوازی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمە تاکۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم پایەیەکی سەرەکی سیاسەتی بەریتانی بوو، هەروەها هۆکاری دابەشکردنی کوردستان بووە لەلایەن هێزە ئەوروپیە داگیرکارەکانەوە. توێژەرەوانی بارودۆخی کوردستان لەبیستەکان تێبینی ئەوە دەکەن چۆن ئیگلیز مەبەستی بووە هەوڵەکانی ئێران و عێراق یەك بخات بۆ سەرکوتکردنی جولاوەی نەتەوەیی، کەچی لەسەرەتاوە جۆشدانی بزاڤەکەیان وەکو کارتی فشار بەکار هێناوە لەسەر تورکیای کەمالی و رژێمی پاشایەتی لە عێراق.

تاوانی دابەشکردنی نیشتیمانی مسولمانان لەنێوان دەوڵەتە ناسیونالستەکانی ئێستاو ئەوەی بەدوای خۆیدا هێنای لەکاولکاریو مەینەتی بەرپرسیاریەتەکەی بەئەندازەیەکی زۆر دەکەوێتە ئەستۆی هێزە ئەوروپیەکانەوە نەك گەلانی مسوڵمانی تورك‌و فارس‌و عەرەب، ئەوانە باجی دیکتاتۆریەتی‌و دواکەوتوویی سیاسی‌و ئابووری دەمراستە دەسەڵاتدارەکانیان دەدەن کە بەزمانی تورکی‌و عەرەبی‌و فارسی قسە دەکەن(*).

## شەڕی رووسی ـ عوسمانی (١٨٧٧ـ١٨٧٨ز)

کوردستان مەیدانی گرنگی شەڕی رووسی_عوسمانی سالانی ١٨٧٧ـ ١٨٧٨ز بوو بۆیە لێرەش هۆکاری کوردی هەمان کاریگەری سالانی ١٨٢٧ـ ١٨٢٨ز و ١٨٥٤ـ ١٨٥٥ز ی هەبووە، کوردیش لەلای خۆیەوە کاریگەری گەورەی ئەم شەڕانەی بەرکەوتووە، رووسەکان لەململانێی هەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی گرنگی بەرچاویان بەرۆڵی‌کورد دەدا.

دەوڵەتی عوسمانی لەئاکامی ئەزموونی رابردووی لەشەڕەکانی لەگەڵ رووس لەو ناکۆکیانەدا هەستی بەهۆکاری کوردی کرد بوو، بۆیە لەهەفتاکان هەردوو دەوڵەت لەپێشبڕکێ دابوون بۆ بەدەسهێنانی کورد بەهەر رێگەیەکی لەتوانا دابێت.

لەسەرەتای سالی ١٨٧٥ز (فلادمێر ئەگناتیف) بالوێزی چالاك‌و بەئەزموونی رووسی لەدەوڵەتی عوسمانی نامەیەکی بۆ بەرەی قەوقاز

نووسی و داوای لێکردبوو بەهەرچی لەتوانایاندا هەیە هەوڵبدەن سەرۆک هۆزە چالاکەکانی سەرسنوور بەلای خۆیاندا رابکێشن، هەروەها حکومەتەکەی ئاگادارکردبۆوە لەچالاکیە چڕەکانی قونسوڵیەکانی ئینگلیز دژ بەرووسیا لەناو کورد(٣٣)، ئەم هەوڵانەی ئینگلیز زیاتر بۆ هاندانی کورد بووە لەسەر رێزگرتنی یاسا و ئاسایشی ناوچە سنووریەکان و گوێڕایەڵی دەسەڵاتی مەرکەزی عوسمانی ئەمەش بەمەستی بێبەش کردنی رووس لەسوود وەرگرتن لەنائارامی ناوچەکوردیەکان بۆ فراوانخوازی لە رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦_١٩٠٨ز) سیاسەتێکی کراوەو هاوکاری دەست پێکرد لەگەڵ سەرکردە تەقلیدیەکانی کورد کە بەشێك بووە لە سیاسەتی کراوەی عەبدولحەمید لەبەرامبەر گەلانی مسوڵمان بەناوی جامیعەی ئیسلامی.

سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمید بەند بوو بەپتەوکردنی خاڵەهاوبەشەکانی لەگەڵ گەلانی عوسمانی، بۆ ئەمەش پشتی دەبەست بەزانایان و شێخەکانی تەریقەتی سۆفیگەری لەناو دەوڵەتی عوسمانی، لەسەر بنەمای ئەو سیاسەتەش بووە شێخ سەعیدی بەرزنجی سلمانی و شێخ عوبێدوڵڵای لەدەروازەی بالا نزیك کردەوە، لەرێگەی سەردانی بەردەوام و مانەوە لە ئەستەنبوڵ کە لەوێ سوڵتان رێزی لێدەنان و نازناو و دیاری پێ دان(٣٤).

هەوڵە چڕەکانی رووسیا لەهەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بۆ کڕینی پەیمان لەسەرۆك هۆزە کوردەکانی سەرسنوور بە بێبەرهەمی مایەوە، بەتەنها لەگەڵ چەند هۆزێکی ئێزیدی نەبێت کە لەدەسەڵاتی عوسمانی بێزار بوون، لەسەرەتای شەڕی رووسی ساڵی ١٨٧٧ز زۆربەی هۆزە کوردیەکان

دایانــه پــاڵ جیهــادی ئیســلامی دژ بــه رووس، هــەر لەســەرەتاوە شــێخ عوبێدوڵڵای نەهری ڕۆڵی گەورەی گێڕا لەئامادەکردنی موجاهیدانی کورد بۆ بەشداری لەجیهاد لەدژی داگیرکەری رووسی.

ئەوەندە ئاماژە لێرەدا بەسە لەحوزەیرانی ١٨٧٧ز لەرۆژهـەلاتی ئەنادۆڵ هێزەکانی رووسی هاتنـە ناو شـاری بایەزیـدی کوردی، دەوڵـەتی عوسمانی هێزێکـی یـازدە هـەزار کەسـی نـارد بـۆ دەرپەڕانـدنی رووسـەکان کوردەکـان هەوت هەزاری هێزە نێرداوەکەیان پێك دەهێنا(٣٥).

لەساڵی دووەمی شـەڕ پشـتیوانی کورد لەهەوڵـە جەنگیـەکانی عوسمانی وورده وورده بـەرەو کـەمی دەچـوو ئەمـەش هۆکـاری بنـەڕەتی بـوو لـەو تێکشـکاندنە خێرایـەی هێڵـەکانی بـەرگری عوسمـانی لەبەرامبـەر هێرشـی رووســی، لەماوەیــەکی کورتــدا کوردەکــان هەســتیان بــەوە کــرد ســوپای عوسمــانی لاوازو ناڕێکــەو نــاتوانێ بــەرگریان لێبکــات بۆیــە بیلایــەن مانــەوە(٣٦). سـەرکردایەتی سیاسـی لەئەستەنبوڵ لـەماوەی شـەڕ لەلایـەن مەدحــەت پاشــاو عــەونی پاشــاوە بــەڕێوەدەبرا کەهــەردووکیان لەبانگـەوازکارانی دەسـتووری رۆژاوایـی بـوون بـۆ نـاو ئیدارەی عوسمـانی، ئەمانـە لـەملمـلانێ دابـوون لەگـەڵ سـوڵتان لەسـەر دەسـەڵات، ئـەو شـەڕە ناشایستەیی مەدحەت پاشاو لایەنگرانی بەدیارخست لەبەڕێوەبردنی وڵات کە لەو بارودۆخە ناسکەدا بەرەی ئیسلاح سەرۆکایەتی وڵاتیان پێناکرێت.

هۆکـاری کاریگـەر لەکشـانەوەی موجاهیـدە کوردەکـانی لایـەنگری شـێخ عوبێدوڵڵای نەهری لەبەرەکانی شەڕی دژ بەرووس گەندەڵیئیداری مەدحەت پاشا بووە لەکوردسـتانو مامەڵـەی خراپـی سـوپای عوسمـانی بووە لەگـەڵ لایەنگرانی نەهری.

بۆنمونه ئەفسەرانی سوپا پێداگربوون کە دەبێت لایەنگرانی شێخ ملکەچی ئەوان بن، ئەمە لەکاتێکدا ئەو هێزانە نانیزامیبوونو واچاکتر بوو لەژێر فەرمانی سەرۆکەکانیان دابن، لەو کاتەش تێکۆشەرە کوردەکان بە فەرمانی سەرکردەکانی سوپا سزا دەدران کەپێویستیەکانیان بۆ دابین نەدەکردن چەكو تەقەمەنیو ئازووقەیان لێدوادەخستن، سەرکردە کوردەکانو لەپێشەوەیاندا شێخ عوبێدوڵلا لە چەندین بۆنەدا سکالای خۆیان دەکرد بەڵام بێئاکام بووە(۳۷).

باری خراپی ئابووریو سیاسی رۆژگاری شەڕی قەرمو ئەو ئاڵۆزی بارودۆخەی مابۆوە بەم شەڕە وێرانو خراپتر بوو، گەندەڵیو خراپەکاری لەناو کاربەدەستانو هێزەکانی عوسمانی بڵاوببۆوە، شەڕی ساڵی ۱۸۷۷ــ۱۸۷۸ز زیاتر کەوتە سەر شانی جوتیاران بەهۆی باجو دروستبوونی حالەتی نائارامیو وێرانبوونی لەڕادەبەدەری ئەمنوئاسایش.

برسیەتی بەهۆی ئەو بارودۆخە قورسە لەناوچە کوردیەکانی رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ بڵاوببۆوە، کاربەدەستانی توورك(لەو قۆناغە هەموویان توورك بوون)کە لە جیاتی ئیدارەی کوردی سەر بەمیرە کوردیەکان دانرابوون بەهۆی بێئاگایی لەباری ناوچەکەو خراپەی ئەوان گەندەڵی لەناوچە کوردیەکان بڵاوببۆوە(۳۸).

بەهۆی باری قورسی ئابووریو کۆمەلایەتیو رووداوی بەرەنگاربوونەوەی کورد دژ بەدەوڵەت بۆتان ببووە مەڵبەندی ئەو بەنگاربوونەوەیە، هەریەك لەعوسمان پاشاو حوسێن پاشای کوڕانی میر بەدرخان کەوتنە پەیوەندیکردن بەچەندین سەرداری کوردەوە هەتا ئامادەیان بکەن بۆ شۆڕش. لەپایزی۱۸۷۸ز جولانەوەکە بەسیمایەکی جەماوەریو رەتکردنەوەی دەسەلاتی عوسمانی دەستی پێکرد(۳۹)، بەلام

بەرلەوەی بڵاوبێتەوە لەناو برا، ئەوەی جێی ئاماژەیە هەر لەسەرەتاوە کوڕانی بەدرخان رایانگەیاند ئامانجی شۆڕشەکەیان گەڕاندنەوەی سەربەخۆیی میرنشینە کوردیەکانە(٤٠)، بۆیە شۆڕشی کوڕانی بەدرخان ئاماژەیەکی ترە لەسەر ئارەزووی کورد بۆ سوود وەرگرتن لەناکۆکی رووسی ـ عوسمانی بۆ بەدەستهێنانی سەربەخویی.

لەدوای خنکاندنی شۆڕشی کوڕانی بەدرخان(حوسێن و عوسمان) ئیدارەی تورکی بەردەوام بوو لەسیاسەتی پاکتاوکردن و فەرزکردنی باجی قورس و بەزۆر بردنە خزمەتی سەربازی، بەهۆی ئەم هۆکارانەوە بووە شێخ عوبێدوڵڵای نەهری کوڕی شێخ تەهای نەهری سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندی و خاوەن دەسەڵاتی بەرفراوان کەوتە سنووردانان بۆ ئەو حالەتە تاڵەی پەرەی سەندوە.

لەئەیلولی ١٨٧٩ز لایەنگرانی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری هەوڵیاندا نەیەڵن هێزەکانی جەندرمەی عوسمانی بەزۆر باج لەناوچە کوردیەکان کۆبکەنەوە.

ئەم رووداوە پێکدادانی سەربازی لێکەوتەوە و بووە هۆی کوژرانی ژمارەیەك لەهەردوولا(٤١) کە سەرەتایەك بوو بۆ راپەڕینێکی گەورە بەسەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری.

راپەڕینەکە لەچەند لایەنێکەوە پەیوەندی هەبووە بەناکۆکی رووسی ـ عوسمانی، هەندێ لەتوێژەرەوان قەناعەتیان وایە ئەو راپەرینە یەکێکە لە دەرهاویشتە بنەڕەتیەکانی شەڕی هەردوو دەوڵەتی ساڵانی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ز ، ئەوەی شایانی باسە دەوڵەتی عوسمانی لەو شەڕەدا تێکشکا و بەناچاری رێکەتنامەی(سان ستیڤانۆ)ی ساڵی ١٨٧٨ز پڕ لە ریسوایی ئیمزاکرد، دەوڵەتانی ئەوروپی و لەپێشەوە بەریتانیا دوودڵ بوون لەبەرامبەر ئەو دەسکەوتە سەربازی و سیاسیانەی رووسیا لەناو دەوڵەتی عوسمانی

بەدەستی هێنابوو، بۆیە رووسیای لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ناچار بە پاشەکشە کردو لەجێگەی رێکەوتنامەی ناوبراو رێکەوتنامەی بەرلینی لەهەمان ساڵدا پیٚ ئیمزا کرد، رێکەوتنامەی بەرلین چەند بابەتێکی تایبەت بەوازهێنانی دەوڵەتی عوسمانی لە هەندی ولایەت لە بولقان لەخۆگرتبوو، هەروەها بەڵێندانی سوڵتان بە ئەنجامدانی چاکسازی ئیداری لەولایەتەکانی رۆژهەڵات لەئەنادۆڵ لەبەرژەوەندی ئەرمەن و راگرتنی ئەوەی پیٚی دەڵێن(دەستدرێژی کورد بۆ سەر ئەرمەن).

ژمارەیەك لەتوێژەرەوان و لەپێشەوەیان وادی جوەیدە لەلێکۆڵینەوەیەکی بەنرخیدا لەسەر جولانەوەی کورد، روونیان کردۆتەوە کەپەیوەندی هەیە لەنێوان جولانەوەکەی شێخ عوبێدوڵلاو بەندەکانی رێکەوتنامەی بەرلین. ئەوەی تایبەتە بەچاکسازی لەبەرژەوەندی ئەرمەن، هێژا جوەیدە لەو قەناعەتەدایە سوڵتان عەبدولحەمید نەیویستووە بەندەکانی رێکەوتنامەی بەرلین جیٚبەجیٚبکات و نەیدەتوانی رەتی بکاتەوە، بۆیە ئامۆژگاری شێخ عوبێدوڵلای کردووە ئارامی ولایەتەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بشێوێنیٚ، هەتا بیانوو هەبێت بۆ جیٚبەجیٚنەکردنی ئەو چاکسازیانەی لەبەرژەوەندی ئەرمەنەکانە(٤٢).

سوڵتان لەچەندین جێگەی بیرەوەریەکانیدا نیگەرانی خۆی بەدیار دەخا لەو بەندانەی پەیوەستن بەچاکسازی لەسەر راپەوی رۆژاوا لە ولایەتەکانی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات لەبەرژەوەندی ئەرمەن، ئەمەشی بە مەترسیدار دەزانی، دەیوت ئەوانە(واتە ئەورووپیەکان) لق بەلق پەیوەندیەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەناوی چاکسازیەوە دەبڕن و لەهەولی دروستکردنی قەوارەی رۆژاوایی دان لەناوجەرگەی دەوڵەتی عوسمانی بەبیانووی چاکسازی لەبەرژەوەندی ئەرمەن(٤٣)،ئەوەتە شێخ عوبیدوڵلاش بەئاشکرا نیگەرانی

دەردەبڕێت بەوەی چاکسازی ئیداری لەولایەتەکانی رۆژهەڵات پەردەپۆشە بۆمەبەستی دروستکردنی قەوارەیەکی نەتەوەیی بۆ ئەرمەن لەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن، هەروەها هەڕەشە دەکات کەڕێگەی کاری لەو جۆرە نادات هەتا ئەگەر پێویست بەچەکدارکردنی هەموو پیاوان و ئافرەتانی کورد بکات، گەیشتنی چاودێرە نێودەوڵەتیەکان بۆ ولایەتەکانی رۆژهەڵات بۆ سەرپەرشتی چاکسازی ئیداری ئەو قەناعەتەی لەلای کوردو بەتایبەتی شێخ عوبەیدوڵڵا پتەو کرد کە هێزە ئەوروپییەکان سوورن لەسەر بەکارهێنانی رێکەوتنامەی بەرلین بۆ دامەزراندنی قەوارەی ئەرمەنی لەئەنادۆڵی رۆژهەڵات(٤٤)، ئەگەر دۆستایەتی نێوان شێخ و سوڵتانیش بەهێند وەربگرین ئەوە ناتوانین بەتەواوی خۆببوێرین لە جۆرێك لەلێك تێگەیشتنی نێوان ئەو دوو کەسایەتیە بەر لەراپەڕینەکە.

سوڵتانی عوسمانی دوو دڵ بوو لەگرتنەبەری رێوشوێنی خێرا لەدژی جولانەوەکە، کە لەواقیع دا لەدوای فشارێکی زۆری هێزە ئەوروپییەکان نەبێت بەتایبەت بەریتانیا و رووسیا بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی هێزەکانی عوسمانی نەبزووتن بۆ لەناوبردنی راپەڕینەکە(٤٥)، شێخ لەدوای خۆبەدەستەوەدانی بەسوڵتان بەشێوەیەکی رەسمی و لەمەراسیمێکی جەماوەریدا لەلایەن سوڵتانەوە پێشوازی لێکرا، بەمەش باڵوێزی بەریتانی لەئەستەنبوڵ نیگەران بوو، سەرەڕای ئەمە شێخ عوبەیدوڵڵا لەساڵی١٨٨١ز توانی بەنهێنی لەئەستەنبوڵەوە هەڵبێت بۆ هەکاری لەسنووری ئێرانی - عوسمانی، ئەوەش مەترسی زیاتری لەلایەن هێزە ئەوروپییەکانەوە دروست کرد کەئەو لەلایەن سوڵتان یان بەرپرسیاریەتی دەروازەی باڵاوە پشتگیری لێدەکرێ(٤٦).

ئـەوەی لێـرەدا لێـی تێدەگـەین رێکـەوتنی لەپێشـتر لـەنێوان شـێخ عوبەیدوڵڵاو سولّتان دا نەبووە، بەڵام سولّتان راپەڕینی کوردی بەکارهێنا بۆخۆدزینـەوە لەجێبـەجێکردنی ئـەو بەندانـەی رێکەوتنامـەی بـەرلین کەپەیوەنـدی هـەبووە بەچاکسـازی ئیـداری لەولایەتـەکانی رۆژهـەڵات لەبەرژەوەندی ئەرمەن. دوورنیە لەدوای هەستکردنی شێخ بەوەی دەوڵەتی عوسمانی ناتوانێ بەرگری لێبکات لەئەنادۆڵی رۆژهەڵات دەستپێشخەری کردبێت لەراپەڕین، لەدوای ئیمزاکردنـی رێکەوتنامەی بەرلین و گەیشتنی چاودیرە نێودەوڵەتیەکان شـێخ زنجیرەیـەك کۆبوونـەوەی ئەنجامـدا وەك پەیوەندی کردن بەسەرۆك هۆزەکوردیەکان و زانایانی ئاینی و مریدەکانی تەریقـەتی نەقشـبەندی لەکوردسـتانی گـەورە، هـەموو ئـەو پەیوەندیانـەش پوختکرانــەوە لەکۆبوونەوەیــەکی میــژوویی لــە ئــابی ١٨٨٠ز لەگونـدی(ناوچیا)ی ناوچـەی نـەهری شـوێن بارەگـاو حەوانـەوەی شـێخ عوبەیـدوڵڵا لـەپارێزگای هـەکاری سەرسنووری ئێـران و تورکیـای ئـەمڕۆ، بـەئامادەبوونی نزیکـەی دووسـەد کەسـایەتی کـوردی، هـەتا ئێسـتا هـیچ توێژینەوەیـەك و بەڵگەنامەیـەکی رەسمـی لەبەردەسـتدا نیـە لەسـەر ئـەو بابەتانـەی لـەو کۆبوونەوەیـە بـاس کـران، بـەڵام ئـەوەی لەسـەر زاری مسـیۆنەرانی ئەمـەریکی میسـتەر(کوچـران) و قوسـوڵی رووس و ئینگلیـز لەسەر ئەوکۆنگرەیـە بەدەستمان گەیشتووە کـورت هەڵـدێ لەدامەزرانـدنی کۆمەڵەیـەکی کـوردی بەسـەرۆکایەتی شـێخ عوبێـدوڵڵا کەئەرکی سەرشـانی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی کوردی بووە(٤٧). شێخ عوبێدوڵڵا بەمسیۆنەرە ئـەمریکی و دیبلۆماسـە ئینگلیزەکـانی راگەیانـد کەهـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانی و ئێرانـی دادگـەرنین لەمامەڵەیانـدا لەگـەڵ کـورد، گـەلی کـورد بەدەسـت دەسـەڵاتی ئەوانـەوە دەنـاڵێنێ، بـەڵام زۆربـەی ڕووداوی

راپەڕینەکانی کورد لەناو کوردەکانی ئێراندا بووە، شێخ بیانووی بۆ ئەمە هێنابۆوە کەئێران دوژمنە لاوازەکەیانەو دەیەوێت هێزەکانی بگوازێتەوە بۆ سەرکوتکردنی بزاڤی هۆزە تورکمانەکانی باکور، شێخ ئەمەی بەپاڵنەرێکی باش داناوە کەکورد بۆ یەکەم جار لەئێرانەوە دەست پێ‌بکات(٤٨).

ئەوەی قەناعەتی نووسەرە رووسەکانە بزاڤی شێخ عوبەیدوڵلا پیلانی نێوان خۆیی و عوسمانی و ئینگلیزەکان بووە بۆ لاوازکردنی ئێران کە ئەوکات لەژێر دەسەڵاتی رووسەکان دابووە(٤٩)، بەڵام ئەمە پڕووپاگەندەیەو هیچی لەسەر نیە.

سەدان کەس لەلایەنگرانی شێخ بۆ ناو خاکی ئێران پەڕینەوەو زۆری کوردەکانی ناو ئێران لەهەردوو هەرێمی کوردستان و ئازەربایجان لەباکورو رۆژاوای ئێران پەیوەندیان پێوەکرد، لەمانگی یەکەمدا هێزەکانی کورد چەندین سەرکەوتنیان بەدەستهێناو دەستیان گرت بەسەر زۆربەی ناوچە کوردیەکان و هێزەکانی شێخ بەئاڕاستەی کۆنترۆڵکردنی شاری تەورێزی پایتەختی ئازەربایجانی ئێران دەڕۆیشتن(٥٠)، رووسەکان راستەخۆ لەو شەڕەدا بەشدار بوون و چەندین پارچە چەکیان بۆ هێزەکانی ئێرانی نارد، هەروەها قونسوڵی رووسی راستەخۆ رۆڵی هەبووە لەچەکدارکردنی هۆزەکانی ئازەری و هەندی هۆزی کورد بۆ پشتیوانی لەهێزە نیزامیەکانی ئێرانی و لەناوبردنی راپەڕینی کورد(٥١).

لەو هۆکارە بابەتی و خودییانەی پەیوەستن بە سروشتی جولانەوەکە کەئێرە جێ‌ی درێژەپێدانی نیە، شێخ نەیتوانی پارێزگاری لەو دەسکەوتانە بکات کە لەسەرەتاوە لەبەرانبەر هێرشی ئێرانی بەدەستی هێنا بوو، پەرت و بڵاوی لەناو هێزەکەی بەدیار کەوت، ناچار بوو بکشێتەوە بۆ ناو خاکی

عوسمانی و خۆی بەدەست ئەو هێزەوە بدات کە لەسەرسنوور چاوەروانیان دەکرد، بەمەش جولانەوەکەی کۆتایی هات.

راپەرینی ئەم دواییەی کورد دەرهاویشتەی چەند هۆکارێك بووە، ململانێی رووسی ـ عوسمانی لەلایەك و رووسی ـ بەریتانی لەلایەکی ترەوە. ناتوانین نکوڵی لەپەیوەندی دووجەمسەری بکەین، واحیساب بکەین جولانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵلا دەرهاویشتەی شەڕی ئەو دوایەی رووسی ـ عوسمانیە، جولانەوەکەی یەزدان شێریش بەرئەنجامی شەڕی قەرم بووە، بۆیە لەهەردووکیان کورد یەك نیشانە دەپێکن ئەویش سوود وەرگرتنە لەململانێی خۆرهەلاتی ناوەڕاست بۆ گەڕاندنەوەی ئەو میرنشینە کوردیانەی کەسوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩ز) لەناوی بردبوون.

هەوڵەکانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەدرێژایی سەدەی بیستەم بێئاکام بووە، ئارەزووی رووسیا بۆ پاراستنی یەکیەتی خاکی ئێرانی رێگر بووە لەبەردەم سەرکەوتنی بزاڤی شێخ عوبەیدوڵلا، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەڕۆڵی بەریتانیا بکەین لەیەکخستنی هەوڵی هێزە ئەورووپیەکان دژی ئەو جولانەوەیە، کورد بووە قوربانی ناکۆکی هێزە ئەورووپیەکان بەتایبەتی بەریتانیا و رووسیا بۆ هەیمەنە لەناو دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش لەگەڵ پەندێکی ئەفریقیدا دێتەوە کە دەڵێ (فیلەکان بەگژیەکدا چوون و گیا زامدار بوو).

## پوختەی توێژینەوە

بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم کورد رۆڵی کاریگەری هەبووە لەناکۆکیەکانی عوسمانی- رووسی، بەئاشکرا هەریەك لەم دوو دەوڵەتە هەوڵی بەکارهێنانی کوردیان داوە، هۆی رقەبەرایەتی کورد لەگەڵ عوسمانیەکان دەگەڕێتەوە بۆدەستبەسەراگرتنی میرنشینە کوردیە سەربەخۆکان و سەپاندنی ئیدارەی مەرکەزی بەزەبری هێزو کەوتنە ژێرکاریگەری دەوڵەتە ناسیونالستەکانی رۆژاوا. سوڵتان مەحموودی دووەمیش تۆڵەسەندنەوەی رۆژاوایە لە دەوڵەتی عوسمانی.

هەوڵی چەندین جارەی کورد بۆ سوود وەرگرتن لەناکۆکی عوسمانی . رووسی لەپێناو گەڕاندنەوەی میرنشینە سەربەخۆکانی کورد بێئاکام بووە بەهۆی تێکگیرانی بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی کەپارێزگاری دەوڵەتی عوسمانی مەبەست بووە نەك ئارەزووی کورد بەمەش کورد باجەکەی دا.

خوێنەر لەگەڵماندا دەپرسێ لەکوردستانی تورکیا چیڕووی دەدا ئەگەر دەست تێوەردانی ئینگلیز نەبوایە لەناکۆکی دەوڵەتی عوسمانی و یەزدان شێر؟ یان چارەنووسی کوردستان چیدەبوو؟ یان ئەگەر ئینگلیزو رووسەکان هاوکاری حکومەتی ئێرانیان نەکردبا لەدژی جولانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری ؟.

زۆر بەکورتی دەڵێین بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم کورد لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و لەمەیدانی ململانێی هێزە گەورەکان بوە قوربانی جوگرافیای سیاسی، بسمارك دەرفەتی مێژوویی بەدەست هێنا بۆ گەلەکەی و یەزدان

شێرو شێخ عوبەیدوڵڵاش لەو بێهێزتر نەبوون، ئەمە ئاکامی دواکەوتوویی سەرکردایەتی کوردو کۆمەڵگای کوردی نیە، بەڵکو هۆکاری (جوگرافیای سیاسی)و بەرژەوەندی هێزەکانی رۆژاوایە لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست، هەتا ئێستاش ئەمە هۆکاری بێئاکام بوونی خۆزگەکانی نەتەوەی کوردە.

# سەرچاوەو پەراوێز

(*)-ئـەم وتـارە بـەدوو بـەش لـەژمارەی (٣و٤) كـانوونی یەكـەمی ١٩٩٦ز و (٥)ی ئـازاری هـەمان سـاڵی گۆڤـاری (ئـاڵای ئیسـلام)ی بڵاوكراوەكـانی پەیوەنـدی ئیسـلامی خوێندكاران و لاوانی كوردستان بەزمانی عەرەبی بڵاوكراوەتەوە.

1.G.lenczowski The Middle East in World Politics (Cornell University Press,19800),P.38-39

2- England And the Near East the Crimea (Landon;frank Cass and Company Ltd. 1964) p. 74.

3-7.Foreign Office Historical Sec. Arminia And Kurdistan (london ; HMO , 1920) .

(*) لەبـەر ئـەوەی دكتۆرعوسمـان نوسـینەكانی بەشـێكی بـە وتـاری جیـا جیـا لەژمارەكانی گۆڤاری (ئـاڵای ئیسـلام) بڵاو كردۆتـەوە، لەهـەر بابـەتێك پێویسـتی كردبێت ئـامـاژەی بەو ڕێكەوتنامەیە داوە، بۆشـوێنی ئەویٚ پێویسـت بووە، مـەرج نیـە خوێنـەر هـەموو ژمارەكـانی لـەلا هـەبووبێت و بگەڕێتـەوە سـەر. ئێمـە لێـرەدا خۆمـان لەئەمـە دەبوێرین و، بەم ڕوونكردنەوەیە لەسەر ڕێكەوتنامەكە خوێنەر باشتر حاڵی دەبێت و هەم ئەوی پێویست نەبێت لەئاماژەكانی ناو ئەم كتێبە كوژاندوومانەتـەوە :_ لەساڵی ١٥١٤ز سوڵتان سەلیم بۆسوود وەرگرتن لەكورد و بیٚلایەكردنی كورد لەشەڕی دەوڵەتی سەفەوی هـەوڵی خوێنڕیكردنـەوەیدا لەگـەڵ كـورد، مـەلا ئیدریسـی بەتلیسـی لـەدوای ڕاوێـژ بەژمارەیـەك لەسـەرۆك و مـیری سەرانسـەری كوردسـتان بـەناوی هەموانـەوە ڕێكـەوت كوردستان بەبیٚ شەڕ ببێتە بەشێك لەدەوڵـەتی عوسمـانی و میرو سـەردارە كوردەكـان دان بنێن بەدەسەڵاتی سوڵتان و لەوتاری هەینی دوعا بۆسـوڵتانی عوسمانی بكرێت و سـاڵانە ئەندازەیەك باج بدەن بەئەستەنبوڵ و لەكاتی پێوست بەژمارەیەك سوارە بەشداری جەنگە دەرەكیەكان بكەن، لەبەرانبـەردا دەوڵـەتی عوسمـانی دەسـت لـەكاروباری ئـەو میرنشـینانە وەرنەدات و كاروبـاری خۆیـان لەلایـەن خۆیانـەوە بەرێوە ببـەن و بەپشتاوپشت دەسـەڵاتی لامەركـەزیان بۆبمێنێتـەوە. ئـەم كـارەی مـەلا ئیـدریس چۆن هەڵدەسـەنگێنرێت، كـارێكی باشی كرد یان نا ئەمـە هەندێك مشـت و مڕی لەسـەرە بـەڵام هـەر چۆن بێـت كوردسـتانی لەشـەڕێكی وێرانكـەر ڕزگـار كـرد و ئاكـام مـیرو میرنشـینەكوردەكان لـەم ڕێكـەوتنامەیـە سوودمەند بوون بەگەورەی سنووری دەسەڵاتی خۆیان مانەوە.

4.FO.78\2991 political NO.1 Diayar Janib,1879 Kurdstan Consulate.

5-David McDowall, A,Modern History of the Kurds (London; I.B. Taurs ,1996) pp 6-9

6.M.van Bruinessen , Agha, Saikh and State : On the Social and Political Oganization of Kurdstan (Utrect ,1978), pp 293 –234.

7-Wadi Jwaideh ,,The Kurdish Natoinalist Movement : Its Origins and Develpoment,, unpublished ph.D. Dissertation, Syracuse Univ, 1860 pt,1 pp.213-214.

٨-خالفين ، الصراع على كردستان ، بغداد،١٩٦٣،ص٤٢-٤٣

٩- د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ، بغداد،ص ٤٣-٤٤

10-P. Aviarov,Osmanli –Rus Ve Iran Savalarda Kurtler trs. From Russian. Muhamed Varli, (Ankara;Sipan, 1995) pp, 172-173.

11.P.Wallen,Caucasian Battlefelds (Cambridge Unversity Press,1937)pp,36-37.

١٢- نوار، تاريخ العراق الحديث، القاهرة، دار الكتب، ١٩٦٨، ص٢٠١

13-Lieut.Col. j .Shiel,and Arbil to Sulaymaniyah , in july and Augu Vol. . Desember 1836.

14. Leters from Persia , R. Taylor to Ciurt of Directors,oct.21 , 1831 cited in J . Malone, U.S.A 1975, p.4.

کردۆته سەر دوو لایەنەکەی‌تر.

نوار ، ل١١٩

15.F.O . 78\ 957, Rawlinson to Adington,Jone 14,

(*) لەتوێژینەوەکانی بەڕێز دکتۆر عوسمان عەلی هۆکاری دەولی لە لەباریەکچوونی شۆڕش و راپەڕینەکانی کورد رۆڵی گرنگ و یەکلاکەرەوەی هەیە، ئەمە پێچەوانەی لێکدانەوەو قەناعەتی مێژوونووسانی رابردووە، نووسەر لەتارەکانی زیاتر پشتی بەستووە بەدیکۆمێنت و لێدوانی بەرپرسانی ولاتانی زلهێزی هەردوو سەدەی نۆزدەو بیست، زیاتر پشتی بەستووە بەدیکۆمێنت و لێدوانی بەرپسانی ولاتانی زلهێز، مامۆستا سەلام ناوخۆش لەلێکۆڵینەوەیەکی بەنرخیدا ئەو نوشستیانەی دابەش کردووە بەسەر سێ تەوەرەی ناوخۆ، ئیقلیمی، دەولی ، بەناوی سێگۆچکەی هەرەس دەورەکەی بەووردی دابەش کردووە، بەراستی دکتۆر کەئەم لایەنەی بەگەورەتر خستۆتە روو

توانیویەتی ئەکادیمیانەو لەسەر بەڵگەی زیندوو ئەم لایەنە نیشان بدات بەڵام کەمتر جەختی لەسەر لایەنەکانیتر کردووە. ,1853

16. S.A. Waheed, The Kurds And Their History (Lahore ; Univ. Book Agency), pp.143-144.

١٧-خالفین، ل٤٢

١٨-جليل جليلى : من تاريخ الامارات الكردية في الامبراتورية العثمانية ،ترجمة م.نجار ، ديمشق الاهالي ١٩٨٧، ص١٤٨.

19-Jwaidah- pt. 1. Pp.332-333

٢٠سەرچاوەی پێشوو، ل١٥١-١٥٢

٢١-ئاڤریانۆڤ، ل١٨٨

٢٢-خالفین، ل١٧-١٧٧

٢٣-جلیلی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥١

24-Caucasian Command Records, Memo.col .Boris Melikov.Nov .30,1855.

٢٥-خالفین، ل١٠٤-١٠٨و جلیلی، ل٣٠-٣١

26-Caucasian Command Records Letters for Gengeral Muragvov to Yezdan Shir Beg No, g,Sarilims Aug, 20 1954.

27- FO. 78\ 11\5 M osul. A.N. Rassem.Teleq J an .29, 1855.

28-Khalfin, p.80.

٢٩-جلیلی، ل١٥٤

٣٠-خالفین، ل٨٣

31-Kurdish Nationlist Movement, pt. T. p.377

٣٢-شەمزینی، ٥٨-٦٠ Kendal p.22

(*)- پێم وایە قەناعەتی شەقامی عەرەبیو توورکیو فارسی بەرانبەر نەك بەتەنها کورد بەڵکو بەرانبەر هەموو نەتەوەکانی هاوسنووری ئەو سێ نەتەوەیە رۆشن نیە، دەسەڵاتی سیاسی بەهەر حاڵ لێدەگەڕێن چونکە لێرەدا لەگەڵ دکتۆر هاوڕاین بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێ بیریارو رۆشنبیرو نوخبەی خوێندەواری ئەو سێ نەتەوەیە کاریگەریان بەسەر شەقامی نەتەوەکانی خۆیانەوە هەیەو بەگشتی هەستی ناسیونالستێکی دیکتاتۆریان هەیە، بۆنموونە پێم وایە بەعسی پارتێکی ناسیونالستێکی رەگەزپەرستی عەرەبییە کە هەڵوێستی بەرانبەر کوردو نەتەوەکانیتر رۆشنە، بەر ئەنجامی بیرکردنەوەی بەشێکی زۆری شەقامی عەرەبیە بووەو بەعسی پەرەی پێداو خستیە چوارچێوەی رێکخستنو ئاراستەکردن، بەواتایەکیتر سەرهەڵدانو

گەشەسەندنی بەعسی لەهەناوی نەتەوەی عەرەبی ئاکامو بەرئەنجامو دەرهاویشتەی ئەو قۆناغەی بیرکردنەوەی عەرەبی بووە نەك بەعسی بوون عەرەبی بەو ئاراستە هاندابێت. راستە لەهەموو ئاستەکان بیرکردنەوەی دروست هەبووە لەناو ئەو سێ نەتەوەیە بەلام قسە لەسەر زۆرینە دەکەین. ئەمەش قۆناغەو بەدڵنیایی دەڕوات بەلام ئێمە لەسەر ئەو واقیعە دەکەین کە بووە ·

33-Caucasian Command Records constantionopole. Memo. No. 27. Oct.23 1876

٣٤-خالفين، ل١٠١

٣٥-خالفين، ل١٠٥

٣٦-خالفين، ١٧٩

٣٧-خالفين، ل١٠٨

38-FO, 60\44\ |Memo Oct 1. 1881.General Abdol Tabviz.

٣٩-ئەقريانۆڤ : ل١٢٢

٤٠-خالفين، ل١١٧

41- FO, 60\44\ |Memo Oct 1. 1881.General Abdol Tabviz

42-Kurdish Nationlist Movement, pt. T. pp 224-226

٤٣- محمد حرب ، مذكرات السلطان عبدالحميد ، القاهرة، ص٥٥-٥٧

44-Jwaideh, p.223.

45-Jaideh. Pp. 240-241.

46-S.G. Widson, Persian Life and Customs. (New York 1969) p. 110.

47-Jwaideh, pp. 239-240

٤٨-شەمزينی، ل٦٠

٤٩-خالفين، ل١٨٢-١٨٤

50-Ropert E Speer, The Haima Sahib The foregn Doctor (London; Flemining H. Revell Comp) pp. 82-83

51-Speer. pp 90-93

# حکومەتی بەدرخانی کوردی و
# ململانێی کوردی ـ ئاشووری

یەکەم ـ کەسایەتی میربەدرخان

دووەم ـ هۆکارە ئیقلیمیەکانی سەرهەڵدانی بەدرخان

ـ هۆکارەکانی کەوتنی بەدرخان

ـ ململانێی کوردی ـ ئاشووری

ـ پوختەی توێژینەوە

ـ پاشکۆی بەڵگەنامەکان

ژمارەیەک لەتوێژەرەوان قسەیان لەسەر حکومەتی یەکگرتووی کوردستان کردووە کەمیر بەدرخان لەسالانی (١٨٤٣- ١٨٤٧) دایمەزراند. بەلام هەتا ئێستا هەندێک گرێکوێرە لەمەڕ سروشتی پەیوەندیەکانی میر بەدرخان لەلایەک و کۆمەڵەکانی بەنەسرانی (مسیۆنەر)کاران لەلایەکیترەوە هەن. ئەم وتارە هەنگاوێکە بۆلابردنی ئەو تەم و مژە لەگەڵ قسەکردن لەسەر ئەو هۆکارانەی ڕێگەیان خۆشکرد بۆ میر بەدخان وەکو سەرکردەیەکی مێژوویی بەدیار بکەوێت، دواتر لەهۆکارەکانی رووخانی حکومەتی میر بەدرخان دەدوێن.

میرانی بۆتان بۆماوەی زیاتر لە(٥٠٠) ساڵ میرنشینی بۆتانیان بەدەستەوە بووە، ئەو میرنشینە لەناوچەی نێوان بۆتان سۆ (لقێکە لەرووباری دیجلە) لەرۆژاوا و رووباری دیجلە هەڵکەوتووە، باشووری دەبێتە ولایەتی موسڵ، بۆتان ناوچەیەکی بەرفراوان بووە و ئەمڕۆ پێی دەوترێت ناوچەی جەزیرە لەکوردستانی تورکیا، میر بەدرخان کوڕی عەبدولخانە دەچنەوە سەر خێزانی (عەزیزیە)یە، دامەزرێنەری میرنشینەکە عەبدولعەزیزی کوڕی کامەدی لەنەوەی سەرکردەی بەناوبانگی مسوڵمان خالیدی کوڕی وەلیدە(*) ، بەلام هەندێك رەچەڵەکی بنەماڵەی بەدرخان دەبەنەوە سەر گوندی (ئاوێزانی) کورد لەنزیك شاری جەزیرەی ئبن عومەر، مێژوونووسی رووسی فلادمێر مینۆرسکی قەناعەتی وایە ڕەچەڵەکی ئەو خێزانە دەگەرێتەوە بۆیەك لەو هۆزە کوردانەی بوونەتە مسوڵمان(١).

کۆمەڵێك هۆکار هەبوون لەچەسپاندنی یەکیەتی هۆزە کوردیەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی لەدەوڵەتێکی کوردی فیدراڵ دا لەژێر سایەی میر بەدرخان، لەوانە کەسایەتی سەرنج ڕاکێشی خۆیی و رووداوە لەبارە

ئیقلیمـــی و دەولیـــەکان. ئـــەم دەوڵەتـــە لەباشـــوورەوە هـــەتا موســـڵ و لەخۆرهەڵاتـەوە هـەتا شـاری سنەی میرنشـینی ئەردەڵانی کوردی لـەئێران و لـەباکورەوە هـەتا شـاری وان و لەباشـووری رۆژهـەڵاتی تورکیـا بـۆ دەورازەی شاری دیاربەکر فراوان بوو.

## یەکەم : کەسایەتی میر بەدرخان

توێـژەرەوان لەســەر ئـەوە کـۆکن مـیر بـەدرخان کەسـایەتیەکی سـەرنج راکـێش و سـەرکردەیەکی سیاسـی و ئیـداری کـەم وینـە بـووە، دکتـۆر وادی جوەیدە لەنامەی دکتۆراکەیدا لەسەر کەسایەتی ئەو پیاوە دەنووسێ (میر بەدرخان کەسایەتیەکی کارزماتی سەرنج راکیش و مێژوویی بووە، گومانی تیانیە گەورەترین کەسایەتی مێژووی کوردە) (٢).

دکتـۆر جوەیـدە لەسـەر قسـەکانی دەڕواو دەڵـێ (میر بـەدرخان قەناعـەتی پتـەوی هـەبووە خـوا هەڵبـژادووە بۆسـەرکردایەتی مسـوڵمانی کـورد بـۆ دابینکردنی یەکیەتی و رزگار بوون لەزوڵمی دەسەڵاتی عوسمانی)(٣).

ئیسـلامەتی وەکو ئاین و بیروباوەڕ کاریگـەری بەرچاوی هـەبووە لەسـەر کەسایەتی میر بەدرخان، هەردوو میسوێنەر (میستەر رایت و میستەر بریـث) ماوەی دوو مانگیان لەمیوانداریەتی بەدرخان بەسـەر بردووە، لـەو بارەیـەوە دەڵـێن (پیـاوێکی لـەخوا تـرس بـوو، زۆربـەی کاتـەکانی بەخواپەرسـتی و وێردەوە دەگوزەراند هەندێك جار رۆژگاری بەرپرسیاریەتی وەکو بەرپرسی دەوڵەت و بەزیکرو خواناسیشەوە دەبردە سەر)(٤). زانایـان رۆڵـی بەرچاویان هـــەبووە لەحکومـــەتی بـــەدرخان، حـــوکمی لـــە هـــەر بابـــەتێك دابێـــت لەبەڕێوەبەرایەتیەکـەی راوێـژی بـەزانایان کـردووە، توێـژەرەوەو گـەڕۆك و

دیبلۆماسی ئینگلیزی (هنری لایارد) لەساڵی ١٨٤٣ز سەردانی شاری جەزیرە (پایتەختی میرنشینی بۆتان)ی کردووەو لەبارەی میربەدرخانەوە دەنووسێ (لەواقیعدا لەژێر کاریگەری و کۆنترۆڵی زانایانی ئاینی دابوو) شەڕی میربەدرخان لەگەڵ ئاشووریەکان بەڕای لایارد لەژێرکاریگەری ئایین و بەهۆی دەورەدانی بووە بەزانایانی ئاینی، دەڵێ لەنزیکەکانی بەدرخان زانایەکی موجاهید هەبووە بەناوی شێخ زاهیر(٥).

مسیۆنەر* ی ئەمریکی دکتۆر گرانت چەندین جار سەردانی دەوڵەتەکەی میربەدرخانی کردووەو بۆچوونی هاوشێوەی ئەمەی هەیەو دەڵێ (میربەدرخان بەچینی زانایان و شێخەکانی تەریقەت دەورە درابوو ئەمیش رێزی زۆری دەگرتن)(٦).

رۆڵی زانایان لەئاراستەکردنی حکومەتەکەی بەدرخان گەیشتە رادەیەك لەدوای رووخانی لەشاری ورمێی کوردستانی ئێران زانایان کۆنگرەیەکیان بەستو لەبەیاننامەیەکدا ئۆباڵی بەرپرسیاریەتی حکومەتەکەی بەدرخانیان خستبووە ئەستۆی ئاشووری و دوژمنانی ئیسلام لەمسیۆنەرانی(٧).

بەدرخان لەرۆژانی دەسەڵاتی دا سوور بوو لەسەر سەرنج راکێشانی جەماوەری کورد، ئەمەش بەدابینکردنی خۆشگوزەرانی لەناو میرنشینەکەی دا، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش دەیوست لاسای و پەیڕەوی بەرنامەی سەرکردە مێژووییەکان بکاتەوە بەتایبەت خەلیفەکانی راشیدی و سەلاحەدینی ئەیوبی، بۆیە کەوتبووە بڵاوکردنەوەی دادگەری لەناو داورودەستەکەی دا. میر بەدرخان زەوی بەسەر جوتیارەکان دابەش کردو ئەندازەیەکی زۆری ئەو باجانەی لابرد کە دەوڵەتی عوسمانی دەمارگیرانە

---

* میسۆنەر: مژدەدەر (المبشر)

بەسەر جوتیارەکانیدا سەپاند بوو، میسیونەری ئینگلیز میستەر رایت باس لەکۆبوونەوەی دەوری دەکات لەنێوان میربەدرخان و هەژارو کەم دەرامەتەکان، راستەوخۆ پێداویستیەکانی خۆیان دەخستە بەردەم میرو ئەویش بۆی دابین دەکردن و هانی میرو سەرداره کوردیەکانی دەدا هەمان سیاسەت لەگەڵ جەماوەر پەیڕەو بکەن، لەبەر ئەو متمانەیە بووە لەنێو جەماوەر وا بڵاوبۆوە (خوای گەورە میر بەدرخانی ناردووە هەتا رزگاریان بکات) لەپاشماوەی ئیدارەی سەختی وێرانەی عوسمانی لەکوردستان(٨).

میر بەدرخان بەئەندازەی خانەدانی و سۆزو میهری لەبەرانبەر هەژاران لەجێبەجێکردنی یاسای ئیسلامی بەتایبەت (سزادان= العقوبات) لەنێو میرنشینەکەیدا توندو تۆڵ بووە، گەشتیارو میسونەرەکان لەکاتی سەردانیان بۆ دەوڵەتەکەی بەدرخان بەسەر سوڕمانەوە باسی بەعەزمی دەکەن لەکارەکانیدا، میستەر رایت دەڵێ چەندین میل لەناو کوردستان لەسەفەردا بووین، ئەوەی تێبینیمان دەکرد ئارامی و ئاسایش و گەشەکردنی ژیانی ئابووری بوو، هەندێك جار بەبێترس لەدەشت ودەر دەخەوتین، نەدزی هەبوو نەکوشتن، گەرچی بەر گوێمان دەکەوت لەهەرێمەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی دزی و کوشتار هەیە، هەروەها میستەر رایت دەڵێ تاوانبار رۆژێ لەرۆژان چاوپۆشی لێنەدەکرا، هەرێمی کوردستان لەوانە پاك کرابۆوە ئەمە لەسەر فلان حیسابە و ئەوە لەسەر فیسار حیسابە، گەندەڵی نەمابوو، ئەمانە لەبەشەکانیتری دەوڵەتی عوسمانی هەبوون، میستەر رایت کۆتایی بەقسەکانی دێنێ و دەڵێ رۆژێکیان لەلای میر بەدرخان بووم دزێکیان هێنا لەدوای ساغبوونەوەی تاوانباری یەکسەر فەرمانیدا دەستی راستی ببڕن ، ئەمەش نیشانەی ئاسایشە(٩).

توێـژەرەوەی رووسـی (ن، خـالفین) لەگەشـتیاری رووسـی (ج. دیتلـۆ) دەگێڕێتـەوە کـە لـەرۆژانی دەسـەڵاتی بـەدرخان سـەردانی بۆتـانی کـردووە، ئاماژە بۆ بوونی ئاسایش‌و ئارامی تەواو لەناوچەکەدا دەکات، خالفین ئەم سـەرنجەی لەهێـزا دیتلـۆ وەرگرتـووە کـەدەڵێ منـداڵ بـەڕۆژ دەتـوانێ لەشانشـینەکەی بـەدرخان بـڕوات‌و زێـڕی بەدەسـتەوە بێـت بـەبێ ئـەوەی لەکەس بترسێت، ئەمەش بووە هۆی کۆچکردنی زۆری کوردان بۆ میرنشینی بۆتان، میر بەدرخان وەکو نەریتی خۆی پارچە زەویەکی کشتووکاڵی دەدایە هەموو پەنابەرێك بەرانبەر ١/٣ی بەهای داهاتەکەی بۆدارایی، وەکو مەرج دەبوایـە خـاوەنی ئەسـپ‌و چـەك بێـت‌و لەحالـەتی ئامـادەیی دابێـت بـۆ پارێزگاری لەمیرنشینەکە، بەمەش میر بەدرخان میرنشینێکی پێك هێنابوو کە پێویستی‌و بژێویەکانی خۆی دابین دەکرد(١٠).

مـیر بـەدرخان سیاسـەتێکی بەحیکمـەت‌و ووردی هـەبووە لەگـەڵ مـیرە کوردیەکان، ئەو پێی وابوو میرە کوردیەکان لەناوچەکانی خۆیاندا شوێنی تایبەتیان هەیە لەدڵی شوێنکەوتووانی خۆیان، هەر هەوڵێکی بەزۆر لکاندن بەدەوڵەتەکەی ئەوەوە شەڕی ناوخۆی میللی لێدەکەوێتـەوە، ئەمەش هـەموو لایـەك بێهێـز دەکات‌و دوژمـن (مەبەسـت لەدەسـەڵاتی مەرکـەزی عوسمانیـە) بەهێز دەکات. بۆیە هەوڵیدا دۆستایەتی سەرۆك هۆزو میرە کوردەکان بکات بـەناردنی دیـاری‌و داواکردنیـان بـۆ پایتـەختی دەوڵەتەکـەی هـەتا رێکەوتننامەیـەك بـەناوی (پـەیمانی پـیرۆز) ببەستن. مسیونەر رایـت بۆمـان دەگێڕێتـەوە کەدەوڵەتـە کوردیـەکان لەپێشـبڕکێ دابـوون بـۆ جـەزیرەی ئـیبن عومەر بۆ گوێڕایەڵی‌و دۆستایەتی‌و دیاری هێنان بۆ میر بـەدرخان. زانایان‌و سەرۆك هۆزەکان بەشـەرەف گـەورەیان دەزانـی لەخزمـەتی‌دا ئامادەبن(*) میر بـەدرخان بـەهۆی رەوشـت بـەرزی‌و خانـەدانی و میوانـداری تـوانی دڵـی

سەرۆك هۆزەكان بەلای خۆیدا راكێشی[11]. بەمەش میربەدرخان بەبێ خوێن رشتن توانی حكومەتێكی فیدراڵ دابمەزرێنێ كەزۆربەی هەرێمە كوردیەكانی نێو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی ملكەچی بن، ئەو دەوڵەتە كوردیەی دەسەڵاتی لەباشوورەوە نزیك بەموسڵو بۆدیاربەكرو لەرۆژهەڵات هەتا شاری سنە لەباكور هەتا وان درێژببۆوە. ئەوەی لەسەرەوە لەسەر ژیانی میر بەدرخان باسمان كرد دەمانگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی دەبێت سەرۆكە كوردەكانی ئەمڕۆ لەسەر دەرسو ئەزموونی بەنرخی ژیانی ئەو كەسایەتیە كوردیە پایە بەرزە كۆببنەوە، بەتایبەتی دوو خاڵی گرنگ جێی بایەخ پێدانە :-

یەكەم: گرنگی دان بەئاواتەكانی جەماوەری كوردو كاركردن لەپێناوی بەرژەوەندی ئەوانو دابیكردنی ئەندازەیەك لەدادگەری كۆمەڵایەتی لەنێو كوردستاندا، ئەمەش بەقەدەغەكردنی ئەو كەمینە چاوچنۆكەی ئیستغلالی هەموو كۆمەڵگا دەكات، هەروەها جێبەجێكردنی سزاكانی ئیسلامی بۆ لەسنوور دەرچوان بەشێوەیەكی دادگەرانە، هەنگاوی تووند یەكجار گرنگە بۆ بڵاوبوونەوەی ئاسایشو ئارامی لەكوردستان، ئەمڕۆ نەخۆشیەكانی كۆمەڵی رۆژاوا وەكو كوشتنو دزیو گوازراونەتەوە كوردستان، ئەم نەخۆشیانەش بەخواستنی یاسای رۆژاواو جێبەجێكرجی لەناو كۆمەڵگایەكی مسوڵمان چارەسەر نابێت.

دووەم:- یەكگرتنی كوردستان لەژێر دەسەڵاتی میر بەدرخان بەبێ خوێن رشتن لەفیرالیەتدا بابەتێكی شایستە بەلێكۆڵینەوەیە بۆسەركردە كوردەكان لەیەكلایی كردنەوەی ناكۆكیەكان بەئاشتیانە بۆیەكگرتنی سیاسی هەنگاو بنێن.

## دووەم / هۆكارە ئیقلیمیەكانی سەهەڵدانی بەدرخان

ســاڵی ١٨١٦-١٨٤٧ لەمێــژووی دەوڵــەتی عوسمــانی‌دا كۆمــەڵێك گۆڕانكـاری ریشـەیی لەپێكهاتـەی ئیـدارەیی و سـەربازی‌و سیاسـی و بـاری دەرەكی هاتە دی، هەموو ئەم گۆڕانكاریانە پێكەوە هۆكاری یاریدەدەر بوون بۆ سەرهەڵدانی بەدرخان، بەشێك لەو هۆكارانە سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٣-١٨٣٩) بوو كە دەیوست دەوڵەتی عوسمانی بگۆڕێ بۆ دەوڵەتێكی مەركەزیی بەهێز لەسەر شێوەی رۆژاوا، بۆئەو مەبەستە رژێمی لامەركەزی هەڵوەشاندەوەو دەسەڵاتی دەزگای مەركەزیی حكومەتی لەنێو هەرێمەكان پتــەو كــرد، لەبــەر ئــەنجامی ئــەو سیاســەتە ســوپای (ئینكیشــاری) هەڵوەشاندەوە كەبۆ ماوەی چەند سەدە كۆڵەكەی سوپای عوسمانی بوو، بەمەش سوڵتان مەحمود هەڵەی گەورەی كرد، ئەم كارەی ئەنجام دا پیش ئــەوەی پێكهاتــەی تــازە لەســوپای نــوێ گەشــە بكــات كەبــەناوی (هێــزی مەحمودیەی سەركەوتوو = قوه المحمودیه المنصوره) كە لەسەر شێوازی رۆژاوا دایمەزرانـدبوو، بەمـەش بۆشـایەكی سـەربازی دروسـت كـرد، والـی هەرێمـەكان بەدەرفـەتیان زانـی سـەربەخۆیی خۆیـان رابگەیـەنن، رووسیاش بەشـێكی بـەرفراوانی لەئاسیای ناوەراسـت و قـەوقاز داگـیر كـرد، لـەماوەی سـاڵانی ١٨١٦- ١٨٣٩ز موحەمـەد عـەلی لەمیسـر وەكـو هێزێكـی عـەرەبی سـەری‌هەڵداو بەدەسـەڵاتی عوسمـانی‌دا هەڵشـاخا، هێـزی مـەمالیك لـەعێراق سەری هەڵداو ولایەتەكانی باكوری ئەفریقیا جیا بوونەوە، لەساڵی ١٨٣٨ز ئیبراهیم پاشای سەركردەی سوپایەكەی مەحەمەد عەلی پاشای والی میسر شەڕی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی لـەولاتی شام‌و ئەنادۆڵی رۆژهـەلات دەست پێ‌كـرد، ئەمـەش یـەكێك بـوو لـەو گۆڕانكاریانـە كەشـوێنەواری بەســەر

کوردستانەوە هەبوو، لەئاکامدا هێزەکانی لەبەرانبەر هێزەکانی میسر تێک شکا، دەوڵەتی عوسمانی هێزی تەواوی نەبوو بۆ بەرپەچدانەوەی هێزەکانی ئیبراهیم پاشا، بۆیە داوای لەمیر بەدرخان کرد سوپایەك ئامادە بکات بۆ بەرپەچدانەوەی هێزەکەی موحەمەد عەلی، میر بەدرخان و میرە کوردەکان لاوازی دەوڵەتی عوسمانیان بۆ دەرکەوتبوو، قەناعەتیان وابوو هێزەکانیان یەکبخەن و دەستپێشخەری بکەن بۆپارێزگاری کوردستان(١٢).

گۆڕانکاریە ئیداریەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی کە بەتەنزیمات ناسرابوو لەماوەی سالانی ١٨١٢ــ ١٨٤٣ شوێنەواری خراپی بۆسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ناوچە کوردیەکان هەبووە، دەوڵەتی عوسمانی سوپایەکی بێبەزەیی بەسەرۆکایەتی رەشید پاشای سەدری ئەعزەم (سەرۆك وەزیری پێشوو) و موحەمەد ئیجە بیرقدار (والی دیاری کراو بۆکوردستان)ی نارد هەتا کۆتایی بەدەسەلاتی میرنشینەکانی باشوورو رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ و ولایەتی موسڵ بهێنن. هێزەکانی عوسمانی توانیان بەسەر میرنشینەکانی بادینان و سۆران و باباندا زاڵ بن(*). لەکوردستانی تورکیاش دەوڵەتی عوسمانی دەسەلاتی خۆی گەڕاندەوە ناوچە کوردیەکان، تەنها دەسەلاتێك مابوو هێزەکەی میربەدرخان بوو لەبۆتان. شتێکی ئاسایی بوو میرە کوردەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان چاویان لەمیر بەدرخان بێت، ئەمە لەکاتێکدا بڕیاری سوڵتان مەحمودی دووەم (دواتر سوڵتان عەبدولمەجید و عەبدولعەزیز) بۆ لەناوبردنی میرنشینە کوردیە خاوەن دەسەلات و خۆجێیەکان پێچەوانەی نەریتی باوی چوار سەدەی پێشووی ناو دەوڵەتی عوسمانی بوو، رێکەوتنامەی نێوان میرە کوردەکان و دەوڵەتی عوسمانی سالی ١٥١٦ز دەسەلاتی میرنشینە کوردیەکانی لەشوێنی خۆی هێشتبۆوە.

دەسەڵاتی میرنشینە خاوەن حوکمی زاتیەکان نەما بەمەش حالەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتوانی ناوچە کوردیەکان وێران بوو، دەوڵەتی عوسمانی کاربەدەستی ناکامڵ و گەندەڵی لەبەڕێوەبردن دامەزراند، دەسەڵاتی ئەمانەش زیاتر لەشارەکان کورت هەڵهاتبوو بەڵام گوندە دوورە دەستەکانی کوردستان دوور لەدەسەڵاتی یاسا تووشی وێرانی و بێزاری ببوون، جوتیارەکان لەدوولاوە دەچەوسێنرانەوە بەهۆی کاربەدەستانی دەوڵەت و هەم بەهۆی ئەو سەرۆك هۆزە کوردانەی ئەم بارودۆخەیان بەدەرفەت زانی بوو(١٣).

لەئاکامی پیادەکردنی یاسای ئیلتیزام لەکۆکردنەوەی باج لەجوتیاران هەرەسهێنانێکی بەرچاو لەژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی رووی‌دا، بەپێی ئەو سیاسەتە دەوڵەت کۆکردنەوەی باجی بەکرێ دەدا بەمولتەزیمەکان، ئەوانیش باجەکەیان کۆدەکردەوە و لەبەرانبەر ئەو خزمەتەی بەدەوڵەتیان دەکرد لەکۆکردنەوەی باج دەستیان بەسەر بەشێکی دادەگرت، ساڵانە بەشێکی باج دەچووە گیرفانی ئەو مولتەزیمانە کەبەزۆری پیاوی دەوڵەمەند یان بەرپرسانی پێشووی دەوڵەت بوون، ئەمانیش دڵڕەقانە خۆیان گران دەکرد هەتا زۆرترین رێژەی باج و داهات کۆبکەنەوە لەو جوتیارانەی بەهەژاری و کولەمەرگی دەژیان، ئەوەش لەتواناى‌دا نەبوایە باج بدات لێدان یان زەوی و زارو سامانەکەی زەوت دەکرا یان ناچاردەکرا کێڵگە کشتوکاڵیەکەی بەجێ‌بهێڵێ، بەمەش باری کشتوکاڵ دواکەوت. لەسەدەی نۆزدەهەمدا سیاسەتێکی وێرانتر سەری هەڵدا ئەویش بەکرێدانی پلەو پایەی ئیداری بوو، کەسێك لەپایە حکومیەکان یان لەدامەزراوێکی حکومی دەهات بەرپرسیاریەتێکی حکومی لەیەکێك لەهەرێمەکان بۆماوەی ساڵێك

یان دووساڵ بەکرێی دەدایەوە بەیەکێك لەبازرگانەکانی ئەستەنبوڵ ئەم لەجیاتی خاوەن وەزیفە دەبووە بەرپرس.

وەزیفەیان دەکڕی بەبێ‌ئەوەی خۆیان لە وەزیفەکە بگەیەنن، ئەو کاربەدەستەی پلەو پایەی کڕیبوو هەموو شێوازێکی دلڕەقانەی دەگرتەبەرو دەرفەتی لەدەست نەدەدا لەکۆکردنەوەی باج و میرانەی حکومی، هەتا بەشێکی بداتە حکومەت و بەشێکی بۆ ئەو کەسەی لێی بەکرێ گرتووەو بەشێکی بۆخۆی. چونکە کاری ئەم کاربەدەستانە کاتی بووە، بایەخیان نەداوە بە ئاستی بژێوی جوتیاران و حالەتی دووبارە نەبوونەوەی برسیەتی و کارەسات و نەخۆشی، بۆیە ناوچە کوردیەکان تووشی خراپترین حالەت بوون(١٤).

لامان سەیر نابێت کوردو میرەکانی بەرەو لای بەدرخان بچن هەتا لەو بارودۆخە سەختەدا سەرکردایەتیان بکات. ئەوەشمان لەبیر نەچێت لەمێژبوو میر بەدرخان خۆی ئامادەدەکرد میرنشینەکەی ببێتە ناوەندی رووبەڕووبوونەوەی عوسمانی، لەسییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەستی بەدامەزراندنی پێویستیەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ کردبوو. بۆئەمەش کارگەی چەك و تەقەمەنی دانا و کەوتنە بنیاتنانی دامەزراوەی فێرکردن و ناردنی خوێندکار بۆ دەرەوە بۆ زیادکردنی شارەزایی هونەری(١٥).

زۆربەی نوسەران و بەشێك لەرۆژهەلاتناسان بزاڤی بەدرخان بەبزاڤێکی نەتەوەیی ناو دەبەن کەئامانجی رزگارکردنی کوردستان بووە لەملهوڕی نەتەوەیی تورکی کەلەعوسمانیەکان بەرجەستە ببوو. ئەوەی تێبینی دەکرێ نووسەرە کوردەکان تێڕوانینی خۆیان لەسەر ئەو نامیلکەیە بنیات ناوە کاتی خۆی لەبیستەکانی سەدەی بیستەم میر جەلادەت بەدرخانی

ئـەوەی مـیر بـەدرخان نووسـیویەتی بـەناوی (القضـیة الکردیـة ماضـي الکـرد وحاضرهم ) وەکـو دەزانین جـەلادەت بـەدرخان نەشۆڕشـەکەی باوکـی دیـوەو نەلـەکاتی شۆڕشـەکەدا هـەبووە ، بـەڵکو هەڵسـەنگاندنەکانی لەروانگـەی ئـەم سـەردەمەی ناسیونالسـتی رۆژاواییـەوە داڕشـتووە(١٦). وادی جوەیـدە دیراسـەیەکی تـەواو گشـتگیری لەسـەر بزاڤەکـەی بـەدرخان ئامـادە کـردووەو رای تەواو جیاوازی هەیە لەوەی بزاڤەکەی بەدرخان بزاڤێکی ناسیونالستی بووبێـت، بـەڵکو بـەبزاڤێکی تەقلیـدی دەزانێـت کـەئامانجی تەقلیـدی سنووورداری هەبووە، هەروەها هێژا (مارتن ڤۆن برۆنسن) لەلێکۆڵینەوەیەکی بەنرخیـدا لەسـەر کـورد هـەمان بۆچـوونی هەیـە. برۆنسـن وای بۆدەچێت بزووتنەوەکەی بەدرخان دەچێتە خانەی ئەو بزووتنەوانەی لەسەدەی نۆزدەهەم لەهەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی پەیدابوون بەتایبـەتی لەهەرێمـە کوردیـەکان، ئـەم بزاڤـە بەهـەوڵ و کۆششـی دەمڕاسـتە تەقلیدیـەکان هاتـە کایەوە بۆ پارێزگاری لەبەرژەوەندی هەڕەشە لێکراویان لەلایەن دەسەڵاتی مەرکەزییـەوە، هـەروەها بڕۆنسـن دەگاتـە ئـەوەی بڵـێ (هـیچ ئاماژەیـەکی نوسـراو لەسـەردەمی بـەدرخان نیـە ئـەوە بسـەلمێنێ ئامـانجی نەتـەوەیی هەبووبێت)(١٧).

رای نووسەری ئەم وتارە بەلای رای دکتۆر جویەدەو بڕۆنسن دایە لەسەر جەخت کردنە سەر بزاڤی بەدرخان بەوەی بەرئەنجامی هەوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانی بووە بۆ نەهێشتنی میرنشینە خاوەن حوکمی زاتیەکان، لەدوای دۆزینەوەی بەڵگەنامە رووسی و عوسمانیەکانی تایبەت بەسەدەی نۆزدەهەم هـەتا ئێسـتا هـیچ ئاماژەیـەك نەدۆزراوەتـەوە جـەخت بکاتـە سـەر ئـەو دەمارگیریە، هەتا لەو کاتەش میر بەدرخان دەسەڵاتی کردەیی هەبووە بەسەر

کوردستانی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی ناوی سوڵتان لەگەڵ ناوی زۆربەی ئەو میرە کوردیانە دەهات کەخاوەنی دەوڵەت و حکومی زاتی بوون، بۆنمونە لەساڵی ١٨٤٦ز میربەدرخان بەمیسیونەرە ئەمریکیەکانی راگەیاندووە هەتا ئێستاش رێزی سوڵتان دەگرێ و لە بەڵێنی خۆی پاشگەز نەبۆتەوە(١٨).

نمونەی هەوڵەکانی بەدرخان لەکوردستان بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی سەربەخۆی هاوچەرخ وەکو هەوڵەکانی موحەمەد عەلی پاشای والی میسرو داود پاشای مەملوکی دەسەلاتداری عێراقی وابووە، لەهەموو حالەتەکاندا والیە روناکبیرو کارامەکان بناغەی هێزێکی ئیقلیمی سەربەخۆیان بەکردەوە دانابوو، بەلام وەکو ناتوانین موحەمەد عەلی پاشای ئەلبانی بەپێشەنگی نەتەوەیی عەرەبی دابنێین، هەروەها داود پاشای لەقەوقاز راهاتوو بکەینە دەمڕاستی عروبەی عەرەبی بۆ بەدرخانیش بەهەمان شێوە.

حوکم دان لەسەر جولانەوەی بەدرخان یان هەر جولانەوەیەکی کوردی سەدەی نۆزدەهەم بەبزاڤی نەتەوەیی حوکمدانێکی نابابەتی و پێچەوانەی راستی‌یە، چونکە ئەمە لەپێش سەرهەڵدانی سیاسەتی بەتورککردن (تتریك) بوو لەناو دەوڵەتی عوسمانی، بیری ناسیونالستی هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم نەگەیشتبووە دەوڵەتی عوسمانی.

حکومدانی هەندێك لەنووسەرە رۆژاواییەکان لەسەر جولانەوەکەی بەدرخان بەوەی بزاڤێکی ناسیونالسییە، لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی سەرپێی‌دا دەگەیەنە ئەو ئاکامەی ئەو حکوم دانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەقلەیەت و مەنهەجیەتی هەندێك لەنووسەرە رۆژاواییەکان و بڕیاردان لەسەر رووداوەکانی کومەڵگای ئیسلامی بەهەمان پێوەدانگ کە ئەو شەپۆلە ناسیونالستیە لەناو کوردا سەری هەڵنەداوە.

دەتـوانین بڵـێین بزووتنـەوەی بـەدرخان بنـەمای فیکـریو سیاسـی بۆبزووتنەوەکانی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریو شێخ عەبدوسەلامی بارزانیو ئـەوانیتر دارشـت. خـاڵی هاوبەشـی نیـوان ئـەو بزوتنەوانـە ئـەوە بـووە بیروبۆچوونیان لەئیسلامەوە سەرچاوەی گرتبوو، زانایـان سـەرکردایەتیان دەکرد، ئـەو بنەمایـەی دایـان رشـت لابردنـی زوڵـم بووە لەسـەر مسوڵمانانی کورد، ئەمەش لەرێگەی جیٚبەجێکردنی دادگەری شەریعەتی ئیسلام.

## هۆیەکانی کەوتنی حکومەتی بەدرخان

کۆمـەڵێك هۆکار بوونە هـۆی رووخـانی حکومەتـە کوردیەکـەی بـەدرخان، بـەڵام لەپێشـەوە نـاکۆکی کـوردو ئاشـووری هوکـاری یەکلایکـەرەوەی راسـتەوخۆبووە، بەمسـیۆنەرانی ئینگلیـزو ئـەمریکیو فەرەنسـیەکان رۆڵـی بەرچاویان لـەئاگر خۆشـکردنی ئـەو ناکۆکیـەدا بینیـووە، ئەمـەش لـەپێناوی دروسـتکردنی بڕووبیـانوو هـەتا دەوڵـەتی بـەریتانی ـ عوسمـانی کۆتـایی بەحکومەتە سەربەخۆیەکەی بەدرخان بهێنن.

### ململانیٚی کوردی ـ ئاشووری

سەدان ساڵە ئاشوریە نەستۆریو کلدانـەکان لەگـەڵ کورد لەولایەتـەکانی هـەکاریو موسـڵ نیشـتەجێن، پەیوەنـدی ئاشـتیانەو رێـزی هاوبەشـیان هـەبووە، گـەلی ئاشـووری گـەلێکی کـۆنو ئـازان، سروشـتیان وەکـو هـۆزە شاخاویەکانەو لەجەنگدا قاڵـەوە بوون، هەندێك لەلێکۆڵـەرەوان پیٚـیان وایـە کلدان لـەو هـۆزە کوردانـەن لـەزووە بوونەتـە دیان، سـەدان سـاڵە لـەو هەرێمە

نیشتەجێن‌و خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ کورد دا هەبووە، کوردو میرە کوردە مسوڵمانەکان بەشێك لەبەڕێوەبەرایەتی خۆجێیان دابوو بەئاشووری‌و کلدانەکان. ئاشووریەکانی هەکاری لەناوچەکانی تیاری‌و تخوماو ئەشیتا لەلایەن چینێکی تیوکراتی بەڕێوە دەچوون بەناوی (ئەبوناو کاشتیاس). مارشەمعۆن لەسەرووی ئەم چینە تیوکراتیەوە بووە کە لەناوچەی جولەمێرگ دادەنیشت، ئەمە لەکاتێکدا دەبوایە دەسەڵاتی دونیایی لەو ناوچانە لەلایەن سەرۆك هۆزەکانەوە بەڕیوەببرایە کە پێیان دەوترا پاشا (الملوك). ئەو پاشاو مەلیکانە وەك‌و دەستەیەکی بەڕێوەبەرایەتی حوکمی ناوچەکە باجیان کۆدەکردەوەو بڕیارەکانی دەوڵەتی عوسمانی یان میرە کوردە دەسەلاتدارەکانیان لەناوچەکە جێبەجێ دەکرد(١٩).

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەسەڵاتی حکومەتی بەریتانیا لەنێو دەوڵەتی عوسمانی زۆر زیادی کرد، ئەمەش بەشێك بوو لەناکۆکی بەریتانی - رووسی بۆ پاراستنی هاوسەنگی هێز لەئەوروپا، لەئەنجامی کۆمەڵێك شەڕی نێوان رووسیاو عوسمانی هێزەکانی رووسیا هاتنە ناوچەکانی هاوسنووری کوردستانی تورکیاو لەناوچەی ئازەربێجانی رۆژاوا چوونە نێو قوڵایی کوردستانی ئێران، کارگەیشتە هەڕەشە لێکردنی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەلایەن رووسەوە لەگەرووی دەردەنیل‌و بەسفۆڕ لەگەڵ بەرژەوەندیە ئیستیعماریەکانی لەعێراق‌و هیند، لەبەر ئەوە پشتیوانی کردنی دەوڵەتی عوسمانی‌و پاراستنی یەکیەتی خاکی عوسمانی بووە گرنگترین بنەمای سیاسەتی بەریتانی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەبەر گرنگی شوێنی کوردستان لەململانێی رووسی - بەریتانی هەریەك لەو دوو دەوڵەتە دەیانویست جێ پێی خۆیانی تیا بکەنەوە(٢٠). رووسەکان لەمیانەی دروستکردنی پەیوەندی پتەو لەگەڵ ئەرمەن هەوڵی هاتنە ناوەوەی ناوچە

کوردیـــەکانیان دەدا، ئینگلیزیـــەکانیش لـــەلای خۆیانـــەوە باســـی یەزیـــدیو ئاشووریان هینایە گۆڕێ(٢١).

سەرەتای ناکۆکی ئاشووری ـ کوردی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای چلەکانی ســـەدەی نۆزدەهـــەم. ئـــەو کاتـــەی دەوڵـــەتی عوسمـــانی ژەنـــەراڵ موحەمـــەد بیرقـــداری والـــی کوردســـتانی بەســـوپایەکەیەوە ئامـــادەکرد بـــۆ لـــەنێوبردنی میرنشینە کوردیەکان بەتایبەتی بۆ لەنێوبردنی میرنشینی بادینانی کوردی لەئامێدی، میرەکانی بادینان خاوەنی دەسەڵاتی فراوان بوون لەناو خاکی کوردستان. هـەروەها میرنشین و کـوردە یەزیدیو سەرۆك هـۆزە کوردەکان کەوتنـــە خـــۆ بۆنـــاردنی تیمـــی فریاکـــەوتن بـــۆمیر ئیســـماعیلو داوایـــان لەمارشـەمعۆن کـرد هێزێـك بۆفریاکـەوتنی مـیری بادینـان لـەدژی دەوڵـەتی عوسمانی ئامادە بکات، لەسەر ئەو ئەساسەی ئەوان سەر بەدەسەڵاتداریەتی میری هەکارین، مارشەمعۆن ئەو کات لەژێر کاریگەری یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی دابوو لەموسڵ بەناوی (رەسام)، با ئـەوەش ئاگادار بین حکومـەتی بەریتانی ئەو کات پشتیوانی لەدەوڵەتی عوسمانی دەکرد بۆ لەنێوبردنی میرنشـینە سەربەخۆکانی کـورد، بۆیـە مارشـەمعۆن فـەرمانی مـیری هـەکاری رەتکردەوە لەناردنی هێز بۆ یارمەتی هێـزە کوردەکان، ئەمە قینی کوردانی دژی ئاشووریەکان بزواند(٢٢).

ناکۆکیەکانی نێوان ئاشووریو کورد بەگەیشتنی میسیونەر(المنصر)ە بەریتانی و ئەمریکیەکان بۆ ناوچەی هەکاری گەرمتر بوو، لەساڵی ١٨٣٨ز مســیونەری بـەریتانی ناســراو بـە(بادجـەر) گەیشـتو پێشـتر بـەدوو ســاڵ (بیســـتر بـــیکن) گەیشـــتبووە ناوچـــەکە، هـــەردوو میســـیۆنەر بەئاشـــکرا بانگەوازیان بۆهەڵگەڕانەوەی ئاشووریەکان دەکرد دژی وەکو دەڵێن (کوردە دەمارگیرەکان)، هەروەها یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی رۆڵی گەورەی لەو

ئاگر خۆشکردنەدا بینی بەناوی بانگەوازی بەردەوامی بۆ دەستێوەردانی بەریتانی بەبیانووی راگەیاندنی چاودێری بۆسەر هەکاری بۆپاراستنی ئاشووریەکان. زیادبوونی ناوەندەکانی بەگاورکردن بۆئاشووریەکان لەساڵی ١٨٤١ متمانەی بەمارشەمعۆن دا بەئاشکرا داوای چاودێری بەریتانی بکات، لەساڵانی ١٨٤١ ـ ١٨٤٣ز کوردو لایەنگرانی مارشەمعۆن چەند هێرشێکیان بۆ سەریەکتر دەست پێکرد، ئەمانە زیاتر بوونە هۆی هاندانی میربەدرخان بەڵام ئەو هەوڵیدا بەر لەوەی هەر بڕیارێك بدات راوێژ بکات لەگەڵ والی ئەرزڕۆم کە لەڕووی کارگێڕیەوە سەرپەرشتی هەکاریو بۆتانی دەکرد، والی ئاگاداری مارشەمعۆنی کرد دەست لەکاروباری دونیایی وەرنەداتو لەسنووری خۆی دەرنەچێت، ئەمە بۆچینی پاشاکان لێبگەڕێ، بەڵام مارشەمعۆن فەرمانی والی رەتکردەوەو بەردەوام لەپەیوەندی کردن دابوو لەگەڵ یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەموسڵو بەردەوام بوو لەهەڵگەڕانەوە لەدەسەڵاتی میری هەکاری. لەو کاتەی بادجەر لەساڵی ١٨٤٣ز لەناوچەی (تیاری) بوو نوێنەری میری هەکاری گەیشتە لای مارشەمعۆنو داوای لێکرد بۆ یەکلایکردنەوەی چەند مەسەلەیەکی ناکۆکی نێوانیان سەردانی میر بکات، لەو کاتەدا کوڕی مارشەمعۆن بەئامادەبوونی باوکی بەنێردراوی میری ووت (ئێمە ملکەچی ئێوە نین ئێستا وڵاتی ئێمە موڵکی ئەو پیاوەیە، ئاماژەی بەبادجەر کرد)(٢٣).

لەدوای بەدیارکەوتنی هەڵگەڕانەوەی مارشەمعۆنو لایەنگرانی لەمیری هەکاری، میری هەکاری داوای لەمیربەدرخان کرد دەست بگرێ بەسەر هەڵگەڕانەوەی ئاشووری، میربەدرخان یەك لەپیاوەکانی بەناوی زەینەڵ بەگ لەگەڵ هێزێك نارد بۆئاشیتا، هێزەکانی مارشەمعۆنیش هێزێ کوردەکانیان لەقەڵای شار چەند رۆژ گەمارۆدا، هەتا ئەوانەی ناو قەڵا لەبرسان مردن(٢٤).

بۆمەستی چاوترساندی مارشەمعۆنی هەڵگەڕاوە میربەدرخان سوپایەکی ٢٦هەزار کەسی ئامادە کرد کەهەموو میرنشینە کوردیەکان بەشدار بوون، سوپای کورد لەژێر فەرمانی توندوتۆڵ دابوو بەوەی نابێت ئازاری هیچ ئاشووریەکی شەڕنەکەر بدرێت، هەر بۆنمونە ئاشووریەکانی دانیشتووی (تخوما) تووشی هیچ ئازارێك نەبوون چونکە سەرۆکە روحی و دونیاییەکانی تخوما نەچوونە پاڵ هەڵگەڕانەوەکەی مارشەمعۆن میربەدرخانیش خەڵاتی کردن(٢٥).

حکومەتی بەریتانی بە سیخوڕایەتی کە لەبەرگی میسیونەرایەتی خۆیان شاردبۆوە ئاگاداری تەواوی رووداوی هەڵگەڕانەوەی ئاشووریەکان بوون، هەروەها ئاگاداری رێوشوێنی میربەدرخان هەبوون لەچاوترساندنی ئاشووریەکان، بۆیە هەوڵیاندا فشار بخەنە سەر موحەمەد پاشای کویتلی هەتا بەرگری لەئاشووریەکان بکات، بەڵام ئەم هەوڵانە بێ‌ئاکام بوو، هەروەها بەڕێگەی ژەنەراڵ (شیل) ئەفسەری یەکەمی سیخوڕی لەرۆژهەڵات هەوڵ درا فشار بخرێتە سەر ئێران نەیەڵێ کوردەکانی ئەوێ هاوکاری میر بەدرخان بکەن بۆهێرشی سەر پێگەی هەڵگەڕاوە ئاشووریەکان. نازانرێ بۆچی والی موسڵ لەبەرژەوەندی ئاشووریەکان نەبزووت و خۆی لەم کارە نەگەیاند، هێزەکانی کورد پێگەکانی مارشەمعۆنیان گرت و ئەویش هەڵات بۆ موسڵ و لەوێ پەنای بردە بە قونسوڵیەتی بەریتانی(٢٦).

سەرچاوە رۆژاواییەکان بەترسناکی باس لەکوشتاری ئاشووری و زەوتکردنی ماڵ و سامانیان دەکەن، هنری لایارد سیخوڕی بەریتانی ژمارەی کوژراوەکان بە١٠ هەزارو بریندار بەسەدان مەزندە دەکات(٢٧).

نامە هاتووەکانی مسیونەرە ئەمریکی و ئینگلیزەکان باسی کارەسات و حاڵەتی تاڵان و تێکدانی کەنیسە و کێڵگە و بەکەنیزەکردنی ئافرەتان و

کوشتنی منداڵو قەشەیان کردووە لەلایەن وەکودەڵێن (کوردە دەمارگیرەکان)ەوە، ئەمە لەکاتێکدا میربەدرخان ژمارەی کوژراوی ئاشووریەکانی بەهەزار داناوەو کوژراوو بریندار کوردانیشی بەنزیك لەوە دیاری کردووە. مارشەمعۆن دانی ناوە بەپێنج هەزار کوژراوو بریندار لاینگرانی(٢٨).

نابێت خۆ لەوە ببوێرین لەو شەڕە خێڵەکیانەی نێوان کوردو ئاشووریەکان ژمارەیەکی زۆر قوربانی هەبووبێت بەتایبەتی لایەنی ئاشووری تێکشکاو. بەڵام دە هەزار بەتەواوی زیادەڕۆییەو مەبەستی سیاسی لەپشتەوە بووە، ئەمە لەکاتێکدا ژمارەی ئاشووریەکان لەناوچەکەدا نەدەگەیشتە ٦٠ هەزار کەسو شەڕ بۆماوەی مانگێكو لەناوچەیەکی شاخاوی سەختو بەچەکی سەرەتایی بووە، ئاشووریەکان بەش بوونو بەتەنها شەڕ ناوچەی تەیاری گرتبۆوە، راستی زیاتر بەلای بەدرخاندا دەشکێتەوە کەژمارەی هەردوولای بە٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠ کەس داناوە، بەڵام میسیونەرانی ئەورووپی بەمەستی سیاسی زیادەڕۆییان لە ژمارەی قوربانیان کردوە هەتا دەست لەکاروباری ناوچەکە وەربدەنو فشار بخەنە سەر دەوڵەتی عوسمانی بەناوی وەستانی کوشتاری ئاشووری(٢٩).

دەوڵەتی عوسمانی یەکسەر وەفدێکی حکومی بەسەرۆکایەتی کامیل پاشا ناردە لای میربەدرخانو داوای لێکرد شەڕ رابگرێو دیلەکان تەسلیم بەکامیل پاشا بکات، میر بەدرخانیش بەرگری لەهەڵوێستی خۆی کردو جەختی کردەوە کە ئاشووریەکان بەفیتی میسیونەرەکانو (رەسام)ی ئینگلیز دەست درێژی کەربوونو هێرشەکانی ئەم لەدژیان بۆ چاوترساندن بووە لەبەرانبەر دەستدرێژی بەردەوامی ئەوان بۆ سەر گوندە هاوسنوورەکانی ئاشووری، هەروەها بەدرخان بەباشی لەگەڵ دیلەکان

ڕەفتاری کردووەو تەسلیم بەکامیل پاشای کردون، بێجگە لەهەندێکیان کەمسوڵمان بوون، ڕەسامیش دانی بەرەفتار چاکی بەدرخان داناوە لەگەڵ دیلەکان(٣٠).

لەگەڵ ئەوەدا میربەدرخان لەلای خۆیەوە لاپەڕەی شەڕی بەلاوە ناو و کۆتایی پێهێنا بەڵام ئینگلیز بەڕێگەی ڕەسام و میسیونەرەکان لەهەوڵی بەردەوام دابوون بۆ دروستکردنی ئاژاوە لەنێوان کوردو ئاشووری. لەساڵی ١٨٤٦ز چەند شەڕێك لەنێوان لایەنگرانی مارشەمعۆن کەدووبارە هەڵهاتبوو بۆ لای والی موسڵ و لەوێ دەپارێزرا لەگەڵ هێزەکانی کورد روویان دا، بەمیسیونەرو قونسوڵیەکانی وڵاتانی ئەورووپی ئەمەیان گەورە کردو قوربانیانی لایەنی ئاشووریان لەقەبارەی خۆی زیاتر نیشاندا لەپێناو هاندانی حکومەتەکانیان هەتا بێن و فشار بخەنە سەر دەوڵەتی عوسمانی بۆکۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی بەدرخان، تەنانەت ڕۆژنامە ڕۆژاواییەکان ژمارەی قوربانیانی ئاشووریان لەو ڕووداوە گەیاندە پێنج هەزار کەس، ئەمە لەکاتێکدا بەڵگەنامە نهێنیەکانی بەریتانیا کەبەم نزیکانە بڵاو بوونەتەوە ئاماژەیان تەنها بە(٥٠٠)پێکراوی لایەنی ئاشووری کردووە(٣١).

## ڕۆڵی دەوڵەتی عوسمانی لەو ململانێیە

زۆربەی نووسەرە کوردەکان لەو بڕوایەدان دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ئینگلیز دەستی هەبووە لەهاندانی ئاشووریەکان لەدژی کورد، بۆ ئەمەش هیچ بەڵگەیەکی نووسراوی ڕۆژانی ناکۆکیان لەبەردەستدا نیە، ئەم قەناعەتەشیان لەکتێبی ب،ج، شێرکۆ (جەلادەت بەدرخان) بەناوی (القضية الكردية) وەرگرتووە(٣٢).

دکتۆر جوەیدە ئەگەری دەستێوەردانی دەوڵەتی عوسمانی لە ململانێی

(كوردى ـ ئاشوورى) بەدوور نازانێت، ئەميش لەلاى خۆيەوە پشتى بەهيچ بەڵگە يان بنەمايەكى مێژوويى نەبەستووە، قەناعەتى خۆى بەتەنها لەسەر گومانێك دامەزراندووە بەوەى حكومەتى مەركەزى لەپێناوى دووبارە گەڕاندنەوەى خۆى بۆ ناوچەكە ويستويەتى هەردوولا كوردو ئاشوورى لاواز بن(٣٣).

لەناوەندە ئەوروپيەكانيش بەتايبەتى لەنێو ئينگليز قەناعەتى پتەو هەبووە لەسەر ئەوە كەدەوڵەتى عوسمانى لەگەڵ كوردەكان دەستى هەبووە بۆپيلان لەدژى ئاشووريەكان، هەروەكو باڵوێزى بەريتانيش ئاماژە بۆ دەستێوەدانى دەوڵەتى عوسمانى لەبەرژەوەندى كورد دەكات بۆ سەركوتكردنى ئاشووريەكان، مسيونەرى ئەمريكى (گرانت) قەناعەتى وايە والى موسڵ لەگەڵ كورد هاوكار بووە بۆلێدانى ئاشووريەكان چونكە لەكاتى شەڕەكانى ١٨٤٣دا سنوورى ولايەتى موسڵى لەگەڵ ولايەتى هەكارى داخست هەتا كارئاسانى بۆ كوردان بكات بەدواى لايەنگرانى مارشەمعۆن بكەون(٣٤).

لەبەڵگەنامە بلاوكراوەو بلاونەكراوەكانى بەريتانى هيچ بەڵگەنامەيەكى يەكلاكەرەوە لەسەر هاوئاهەنگى كوردو دەوڵەتى عوسمانى نيە، لێرەدا گومانى بەريتانيا لەوەوە سەرچاوەى گرتووە كە دەوڵەتى عوسمانى هيچ رێوشوێنێكى بۆ وەستانى شەڕى نێوان ئاشوورىو كورد ئەنجام نەداوە، بەبيرمان دا دێت ئايا ئەندازەى تواناى دەوڵەتى عوسمانى بۆ كاريگەرى لەسەر لايەنە ناكۆكەكان چەند بووە؟

گومانى تيا نيە دەوڵەتى عوسمانى لەشەڕى ئاشوورى ـ كورد نيگەران بووە، ئەمەش لەبەر ئەنجامى مەترسيەكانى شەڕەكە بووە، لەحوزەيرانى ١٨٤٤ز كاميل پاشا لەكاتى هاتنى بۆ بۆتان بەميربەدرخانى گووت ئەگەر

ناکۆکی بەردەوام بێت بیانوو بەدەستەوە دەدرێت بۆ دەستێوەردانی رۆژاوا لەکاروباری نێوخۆیی دەوڵەتی عوسمانی، هەروەها گووتی: ئەگەر لەو ئاشوورییانە نەگەرێن بەریتانیا داوا لەدەوڵەتی عوسمانی دەکات جەنابتان سزا بدرێن ئەگەر نا خۆیان سزاتان دەدەن. ئەوە بزانە ئەوانە دەتوانن پێتان بگەن چونکە پێشتر لەگەڵ چین جەنگاون پێنج هەزار سەعاتەرێ لەبەریتانیاوە دووره(٣٥).

دەوڵەتی عوسمانی هیچ دەورێکی لەبرەودان بەناکۆکی ئاشووری – کوردی دا نەبووەو ناکۆکیەکە زیاتر هۆکاری ریشەیی ناوچەیی بووە، میسیۆنەرە ئەمریکایی و ئینگلیزەکان لەو لایەنەوە راستەوخۆ رۆڵیان هەبووە نەك دەوڵەتی عوسمانی، بەلام بۆچی ئینگلیز ئاشوورییەکانی لەبەدرخان هاندا؟ ئەمەش کۆمەڵێك هۆکاری خۆی هەیە، لەپێشەوە ئارەزووی بەریتانیا بۆلەناوبردنی هەر هەوڵێکی والیە ریفۆرمیستەکان یان فەرماندە ریفۆرمخوازەکانی ناو ئیقلیمەکانی دەوڵەتی عوسمان بیهێنە ئاراوە بەبەمەستی چاکسازی لەدەوڵەتی عوسمانی، چونکە ئینگیزەکان لەوە دەترسان ئەمە ببێتە هۆی لێك هەڵوەساندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی کە لەواقیعدا لەژێر کاریگەری راستەوخۆی بەریتانیادا بووە، بۆیە بەریتانیا یارمەتی عوسمانیدا بۆ سەرکوتکردنی موحەمەد عەلی پاشای والی میسر بەهەمان شێواز عوسمانیەکانی ناچار کرد هێرش بکەنە سەرمیربەدرخان.

لەدەزگا رەسمیەکانی ئینگیز ئەو قەناعەتە هەبووە، مامەڵەکردن لەگەڵ بەرپرسانی ئەستەنبوڵ و سەپاندنی ویستی رۆژاوا ئاسانە بەلام ئەستەمە مامەڵە لەگەڵ میرێکی کوردی سەربەخۆی ناوچە شاخاویە سەختەکان بکرێ، سیخوری بەریتانی هنری لایارد لەراپۆرتێکیدا نووسیویەتی دەست بەسەراگرتنی میرنشینە کوردیە سەربەخۆکان یارمەتی بەریتانیا دەدات بۆ

بەستبەراگرتنی ئابووریو بازرگانی ناوچەی کوردستان(٣٦).

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت دەوڵەتی عوسمانی نەیوستووە دەست بەسەر کوردستاندا بگرێتو کۆتایی بەحوکمی سەربەخۆی میربەدرخان بهێنێتو ئەو ناکۆکیانە بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاربێنێت.

لەراستیدا لەبنەڕەتەوە حکومەتی سەربەخۆی کوردستان بەسەرۆکایەتی میربەدرخان هەڕەشە بووە بۆسەر دەوڵەتی عوسمانی، ئەمە لەکاتێکدا هێزە گرنگەکانی سوارەی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی لەبنەڕەتەوە پشتیوانی چەکدارە کوردەکان بوون کەهۆزە کوردەکانی ناوچەکە چل کەتیبەی سەر بەدەوڵەتی عوسمانیان پێکهێنابوو، هەروەها بیست کەتیبەیتر لەنەوەی هۆزە کوردەکانی وەکو حەیدەرانیە، جەبرانیە، میران، دودری، کەحان ئەترۆشو میللی هەبوون، ئەمانە کۆڵەکەی ئەساسی هێزی عوسمانیان پێکهێنابوو لەبەرانبەر ئێرانو رووسیای قەیسەریدا(٣٧).

## هێرشی هێزەکانی عوسمانی بۆسەر میرنشینی بۆتان

لەدوای دەست پێکردنی چەند شەریکی نیوان میربەدرخانو هێزە ئاشووریە هەڵگەراوەکان، دەنگو باسی کوشتاری زۆرو کارەسات لەدژی ئاشووری ئەوروپای هەژاند، نوێنەرایەتی هێزەکانی ئەوروپا داوایان لەدەوڵەتی عوسمانی کرد بەخێرایی فریابکەویٚ، ئەگینا بەرژەوەندیەکانی عوسمانیو پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەوروپا بەتوندی دەکەوێتە بەر مەترسییەوە، کەشتیگەلی ئەورووپی بەرەو ئاوەکانی عوسمانی بزووت هەتا بەسوودی ئاشووریەکان فشار بخاتە سەر دەوڵەتی عوسمانیو لەدژی میربەدرخان هەڵوێست وەربگرێت. لە٢٧/١٠/١٨٤٦ز دەوڵەتی عوسمانی

داوای لەکارمەنـــدانی ســـەفارەتی بـــەریتانی کـــرد کەحکومەتەکـــەیان ئاگاداربکەنەوە دەوڵەتی عوسمانی خۆی بۆ لێدانی بەدرخان ئامادەکردووە. بـەڵام سروشـتی کوردسـتان و بـاری ئاووهـەواو (٦٠) هـەزار چـەکدار لـەژێر فەرمانـدەی بـەدرخان دەوڵـەتی ناچـارکردووە هێرشـەکەی بۆسـاڵێ ئاینـدە دوابخـات، ئەمـەش بۆخۆئامـادەکردن و دانـانی رێوشـوێنی پێویسـت بـوو بۆهێرشـکردنە سـەر کوردسـتان. سـەدری ئـەعزەم بەنوێنـەری حکومـەتی بـەریتانیای گـووت، حکومـەت یـەکێك لەبەرپرسـانی خـۆی ناردووە بـۆ لای بەدرخان هەتا قەناعەتی پێبکات یەکسەر شەڕەکە بوەستێنێت(٣٨).

لەبـەهاری ١٨٤٧ز دەوڵـەت لەکوردسـتان کەوتـە خۆئـادەکردنی چالاکیە سـەربازیەکانی. ئەمـەش لـەدوای رەفزکردنـی دەعوەتنامـەی سـەفەری میربـەدرخان لەسـەر داوای سـوڵتان بچـێتە ئەسـتەنبوڵ بـۆ وتووێـژ لەسـەر بابەتی شەڕی ئاشووری ـ کوردی، عوسمان پاشای فەرماندەی هێزەکانی ئـەنادۆڵ سـەرکردایەتی هێزەکـانی عوسمـانی دەرکـرد بۆسـەر کوردسـتان، لەسێ قۆڵەوە (باکور، باشوور، رۆژهـەڵات) بەسوپایەکی بـەهێزو بەبەشداری باشترین سـەرکردەکانی سوپا هێرشیان دەست پێکرد. میربەدرخانیش بۆ پارێزگـاری لەکوردســتان خــۆی ئامــادە کردبــوو، هەرچــەندە هێزەکـانی عوسمـانی لـەورمێ تووشی زیـانی گـەورە بوون، بـەڵام هـەر زوو میربـەدرخان پێـی زانـی (یـەزدان شـێر)ی بـرازای فەرمانـدەی هێزەکـانی لەگـەڵ زۆربـەی لەشـکرەکەی چـۆتە پـاڵ هێزەکـانی عوسمـانی(*)، میربــەدرخان ناچـار هێزەکـانی بۆپارێزگـاری لەجـەزیرەی ئیبن عومـەر کێشـایەوە، هـەتا دواجـار خۆی هێزەکەی هاتنە قەڵای (ئارخ).

سەرچـاوە کوردیـەکان دەڵـێن بـەدرخان دوای چـەند مـانگ بـەرگری لەبەرکـەمی تەقەمـەنی و بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی ناچـار بـووە خـۆی بداتـە

دەست هێزەکانی عوسمانی. سەرچاوەو بەڵگەنامەکانی بەریتانی جەخت دەکەنە سەر رای مێژوونووسی توورك (لوتفی) بەوەی شەڕەکان کورت بووەو لەمانگێکی زیاتری نەخایاندووەو یەکلابۆتەوە(٣٩).

عوسمان پاشای فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی لەسەر ئەو بەڵێنەی بەبەدرخانی دابوو لەدوای خۆبەدەستەوەدانی بەڕێزەوە ناردی بۆ ئەستەنبوڵ، لەدوای ئەوەی چاوی بەسوڵتان کەوت ڕێگەی پێدرا لەگەڵ دووسەد کەس لەلایەنگرانی بچێت لە قوبرس بژی، دەڵێن ئەو ڕێزلێنانەی سوڵتان لەبەدرخان ئینگلیزەکانی پێنارحەت بووەو هاتوونەتە سەر ئەو قەناعەتە کەپێشتر رێکەوتن لەنێوان بەدرخان و سوڵتان دا هەبووە(٤٠).

میربەدرخان و لایەنگرانی رۆڵی گرنگیان لەسەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەی قوبرسیەکاندا گێرا کەئینگلیزو یونانیەکان پشتیوانیان لێدەکردن، لەچاکەی ئەوە سوڵتان رێزی لێگرت و لەساڵی ١٨٥٦ز نازناوی میری میرانی دایە، دواتر لەساڵی ١٨٦٦ز رێگەی پێدرا بگەڕێتەوەو لەدیمەشق دابنیشێت، هەتا لەوێ مردو لەگۆڕرسانی سالحیەی نزیك دیمەشق لەهەمان گۆڕستانی سەلاحەدینی ئەیوبی لێنێژرابوو لەوێ نێژرا(٤١).

## پوختەی توێژینەوە

١-بزاڤەکەی میربەدرخان کاردانەوەی هەوڵەکانی دەسەڵاتی مەرکەزی عوسمانی بوو بۆلەناوبردنی ویستی کورد لەبەردەوام بوونی بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی، نەك جولانەوەی ناسیونالستی.

٢-میربەدرخان وەکو کەسایەتی ئیسلامی بیر رووناك دەیویست دەوڵەتێك دابمەزرێنێ شەریعەتی ئیسلامی تیا جێبەجێ بکرێت و زانایان

(پسپۆڕانی بواری زانستی شەرعی) لەئاستی بەرپرسیاریەتی دابن.

شەڕی بەدرخان لەگەڵ ئاشووری و بەمیسیونەرانی ئەوروپی هۆکاری سەرەکی بوو لە لەناوبردنی ئەو دەوڵەتەی کورد.

== ==== ==== ==== ==== ====

## پەراوێزو سەرچاوەکان

(*) سەرچاوەی یەکەمی ئەمە شەرەفنامەیە، مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی قسەی لەسەر ئەو مەسەلەیە کردووەو دەڵێ ئەمە لەڕاستیەوە دوورە چونکە خالیدی کوڕی وەلید کوڕو میراتگری نەبووەو میراتەکەی عەبدوڵلای کوڕی سەلەمە بردوویەتی، هەروەها حەزرەتی خالید نەچۆتە ئەو هەرێمانە، ڕەچەڵەك بردنەوە پاڵ یارانی پێغەمبەر (دروودی خوایان لێبێت) لەبەر نەجیبزادەیەو هیچیتر. بڕوانە: شەرەفنامە، تاران ١٩٨١ز پەراوێزی ژ(١)، ل٢٧٢

لەراستیدا شەرفنامە زۆری لەسەر نووسراوە بەلام هەتا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەسەر خودی سەرچاوەی زانیاریەکانی ناو شەرەفنامە نیە هەتا بزانین شەرەفنامە ئەو سەرچاوانەی پشتی پێبەستوون کامانەن؟ ڕەچەڵەکی نزیکەی ٣/١ی میرو سەرداری میرنشینە کوردیەکان دەباتەوە سەر غەیری کورد، سەحابەو یارانی پێغەمبەر( دروودی خوای لێ بێت) یان پاشاکانی ساسانیو خێڵی بەرمەکیو چەندانیتر بوونەتە بابو باپیرانی سردارو میرە کوردەکان.

1.The Azizan Princes of Bhotman, in Journal of Royal Central Azizan Studies, 36 1949 p. 245 Minorsky, Kurd, Kurdstan,, Encychopedia of Islam, p.458-459.

شرفخان بدلیسی، شرفنامه فی الدول و الامارات الکردیه، ص٣٢٠

2-W. J waideh (Kurdish Natoinist Movement Syracuse Univ.1960) Pt.184.

٣-دکتور جویده، المصدر السابق، ص١٨٥.

4-Missionary Herald XL11, November 1946.p.37
Letters fom Mr. Wright and Mr.Breath.

5-(H.Layard. Nineveh and Lts Remains {New York 1950},p183).

6-(Missionary Herald Leter from Dr. Grant XXXIX, No, 11. November.1843).

7-British Documents on Foreign Affairs.The Ottman Empire 1860-1880,(Unversity Publications of Armerica) . 1984. P.291. Telegram. No. 113. June. 2-1848.

8-Mr. Wright, p.381.

9-Wright, pp.381-382.

١٠-ن. خالفين، الصراع على كردستان، سليمانيه، ص٧٧-٧٩.

**(*)ئەم رەوشتە زۆر پێچەوانەوەیە لەگەڵ رەوشتی میرموحەمەدی رەواندزی‌و میرانی بابان کەهەمیشە بۆفراوانکردنی سنووری میرنشینەکانیان کەسیان نەخوێندۆتەوەو لەزمانی شەڕو کوشتار زیاتر زمانێکی‌تریان نەزانیووە .**

11-Wright, p. 381.

12-Noel, Diary, p. 129.

**(*) ئەمارەتی بابان لەساڵی ١٨٥١ز واتە چوار ساڵ دوای بۆتان کەوت، ئەو فیدراسیونەی بەڕێز دکتۆرو مێژوونووسانی تریش لەباسی بەدرخان ئاماژەی پێ‌دەکەن لەمێژووی سیاسی هەریەك لەو میرنشینانە بەڕوونی بەدیار ناکەوێ.**

13-M. Van Bruinessen, Agha,Shiekh And Sate. Utercht,1978, p.221.

١٤- جليل جليلي، من تاريخ الدول والامارات الكردية في الامبراتورية العثمانية، الترجمة العربية، دمشق، ١٩٨٧، ص١١٦-١١٧.

١٥- بلة. ج. شيركو، القضية الكردية، الترجمة القربية، ديمةشق، بيروت ١٩٥٦، ص٥٠-٥٢.

١٦- الترجة العربية، بيروت١٩٥٦،ص٥٠-٦٠.

17-Van Brinessen, pp.226-227.

18-Wright, p381.

١٩- عبدالعزيز الشناوي، الدولة العثمانية دولة اسلامية مفترى عليها، الجزء الرابع، القاهرة ١٩٨٦،ص١٨٣٠-١٨٣١.و

Major Frederick Millingen wild Life Among the Kurds London.1870, P.272.

٢٠- دكتور كمال مظهر، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى.

21-. Wegram and D.Lambeth The Gradle of Mankind

Life in Eastern Kurdstan London, pp. 144-148. (Princton Unversity, 1961).pp.54-56.

**(*) پەیوەندی کوردو نەتەوەغەیرە تورکەکان لەگەڵ سوڵتانەکانی عوسمانی بەسێ قۆناغ تێ‌دەپەرێ، قۆناغی یەکەم لەسەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی عوسمانی دەست**

پیٚدەکات بەڵام لەناو کوردو عەرەب و نەتەوەکانی رۆژهەڵات لەدوای شەڕی چاڵدێرانەوە ١٥١٤ز دەست پیٚدەکات، ئەم قۆناغە هەتا پیادەکردنی سیاسەتە بەمەرکەزیەتەکەی سوڵتان مەحمودی دووەم لەگریٚی دووەمی سەدەی (١٩) دەخایەنێت. قۆناغی دووەم لەسوڵتان مەحمودەوە هەتا کەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ١٩٠٨ز. دواقۆناغیش سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادیەکانە، هەتا کەوتنی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی. لەقۆناغی یەکەم پەیوەندی نێوان کوردو دەوڵەتی عوسمانی بەئەندازەیەکی بەرچاو باش بووە، ئەمەش لەبەرئەنجامی ڕێکەوتنامەی (سوڵتان سەلیم – ئیدریسی بەدلیسی) کەپێشتر ئامارژەمان پیٚدا، کێشەو ناکۆکی بەبەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی‌تر زۆر زۆر کەم بووە . کاتێك سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨ــ ١٨٣٩) بەسیاسەتی بەمەرکەزیکردنی دەوڵەت ڕێکەوتنامەی ناوبراوی هەڵوەشاندەوە میر نشینە کوردیەکان کەوتنە بەر هەڕەشەی لەناوچوون، لێرەوە ناکۆکی زەق کەوتە نێوان میرنشینە کوردەکان و دواتر سەرکردەکانی شێخی تەریقەت لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی. کێشەی سەپاندنی دەسەڵات لەگەڵ خواستی لامەرکەزی دەسەڵات لەناو هۆکارەکانی ئەو ململانێیە پشکی شێری بەردەکەویٚ، دواترو لەکۆتایی سەدەی (١٩) ئەم ململانێیە بەئاقاری چەکەرەکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی چوو، قۆناغی سێیەم سەردەمی ئیتحادیەکانە (١٩٠٨-١٩١٨) بەتەواوی ناکۆکی نێوان ڕەگەزی توورکی ناسیوتالست و خۆسەپێنەرو نەتەوەکانی تر بەتایبەت کورد (لەدوا وتاری ئەم کتێبە بەدرێژی باسی دەکرێت) گەشەی کرد. دەمەویٚ لەدەرفەتێکدا ئەوە بسەلمێنم کە دادگەری و وێژدان بەلای ئەوەدایە ئەم قۆناغە لەگەڵ ساڵانی تەمەنی عوسمانی حیساب نەکرێت چونکە ئەم قۆناغە لەهەموو ڕووەکانی فیکری و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بەدەوڵەتی عوسمانی ناچێت. لەم قۆناغە ناکۆکی ناسیونالستی لەئاکامی پەیڕەوکردنی سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی بەتوورککردن کەوتە نێوان ئیتحادیەکان و نەتەوە ناتوورکەکان، سروشتی ململانێ و دەوڵەتی عوسمانی لە پێشتر زۆر جیاواز بووە لەگەڵ ئەم قۆناغە.

٢٢- جویده، الجزو الاول، ص١٩٢-١٩٣.

23-J.Joseph,The Nestorians and Their Muslim Neighbours,

24-British Documents on Foreign Affairs, Ottaman Empire 1860-1880. P.282; Enclosure.No 169 August 2,1844.

٢٥- جویدة، الجزء الاول،ص ١٩٩-٢٠٠.

26-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoman Empire 1860-1880 P. 271; Vice Consul Rassam, July No.108.August 26,1843.

27-H.Lyard Nineveh and It,s Remains p.156.

28-British Documents on Forein Affairs, Ottoman Empire 1960-1880 p.282. Enclosure No.169. August 2,1844.

29-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoma Empire, 1860-1880,p. 277; Telegram No. 194. September 1, 1843.

30-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoma Empire, 1860-1880,pp.279-280 Enclosure No 169 August 2, 1844; Telegram No.126 17, 1844.Sir Connington.

31-British Documents on Forein Affairs, Ottoman Empire 1860-1880 p.288 Mr.Wellesley No. January 1847.

٣٢-جليلى، من التاريخ الامارات الكرديه ،ص١٣٠-١٣١.

33-The Missionry Herld XXX1X, No,11;November 1843,pp.435-437; British Documents on Forein Affairs, Ottoman Empire 1860-1880 p.273 Telegram. No.208 October.11843.

34-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoman Empire 1860-1880,p. 273;Mr. Stvens, May 18, 1844; Inclosure No. 126, June 17, 1844, SirCanning.

35-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoman Empire 1860-1880,p. 279;Mr. Stvens, May 18, 1844; Inclosure No. 126, June 17, 1844, SirCanning.

36-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoman Empire 1860-1880,p.290 ;Lord Cowley, No. 360. October 17 1847.,Memorandum on Koordistan,, by H.Layard Inclosure.

37-Sheik Waheed, The Kurd And Their Country Lahore, 1958, p. 144.

38-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoman Empire 1860-1880, p. 284-259;. MrWelesly. No. 101. October 27?,1846.

(*) ئەمەش بەشێکە لەوەهمی هاوشێوەی مەلای خەتیٚ لەمێژووی نوێی کورد، تایبەتمەندیەك لەمێژووی میللەتی ئێمە هەیە ئەویش بەکامڵ سەیرکردنی سەرکردەکانە، کاتی خۆی بۆشاردنەوەی خاڵە لاوازەکانی سەرکردە کوردەکان ئەم جۆرە کەسایەتیە خیانەتکارانەیان کردۆتە هۆکاری سەرەکی نووشستی، یەزدان شێر لەشۆڕشی بەدرخان و مەلای خەتیٚ لەرەواندز، مشیری حەمەی سلێمان لەدەربەندی بازیان .....هتد

، مێژوونووسانی رابردووش هەمان سەربووردەی نابابەتی ناو هەگبەی بیرەوەریەکانی کۆمەڵگای کوردەواریان کردۆتە هۆکاری زەقی نوشستیەکان، بەلام لێکۆڵینەوەی بابەتی لەچوارچێوەو قەبارەی خۆی نەبێت هێندە هەق بەو هۆکارە زاتی‌یانە نادات، مەسەلەی یەزدان شێرو خیانەتی لەمیربەدرخان سەرەداوی تازە پەیدابووە کە نەك بەخیانەتکاری ناناسێت، بەڵکو بەنەرێتی ئەوکاتەی دەسەلات ئەو مافی میرابەتی هەبووە لەجیاتی بەدرخان‌و لەسەر ئەم داوایە لەکاتی هێرشی عوسمانی یەزدان شێر لەگرتووخانەی بەدرخان پاشا گیرابوو، پەیوەندیان بەم مەسەلەیەوە نەبووەو ئەمە درووست کراوە. بڕوانە: د. جەبار قادر ، چەند بابەتێکی مێژووی کورد، سلێمانی ١٩٩٩، ل٨٩-٩٧.

39-Briitish Documents on Foregn Affairs, Ottoman Empire? 1860-1880, p. 260. October 17.17?.

40-E.B.Soare, to Mesopotania and Kurdistan. London. P.156; Layard, Nineveh p. 188

٤١- سون ، ل١٢٩

# پاشکۆی بەڵگەنامەکان

FO195\ 228

بۆ سەعادەتی باڵوێزی بەریتانیای گەورە / ئەستەنبوڵ

راپۆرتێك لەسەر سەردانی بەدرخان لەگۆڕستانی جەزیرە

١٠ی تەمووزی ١٨٤٤

لەدەمی رۆژاوای ٢٥ی تەمووز بەرێگەیەکی گشتی پۆستە موسڵم بەجێهێشت، بەتەنها بۆگۆڕینی ئەسپ لەسمیلْ وەستاین کە١٢ کاتژمێر لەموسڵەوە دوورە، دوای ٣٢ سەعات رێکردن لەئێوایەکدا گەیشتمە جەزیرە، رێگایەکە زۆر خۆش بوو، بۆیە بەکاتژمێرێك ٤ میلمان دەبڕی، لەشوێنی پشوودان دەحەسناینەوە، بەو هیوایە بووم بەڕێگاوەو لەماوەی مانەوەم لەجەزیرە سەرژمێری ئەو گاورانە بکەم کە تایبەتی دیل کراوون . لەئێوارەی رۆژی دووەم شاری جەزیرەم بەجێهێشت بۆماوەی یازدە کاتژمێرو نیو بەقەراغی رووباری دیجلە چووینە ناو هەرێمەکانی ناوەوە بەئاراستەی رۆژهەڵات، بەبەردەوامی رۆیشتین، بەدۆڵێکی نزمی پاڵ رووباری رەسوڵ سۆ، لێرەدا دۆڵەکە٤٠ پێ بەرزەو دوای پەڕینەوە لەرووبارەکە سەعاتێکیتر بەئاراستەی رۆژهەڵات. لەدوای ئەو رێکردنەش لەناکاو ئاراستەی دۆڵەکە بەرەو باکوور گۆڕا، لەوێ بەناوەڕاستی دۆڵێکی بەرتەسکدا رۆیشتین رۆخەکەی بەرزی ١٠٠ پێ دەبوو، ئەم ناوچەیە وەکو کلیلی ناوچەیەکی تر وابوو کەبەدرخان بەسەریدا دەیڕوانی، دەرفەتم بدە بەدرێژی لەسەر ئەو ناوچەیە بدوێم کەبەهۆی مانگەشەو دەمانبینی و لەکاتژمێر دەی شەو

گەیشتین.

لەلای راستی دۆڵەکە دەتوانی قەسری بەدرخان ببینی لەسەر لوتکەیەك بەبەرزی ٥٠ پێ دروستکراوە، قەسرەکە بەسەر لای راستی دۆڵەکەدا دەڕوانێت، لای چاودێر وابەدیار دەکەوێ هەردوو دڵەکە لەتەنگەبەری کۆتایی نێوان هەردوو چیایەکە یەکدەگرن. دەڵێن ئەو کۆشکە بەقەدەری ٩٠٠ تا ١٠٠٠ کەس فراوانە. خاوەن قەڵا (المتسلم =پایەیەکە بەرانبەر موتەسەڕیف و مەبەست لێرە بەدرخانە =دانەر) بەسەد چەکدارەوە لەو قەڵایە دادەنیشێت، لەدەروازەی لای باکووریەوە دۆڵێکی بەردینی زۆر سەخت هەیە کەمەحاڵە بەرەو ئەو دەروازەیە بچیت، ئەم قەسرە لەئەسڵدا هی میر سیفەدین بووە بەڵام لەواقیعدا بەدەست بەدرخانەوەیە قەڵایەکی قایم و رووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە بوو بەرانبەر هێزی موحەمەد رەشید پاشا کە هاتبوو بۆکۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی میرنشینە کوردیەکان. موحەمەد رەشید پاشا دوو جار هەوڵیدا بیەڕێتەوە بۆقەسرەکەی بەدرخان بەڵام بێئاکام بوو، زیانێکی زۆریشی پێگەیشت. بۆجاری چوارەم هێزەکانی موحەمەد رەشید پاشا توانیان لەتەنگەبەرەکە بپەڕنەوە بەڵام لەدوای خوێن رشتنێکی زۆر میر سەیفەدین ناچار هەڵات بۆبەغداو بەدرخان بەرەو چیاکانی دەورووبەری. لەکاتێکدا لەپشتەوە زنجیرەیەك چیای بەردینی قەراغ تیژ دەوری قەڵای داوە. خاڵێکی گرنگ هەیە ئەویش یەکێك لەرۆخە بەرزەکان پیاوانی بەدرخان پاسەوانی لێدەگرن و بەهۆی بەردێکی گەورە بەئاراستەی دۆڵەکە رێگەی پێلەدوژمن دەگرن، لەلایەکیتری لەرێڕەوەکە کەڵوو (البرج)ێك هەیە لەسەر لوتکەی چیایەك کەپیاو دەتوانی ناوچەیەکی بەرفراوانی جەزیرەو دەورووبەری ببینێت. بەهۆی ئەو کەڵووەوە میربەدرخان چاودێری دەورووبەری خۆی دەکرد. هەتا لەرێڕەوەکە

دەردەچیت دۆڵەکە فراوانتر دەبێت و ڕێگەکە خۆشتر دەبێت و هەندێ گردۆلکە بەدیاردەکەوێت، دوایی دۆڵەکە بەئاراستەی باکور لاردەبێتەوە بەرەو (دێر غلە) شوێنی نیشتەجێبوونی زستانەی میربەدرخان. قەسری میر لێرەیە لەلای ڕاستی دۆڵەکەو ڕێگایەکە فراوان دەبێت بەنزیکەی ٨٠ پێ و لێرەوە بەئاراستەی گوند ڕۆیشتین.

وەکو دەڵێن لەگوندی دێرغەل ٢٥٠ خێزانی لێنیشتەجێن ١٩٠ لەوانە کوردو مەسیحی ئەرمەن و سریانن، کۆشکی میر لەشوێنێکی بەرزی نزیکەی ١٠٠ سەد پێ دەبێت بەلای ڕاستی ڕووبارەکە، کۆشکەکە لەبەرد دروستکراوەو دیمەنێکی جوانی هەیە بەڵام دەچیە ناوەوە ئەو جوانیەی نامێنێ، کاتێ دەچیە ناو کۆشك مەیدانێك هەیە ٨٠ پێ چوارگۆشە دەبێت و خاوین نیە، لەهەر سێلای قاتی سەر زەوی خانی ئاژەڵی لێبووە، لەسەرووی ئەم خانانەش ژووری خزمەتکارەکانە، لەوێ ژوورێکی درێژ هەیە بۆسەر ڕووبارەکە درێژ بۆتەوە ئەمە هۆڵی پێشوازی میوان (سلام علیك) بوو شوێنی حەرەم (جێگای خێزان و خزم و کەس)ی لەشوێنێکی بەرزی حەوشەی کۆشکەکەیە، دیوی ناوەوەی کۆشك بەبەردو قوڕ دروست کراوە بەجۆرێك بنیاتنراوە پاسەوانی میر بەچەکەوە بتوانێت لەکاتی هێرش بەرگری بکات. لەگەڵ ئەوەدا ڕێگای جەزیرە بەردەلان و سەختەو مەحاڵ بووە عەرەبانەی بۆبچێت، بەچەك بەرگری لێدەکرێت بەڵام بۆبەرگری چەکی قورس گونجاو نیە، لەگەڵ ئەوەدا شوێنێکی بەرز نیە بەسەر کۆشك دا بنواڕێ. کۆشکی میرسەیفەدینیش بەلای باکور بە ١٠٠ ؟ بەهەمان شێوەی کۆشکی بەدرخان دروست کراوە. هەر لەوێ سێ باڵەخانەی بەردی بۆخزمەکانی میر دروست کراوە، هەموو ماڵەکانی‌تریش هی گوندنشینەکانە... لەناوچەکانی تری ژێر دەسەلاتی میربەدرخان سەرنجی

گەشەسەندن و ئەمان و بەختیاری لەرووی لادییەکان دیارە، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بارە ناڕێکە بەربڵاوەی موسڵە، لەبەیانی رۆژی ٢٤ی مانگ دێرغەلەم بەجێهێشت و بەئاراستەی گوندە کشتوکاڵیەکانی ناوچە نزمەکانی قەراغ رووباری رەسوڵ سۆ رۆیشتم، لەچەند شوێنێك لەرووبار پەڕیمەوە، ٩کاتژمێر لەناوەڕاستی دارستانێکی چڕی دۆڵی چیا بەرزەکان بەڕێوە بووین بەناچاری ماوەیەك لەسەر پشتی ئەسپەکانمان دەماینەوە لەگەڵ ئەوەدا ناوچەکە سەخت بوو توانیمان ١٥میل بڕین، ئەمەش ماوەی نێوان دێرغەلەو چیای (میرجانداگ)ە لەوێ سەربازگەکەی میربەدرخانمان لێبەدیارکەوت.

سەربازگەکەی میر لەنزیکەی ١٠٠ رەشماڵ پێك هاتووەو بەسەر سێ گروپ دابەش کراوە. بەشی پێشەوەی بۆخزمەتکارو رەعیەتەکانی میرو بەشی ناوەڕاستی بۆشوێنی میربەدرخان و میرسەیفەدین ، بەشی پشتەوە شوێنی خێزان و خانەوادەی هەردوو میر بووە. لەم بەشە ١٠تا٢٠ رەشماڵ هەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانی خانەوادەی هەردوو میر. لەئەسپەکەم دابەزیم و چوومە رەشماڵە تایبەتیەکەو لەگەڵ گەیشتمە سەربازگە دیوان ئەفەندی نێردراوی بەدرخان هات و گوتی دەتوانیت لەکاتژمێر ٩ی شەو چاوتان بەمیر بکەوێ، لەکاتی دیاریکراو بەمیر گەیشتم لەرەشماڵێکی سپی بەقوماشی سوور داپۆشرا پێشوازی لێکردم، بەقوماشی ئاوریشمی دروستکراوی عوسمانی رایەخ کرابوو. من لەدەرگایەك چوومە ژوورەوەو میربەدرخان و میرسەیفەدین لەدەرگەیەکیترەوە هاتنە ژوورەوە. میربەدرخان پیاوێکی جوان و درێژی شەش پێدەبوو گوێیەکانی بەرچاوو سمێلی کورتی هەبوو بەلام ریشی نەهێشتبۆوە. کەچی میرسەیفەدین کورتە بالا و بەرووخساریدا گەنجێکی بیست ساڵان بوو لەواقیعدا لەوە گەورەتر

دەبینرا، ئەوەی شایانی باسە پێش ١٠ ساڵ لەبەرانبەر هێرشەکەی رەشید پاشای سەدری ئەعزەم سەرکردایەتی سوپای کردووە. بەرگی هەردوو میر جوان و ئەوەی سەیری بکردایە دەوڵەمەندی و دڵفراوانی ئەمارەتەکەی پێوە دیار بوو. میربەدرخان پشتێنی گرانبەهاو دەسکی خەنجەری گرانبەهای بەقەدەوە بوو. لەکاتی قسەکردنمان نزیکەی ١٠٠ پاسەوان لەدەرگای رەشماڵەکە وەستابوون، گفتوگۆکانمان بەقسەی خۆش لەسەر بابەتە جیاجیاکان دوایی هات. بۆرۆژی دوایی میر سەردانی کردمو هەر لەگەڵ دانیشت بەحەماسەوە باسی گاورەکانم لەگەڵ کرد، لەسەر بابەتی ئەم رووداوە دڵتەزێنە بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە بۆباس کردم:-

پێشتر مارشەمعۆن سەرۆکی روحی گاورە ئاشووریەکانی ملکەچی دەسەڵاتی بۆتان بووە، لەکاروباری دونیایی تایفە هیچ رۆڵێکیان نەبوو، ئەمە لەکاتێکدا کاروباری دونیایی بەدەست کۆمەڵە کەسانێکیانەوە بووە پێیان دەوتن پاشا(الملوك)، ئەوانە پەیوەندیان بەمنەوە هەبووە. لەپێشتر ئەگەر ناکۆکی بکەوتایە نێوان تایفەی سریان یان سریان و هۆزە کوردیەکانی ملکەچی ئێمە ئەوە بەرێگەی ئاشتیانەو بەبێ دەستێوەردانی کەس چارەسەر کراوە. مەلیکەکانیان لەگەڵ نزیکەکەم نورولڵا بەگ هاوکاری یەکتریان کردووەو لەنێوان ئەوو ئاشووریەکان ناکۆکی نەبووە. بەڵام لەم دوو ساڵەی دوایی مارشەمعۆن کەوتە دەستێوەردان لەکاروباری سیاسەت و بەهێزەوە کەوتە پیلان گێڕان دژی نورڵلا بەگ. وەکو ئێمە لێی تێدەگەین میسیۆنەری ئەمریکی میستەر گرانت هانی داوەو پارەی داوەتێ بۆئاشووب نانەوە. ئەمە لەکاتێکدا میسیۆنەری ناوبراو باڵەخانەیەکی گەورەی لەشوێنێکی بەرزی ئەشیتا نوێ کردۆتەوە. لەو ماوەیەدا لایەنگرانی مارشەمعۆن هاتنە ناوچەکەمان و دوو کەسیان لەهۆزە کوردیەکان کوشت.

بەپێی نەریتی باوی ناوچەکە لەتۆڵەی خوێنی هەردوو کوردەکە دوو تاوانبارە سریانیەکەمان گرتو کوشتمانەوە. سریان لەبەرانبەردا چوار کەسی تریان کوشت. شالاوێکی تۆڵەسەندنەوەمان بۆسەر سریان دەست پێکردو ٨ سریان کوژران، لەکاتی رووداوەکان نوروڵلا بەگی سەرۆکی ناوچەی هەکاری هاتە لام بۆچاوترساندنی سریان یارمەتی بدەم کە سریان هێرشیان کردۆتە سەر چەند گوندێکی جولەمێرگو تالانیان کردووە. بەپیر داواکەیەوە چوومو لەدوای ملکەچ بوونی سریان سەردانی ناوچەکەم کرد، تیپێکی چەکدارم لەژێر فەرمانەدەی زەینەڵ بەگ لەناوچەکە بەجێهێشت، راستەوخۆ دوای گەڕانەوەی من چەکدارەکانی سریان گەمارۆی تیپە کوردیەکەیان داو ئاوو خواردنیان بۆماوەی ٩ رۆژ لێبڕین، لەگەڵ ئەوەدا زەینەڵ بەگ خۆی بەدەستەوەدا بەڵام زۆربەی پیاوەکانی کوژران، دوایی ئاویان پێگەیشتو گەڕانەوە قەڵاو، داوای لێکردم فریای کەوم، منیش هێزێکی ٢٦هەزار کەسیم بۆشکاندنی گەمارۆو چاوترساندنی سریان بۆنارد. دەبینین سریان بەدەست پێشخەری هۆکاری ئەو مەرگەساتە بوون، جەولەی یەکەم ئەو گرنگیەی نەبوو چونکە هەردوولا بەقەدەر یەک زیانمان لێکەوت، جەولەی دووەم بەهۆی خیانەتی ئەوان لەزەینەڵ بەگ رووی‌دا. ئەمجارەیان دەرفەتم بەهەندێك لەپیاوانی هۆزەکاندا سریان بکوژنو ئەو قەسابخانەیە رووی‌دا، لەراستی‌دا لەتوانامان دانەبوو جڵەوی توورەیی سوپا بگرین کە کەرامەتو مەزنی ئەوان ئیهانە کراوە. من دڵگرانم بەو هێرشەی بەبێخواستی دەسەڵاتی مەکەزی بۆچاوترساندنی گاورەکان ئەنجام دراوە، چاوەڕێ نەبووم وڵاتانی ئەورووپی لەبەرژەوەندی ئەرمەن دەست لەوکارە وەربدەن، لەمێژە مل پێکەچکردنی مەیلی هەڵگەڕانەوەی گاورەکان لەرووی یاساوە بەمن سپێردراوە،

کاتێ بەدرخان قسەکانی تەواوکرد پێم ووت، ئەو رووداوی شاڵاو بردنەی رابردوو بۆسەر سریان بۆتە حالەتی دوودڵیو نیگەرانی لای ناوەندە ئەورووپییەکان بەتایبەتی بەریتانیا، حکومەتی بەریتانی زۆر سوورە لەسەر گەڕانەوەی هەموو سریانەکان بۆشوێنی خۆیان، پێم وت (لێرەدا هەنگاوی یەکەم بەپێویست دەزانم ئەویش ئازادکردنی هەموو گیراوەکانی سریانە) . بەدرخان لەوەڵامدا وتی (هەموو ئەو دیلانەی لامان بوون کامیل پاشا لەگەڵ خۆی بردن). پێم وت (ئەمە راست نیە بەپێی سەرچاوەکانمان هیچ گومان نیە هەتا ئێستاش هەندێ دیل لەجەزیرە هەن) بەدرخان وتی (ئەو دیلانە ماوونو بوونە مسوڵمان)، ئەمەم قبوڵ نەکردو وتم (زۆربەیان نامەیان بۆئێمە نووسیوەو داوایان کردووە هاوکاریان بینو لەدیلی رزگاریان بکەین، ئەگەر بوونەتە مسوڵمان بۆچی نامە بۆئێمە دەنووسنو داوا دەکەن لەبەرژەوندی ئەوان بێینە پێشەوە، ئەگەر نەبووبنە مسوڵمان بەحوکمی ئایینو یاسا بەمسوڵمانی راستەقینە ناژمێردرێن). لەدوای گفتوگۆیەکی بەسوود گەیشتینە ئەو رێکەوتنەی من رێگەم پێبدرێت ئەو دیلە سریانانەی بوونەتە مسوڵمان ببینمو سەعاتێك لەلایان بمێنمەوە ئەگەر هەتا ئێستا قەناعەتی بەنەسرانی هەیە لەگەڵ خۆم بیبەمەوەو ئەگەر قەناعەتی بەئیسلام هەیە ئارەزووی خۆیەتی وازی لێبهێنم. وتم ئەوەی من هەتا ئێستا ئاگادارم ٩ تا ١٠ دیلی سریان لەلای تۆو میر سەیفەدین هەیە. وتی بەلام ئێستا ئەو دیلانە بوونەتە مسوڵمانو رێگە نادەم بیانگری.... دوایی بەپێکەنینەوە وتی (بۆیە ئێستا سووربوونی تۆلەسەر ئەو داواکاریانە هیچ سوودی نیە بەڵام لەئایندە لەحالەتی بەدواداچوون دەگەینە ئاکامی باش) . بڕیارم دا ئەو بابەتە وازلێبهێنمو بچمە سەر بابەتی تالانی، وتم هیچ گومانم نیە میربەدرخان قەرەبووی زیانەکانی سریان دەکاتەوە هەتا سەر لەنوێ دەست

بکەنەوە بەژیانی تازە، پرسیاری کرد چی قەرەبووکردنەوەیەکتان لەنەزەر گرتووە؟ وەڵامم دایەوە سریان ۱۸۰هەزار سەر مەڕو ملوێنێك بیاستره(دراوێکی عوسمانیە= نووسەر)یان دەوێ. میر لەوەڵامدا وتی ژمارەیەکی زۆر مەڕ تاڵان کراوە بەڵام ناگاتە ئەو ژمارەی باستان کرد، ناگونجێ حەیاری(هۆزێکی سریانیە- نووسەر) ئەو هەموو مەڕانەیان هەبووبێت. بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەو مەڕە تاڵانکراوانە ئەو سەربازانە خواردوویانە کە لەماوەی حەوت مانگ لەوڵاتی سریان ماونەتەوەو هیچی تریان نەبووە بیخۆن و پێی بژین، ئەمە هەڵوێستێك نیە گاورەکان داوای قەرەبوو بکەنەوە، لەبابەت ماڵە دزراوەکانەوە ئاماژەی میر ئەمە بوو (مارشەمعۆن پیاوی ئایینییەو چۆن رێگە بەخۆی دەدات موبالەغەو زیادەڕۆیی لەسەر ماڵە تاڵانکراوەکە بڵێ، هەموو ئەو ماڵەی دۆزراوەتەوە لەدوو گۆزەدا لەماڵی مەلیك ئیسماعیل شاردرابۆوە میر سەیفەدین بەسەر چەکدارەکانی دابەشی کرد، هەروەها بەشێکی زێڕو زیوی دزراوی کەنیسەیان گەڕاندەوە بۆقەشە لە(دێن)، نزیکەی ۱۰۰۰چەکداریان بەتفەنگ و ئەسپ سواریەوە نارد بوو لەگەڵ گەڕاندنەوەی زێڕو زیوە دزراوەکە. میر وتی (۳۲۰) دیلیان گرتبوو ئەوانەی توانیبوویان بگەڕێنەوە بەخێرایی گەڕاندیانەوە بۆ(دین). میربەدرخان لەلێدوانێکیدا دەیوت گاورەکان دەتوانن دووبارە بەهێز ببنەوە، هەروەکو من هێزی بۆتانم لەدوای لێدانە کاولکاریەکەی تووشمان بوو بەدەست موحەمەد رەشید پاشا دووبارە گەڕاندەوە. میر دەیوت هۆزە شاخاویەکان لەدوای تێکشکان توانای باشیان هەیە بۆبووژانەوە.

هەروەها گلەیم لەهەڵسوکەوتی زەینەڵ بەگ کرد، لەو ماوەی لە(ئەشیتا) سەرکردایەتی سوپای کوردی کردووەو دەستیان گرتووە بەسەر زەوی

سـريانەكان. سـەبارەت بەهەڵسـوكەوتی زەینـەڵ بـەگیش رێكـەوتین لەگـەڵ میربەدرخان كەهەڵـەبووەو وتـی لەسـەر ئەمـەش لەبەرپرسیاریەتی دەركراوە بەڵام قەناعەتیشی وابووە زیادەڕۆیی لەو بارەیەوە دەگوترێ. هـەروەها رەتـی كـردەوە كـورد دەسـتی بەسـەر زەوی سـریان دا گرتبێـت. وتـی قـورس نیـە سـەبارەت بـەمن سـەردانی ناوچـە شـاخاویەكان بكـەمو لەسـەر ئـەرزی واقیـع راسـتیەكان ببیـنم. میربـەدرخان تەحـەدای دەكـرد كـە زەوی سـریان لەلایـەن كوردەوە دەستی بەسەردا گیرابیت. لەدرێژەی قسەكانی‌دا وتـی (مارشـەمعۆن هاوپـەیمانێكی بـەهێز(مەبەسـت لەبەریتانیایـە= نووسـەر)) لـەپاڵ خۆیـدا دەبینێ، بۆیـە قەناعـەتم وایـە لەمیانـەی ئەمـەدا رووداوەكـان گـەورە دەكات). هەروەها دەیوت (بۆنمونە مارشەمعۆن ژمارەی كوژراوەكان دەگەیێنێتە ٤٠٠٠ یـان ٥٠٠٠ هـەزار كـەس لەراسـتی‌دا ژمـارەی كوژراوەكـان لـە٢٠٠٠ كـوژراو تێ‌پەڕ نابێت ). بەمیرم وت مەبەستم لەم سەردانە ئەوە بووە ناوبـژیوانی تـۆو مارشـەمعۆن بكـەم، مـیر لەمـەدا ئامـادەیی خـۆی دەربـڕی هەنـدێ دیـاری بۆمارشەمعۆن بنێرێ هەتا دڵی رابكێشێت.. میربـەدرخان بەجـدی دڵنیـایی‌دا نیەتی نیە تـەنگ بەسریان هەڵبچنێتو لەئاینـدەش بەیـەك چـەكداریش بێت پشتگیری میری هـەكاری ناكات لـەدژی سریان. هـەوڵم دا بزانم میر هەسـتی بەوە كردووە میری هـەكاری نیـەتی هێرشـی هـەبێت بۆسـەر سریان، لەوڵامـدا وتی ئەگەری ئەوە هەیە هەستی لەو شێوەی هەبووبێت بەڵام ئێستا هەسـتی لـەو شـێوەی نیـە. هـەروەها ئامـاژەی‌دا (لـەو كاتـەی سـریان دەگەڕێنـەوە ناوچـەكانی خۆیـان ئـەوە ئـەوو كامیـل بـەگ ناوبـژیوانی هـەقیقی لـەنیوان ئـەوان‌و مـیر نـوروڵلای هـەكاری دەكـەن... ئـەو ناوبژیوانیـەش بـابی عـالی بنیاتی دەنێت زەحمەتە بۆكەس لێی لابدات).

هـەروەها ئـەو گلەییانـەم بۆمیربـەدرخان بـاس كـرد كـە لـەماوەی مانـەوەم

لەجەزیرە لەگاورەکانم گوێ لێبووە، وەکو گلەیی لەسەر ئەو ئیهانە بەردەوامانەی تووشی گاورەکان دەبێت کە مسوڵمانەکان لەکاتی خواپەرستی بەرد دەگرنە کەنیسەو شوێنی خواپەرستی و نوێژکردن ئەوان. هەندێ جار بۆماوەی چەند مانگ ناتوانن دەرگای کەنیسەکان بکەنەوە لەترسی تەنگ پێهەڵچنینی بەردەوامی مسوڵمانەکان. بەدرخان نکۆڵی کرد کەئاگای لەو کارانە نیە، بەڵێنیدا لەئایندە لەبەرانبەریاندا رێوشوێنی گونجاو دەگرێتە بەر.

ئەو پیاوەی یاوەرم بوو لەو گەشتەم نامەیەکی لەحکومەتی موسڵەوە بۆبەدرخان هێنابوو. ئاماژەم بەکوشتنی ئەو راهیبە سریانیەی تورعابدین دا لەگەڵ هەڵوێستی میربەدرخان لەو بارەیەوە کە دەوڵەتانی ئەورووپی نیگەران کردووە. میر وتی (بۆیەکەم جار لەدیاربەکر گوێم لەو تاوانە بووە). هەروەها ئاماژەیدا (ئەگەر شاری میدیاد لەژێر نفوزی ئەو بمابایەوە حوکمی دادگەری جێبەجێ دەکرد دژی پیاو کوژ). بەدرخان وتی (پیاوکوژ لەم حالەتەدا سریانیەو پێشتر سەرۆکی دونیایی سریان بووە. ئەو پیاوە لەبەرژەوندی خزمەکانی پیاویك بەناوی سەلاح کوژراوە، چونکە سەلاح ناکۆکی هەبووە لەگەڵ راهیبی کوژراو. بەهۆی ئەم ناکۆکیە سەلاح دەنێرن بۆگرتووخانەی دیاربەکرو لەوێ دەمرێ. خزمەکانی سەلاح تۆڵە لەو راهیبە دەکەنەوەو دەیکوژن). بەڵام لەسەرچاوەیتر گوێم لێبووە میربەدرخان پیلانی کوشتنی ئەو راهیبەی داناوە چونکە ئەو راهیبە ویستوویەتی بچێت بۆدیاربەکرو راپۆرتێك بدات لەسەر قەبارەی ئەو سامانەی میر لەخەڵکی میدیادی تالان کردووە، وەکو بڵێی ئەو گەشتەی نەخشە بۆکێشراو بووە بەبۆنەی دەرچوونی میدیاد لەدەسەڵاتی بەدرخان، ئەم گومانەش بایەخێکی زۆری هەیە چونکە میربەدرخان زۆر بایەخی بەئارامی و ئاسایشی ئەو

ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەدا.

میربەدرخان سکاڵای دەکرد لەو کاتەوەی جولانەوەکەی میدیادی پێدرابوو بەڵام ئێستا لێی بێبەش بووە. چەندین پیاوی لەو پێناوە داناوە، لەکاتێکدا بەم دوای‌یە بەدرخان دەسەڵاتی بەسەر سەعرەت و مەرزانیشەوە نەمابوو. بەدرخان قەناعەتی وابوو کامیل ئەفەندی پیاوێکی ژیرو کارزانە، لەپشت هەموو ئەو زیانەوەیە پێی کەوتووە. بەدرخان دەیوت (پێشتر کامیل ئەفەندی بەڵێنی پێداوم یارمەتیم بدات بۆئەوەی ببمە پیاوێکی گەورەی دەوڵەتی عوسمانی بەڵام لەجیاتی وەفاداری بەبەڵێنی خۆی بەهەموو رێگەیەك هەوڵی دەدا لەنفوزم کەم بکاتەوە). هەروەها دەیوت (ئێستا بەتەنها بوومەتە میری بۆتان) بەڵام قانیع و کامەرانە بەوەی هەیەتی ئەگەر حکومەت بەهای ئەو خزمەتگوزاریانە بزانێت کە پێشکەشی کردووە، پێش ئەوەی ئیدارەی کوردستان ملکەچی حوکمی ئەو بێت ئیدارەیەکی زۆر خراپ بوو بەڵام ئێستا پیاو دەتوانێت بەوپەڕی ئەمان و متمانەوە سەفەر بکات کیسەیەکی زێڕ بەدەستەوە بێت جگە لەخوا لەکەس نەترسێت، هەروەها من پابەندم بەئارەزووی پاشایانی بەغداو ئەرزڕۆم و دیاربەکر ئەگەر لەیەك نزیك ببمەوەو دوژمنکاری ئەوانی‌ترم بۆپەیدا دەبێت. دەڵێن من هەڵگەڕاوەم چونکە قبوڵم نەکرد بچمە سەردانی موحەمەد پاشای والی موسڵی پیاوخراپ. کەرۆڵی زۆر گەورەی هەبووە لەناشیرن کردنی کەسایەتی من لای سوڵتان. ئەگەر بەراوردی بارودۆخی خەڵکی میرنشینەکەی من بکەیت لەگەڵ دانیشتوانی ژێر دەسەڵاتی پاشایەکانی تر لەموسڵ و دیاربەکر دەزانی کێ خزمەتکاری هەقیقی سوڵتانە من یان ئەو پاشایانە.

ئەوەم بۆمیر سەلماند کە بەکردەوە ئارامی و ئاسایش لەئەمارەتەکەی دا هەیە ئەمەش شەرەفێکی گەورەیە، بارودۆخی ئەمارەتەکەی بەبەراورد لەگەڵ

ئەوانیتر زۆر باشەو هەموو گەشتیارێك هەست بەئەمە دەكات.

سەرەڕای ئەوە بەدرخان دەیوت (پێشتر وەكو باجی ئەمارەتی بۆتان تەنها ٤٠٠ بیاسترەم دەدا بەوالی دیاربەكر، دوای لكاندنی بەولایەتی موسڵ موحەمەد پاشا یەكەم جار زیادی كرد بۆ ٥٠٠ بیاسترەو ئینجا بۆ١٠٠٠ بیاسترەو دوایی بوو بە١٤٠٠ بیاستره، ئێستا ١٠٠٠ بیاستره وەكو باج دەدەم بەوالی موسڵ، من ئێستا باجی ٠/٠٧ لەسەر بەهای داهاتی ساڵانە فەرز دەكەم بەزۆری بەشی ئەو باجە ناكات كە دەیدەم بەپاشای موسڵ. ئەمساڵ داهاتی كشتوكاڵ بەهۆی بەڵای كوللە زیانی زۆری لێكەوتووە، ئەمەش رێژەی بەهای ئەو باجەی لەبۆتان وەدەگیرێ دابەزیوە بۆسیێیەك. لەگەڵ ئەوەدا تاوانیان بۆهەڵبەستم كە خەڵكی لەژێردەسەڵاتی ناوچەی پاشایانی ترەوە هاندەدەم بێن لەبۆتان نیشتەجێبن. ئایا ئەمە تاوانێكی خراپە؟ شەریف پاشا فەرمانی پێدام بەگەڕاندنەوەی ٢٠٠خێزانی خەڵكی زاخۆ، ئەوانەی بەر لە٣ یان ٤ مانگ لەزوڵمی موحەمەد پاشا هەڵاتبوون و لای من نیشتەجێبوون. داوایان لێكرا بگەڕێنەوە موسڵ، بەڵام لەگەڵ گەڕانەوەیان سەر لەنوێ بڕیاریان دا بگەڕێنەوە چونكە شەریف پاشا داوای كردبوون باجی ئەو چوار ساڵە بدەن كە لەبۆتان لای من بوون. ئایا ئەوە مەسەلەیەكی نامۆ یان چاوەڕوانكراو نەبوو تاوانی من لەهەموو ئەم كارانەدا چییە؟ دڵنیام حكومەت هەموو ئەم راستیانە نازانێت بەڵام رۆژێك دێ دەیزانن و ئەوكات هەڵوێستیان لەبەرانبەر مندا دەبێت......

وادەردەكەوێ بەدرخان دڵنیا نەبووە لەهەڵوێستی حكومەتی عوسمانی لەبەرانبەر خۆی، قەناعەتم وایە ئەگەر حكومەتی عوسمانی هەندێك فشاری بخستایە سەر میربەدرخان ناچار دەبوو قەرەبووی بۆسریان بكردایەوە، بۆنموونە ناچار بوو ئەو چوار دیلە ئازاد بكات كەبەبیانووی مسوڵمان بوون

هێشتبوویەوە. قبوڵ کردنی لەدەستدانی دەسەڵاتی میربەدرخان لەمیدیادو هیزان لەگەڵ ئەوەدا خەڵکی ئەو دوو ناوچەیە پشتگیریان دەکردو ئامادەی بەرگری بوون لەبەرانبەر هێزەکانی دەسەڵاتی مەرکەزی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی میربەدرخان سوورنەبووە بەهێز رووبەڕووی دەسەڵاتی مەرکەزی ببێتەوە. هیچ گومانی تیا نیە بەدرخان پیاوێکی خاوەن خۆزگە بووەو مەبەستی بووە نفوزی ئێستای خۆی بەسەر سەرۆکە کوردەکاندا بپارێزێ، بەڵام هەموو تکای ئەو ئێستا ئەوەیە بەرپرسان لەدەسەڵاتی مەرکەزی هەندی حیسابی بۆبکەن.

ئەوەی پەیوەستە بەکاروباری ئەورووپی بەدرخان بەتەواوی لێی بێئاگایە، بۆنمونە پرسیاری لێکردم دەوڵەتی بەریتانیاو فەڕەنسا کامیان بەهێزترە؟ کامیان پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی بەهێزترە؟ بەدرخان سەرکردایەتی سوپای کوردی کردبوو لەشەڕی نزیب دژی ئیبراهیم پاشا (کوڕی موحەمەد عەلی پاشا-نووسەر) کە بەئاکامی خراپ بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا شکایەوە، بەئەمە زۆر کەوتبووە ژێرکارگەری موحەمەد عەلی پاشا. چاك ئاگادار بوو هێزەکانی بەریتانی بوو هێزەکانی مەحەمەد عەلی پاشایان لەسووریا شکاند. بۆیە میربەدرخان بەچاوی رێزو سەرسوڕمانەوە دەیڕوانیە بەریتانیا. پێی وابوو دەستێوەردانی حکومەتی بەریتانی لەبەرژەوەندی ئەرمەن خەسارەتێکی سیاسی گەورەیە.

پێم وایە ناتوانین لەئایندەدا متمانە بە بەڵێنی بەدرخان بکەین سریانەکان تووشی زیان نەکات، بەڵام دەبێت سریان لای خۆیەوە وریاو لێزان بێت و کاری ئیستیفزازی وانەکەن هەستی ئاینی لای مسوڵمانانی کورد بورووژێنین.

ماوەی رۆژێك من لەسەربازگەكەی بەدرخان بووم، تیٚبینیم كرد چەندین گرووپی چەكدار گەیشتنە سەربازگەكە. پرسیارم لەلایەنگرانی بەدرخان كرد پیٚم بلێن ئەوانە چین وتیان ئەو هێزانە لەئەسلا هی سەربازگەن بەلام لەمۆلەت دەگەرێنەوە. دواتر بۆم دەركەوت لەو كاتەی من لەویٚ بووم میر ئەو گەیشتنانەی بۆسەربازگەكەی رێكخستووە هەتا من لە بەهێزی ئەو ئاگادار بم. ئەو دیاردانە بەدلنیایی رامانێكی لەلا دروست كردم بەلام بەوئەندازەیە نەبووە ئەوەندەی دیاردەی روخسارو سەرسووڕمانم لە لادروست بكات. لەلایەكی سەربازگەكەوە ۳۰۰چەكدار بەبەرگی وەكو یەك وەستا بوون، بەرگەكەشی بریتی بوو لەپەردە قوماشێكی داكەوتووو شەرواڵێكی سوورو كراسێكی بەئەنگوچكەوە. لەلایەكیترەوە دەتوانی هێزێكی سەربازی بەپیز یەكسان لەژمارەدا ببینیت بەلام ئەمانە شەروالی شینی موشەكەلیان لەبەردابوو. هەموویان دەست لەسەر خەنجەر وەستاون و بەدەسكی خەنجەرەكەیەوە تەسبیحی تایبەتی تێئالاوی بۆ وێردەكانی پێووە بوو، چونكە زۆربەی سوپایەكەی بەدرخان لەو ئیسلامیە دەمارگیریانەی سەر بەڕێڕەوی شافعین. بەبۆچوونی شافیعی شوێنكەوتووی مەزهەبە ئیسلامیەكانی‌تر بڕوادارترنین و لەكافرو موشریكەكانن. ئەگەر ویستی شوێن مەزهەبەكانی‌تر بكەویٚ دەبێت قبولی فەلاقەی توند بكات، ئەمەش بۆپاككردنەوەی لەتاوان. لەرۆژی ۱۸٤٤/٦/۳۰ز بەبەدرخان پاشا گەیشتم و بەبەجدی بەلێنی پیٚدام دەرفەت بەهیچ كەس نادات لەبۆتان و هەكاری و ئەو كەنیسانەی كەوتوونەتە جەزیرە ئازاری گاورەكان بدات. هەروەها بەلێنیدا لەهەر شوێنێك دیلەكانی دیتەوە بۆم بنێریٚ. داوای لیٚكردم پێش ئەوەی دەولەتی عوسمانی بەجیٚ بهێڵم جارێكی‌تر سەردانی بكەمەوە، دوای ئەوەی من داوام لیٚكرد مۆلەتم بدات سەربازگەكەی بەجێبهێلم، پیش ئەوەی

لەسەربازگەکە دەرچم گەڕامەوە ڕەشماڵە تایبەتیەکەم، هەر کەگەیشتم پیاوێك لێم هاتە ژوورەوەو ١٠هەزار بیاسترەی خستە نزیك پێمو رای گەیاند ئەوە دیاری میرە بۆمن. کیسە پڕ لەپارەکەم دایەوە پیاوەکە وای زانی لەبەر کەمی من وەری ناگرم فەرمانیدا زیادیکرد بۆ١٥ هەزار بیاسترە(*)، دوایی بەدیوان ئەفەندیم ووت تکا دەکەم بۆبەدرخانی روون بکەوە سروشتی کارەکەم بەتوندی قبوڵ کردنی دیاری لەو جۆرەم لێ قەدەغە دەکات، بەهیوام بەئیهانەی تێنەگات. دیوانە ئەفەندی چوو قسە لەگەڵ میربەدرخان بکات، هات و گەڕایەوەوعوزری هێنایەوەو پارەکەی خستەوە بەدەمم وتی میر قبوڵی ناکات و ئەمە نەریتی ناوچەکەیە، چونکە هەموو ئەو بەرپرسانەی ئەستەنبوڵ سەردانی ئێرە دەکەن ئەم جۆرە دیاریانەی بەمنی داوە ئەوانیش قبوڵیان کردووە. لەکاتەی هێشتا لەسەربازگەکە بووم میربەدرخان ئەسپێکی کوردی پێشکەش کردم قبوڵم کرد بەو هیوایەی بیفرۆشم و تایبەتی بکەم بەخەرجی هەندێ دیاری کە کڕیبووم بۆبەدرخان و خانەوادەکەی چونکە ئەمە لەنەریتی ناوچەکەیە.

بەهەمان ڕێگا گەڕامەوە جەزیرە لەوێ لەسەرچاوە سریانیەکانەوە زانیم هەتا ئێستاش ٢٩پیاوو ژنی سریانی ئەسیرن. داوام لەبەرپرسی حکومەتی عوسمانی کرد ئەو ئەسیرانەم بۆبێنێت، دوای ماوەیەك هێنای. ئەسیرەکانم لە٢٥ماڵی جیاجیا داننان. یەکیان لەماڵی ئیسماعیل پاشای ئامێدی، دوو لەماڵی پەرپرسە عوسمانیەکە، دوو لەماڵی قازیو ئەوانیترمان بەسەر ماڵی مەلایەکاندا دابەش کرد، هەریەك بۆماڵی مەلایەك، ئەوها دیلەکان لەماڵی ٢٥ لەپیاو ماقوڵانی شار دانران. دوو لەدیلەکان منداڵ بوون وتیان بوونەتە مسوڵمان، بڕیارم دا شایەدیەکەیان لێوەربگرم و وازیان لێبهێنم، بەبەرپرسە عوسمانیەکەم وت بایەخی پێبدە دەگونجێت لەئایندە داوای گەڕانەوە بکەن

٢٧ ئەسیری ژن و کوڕو کچ هەبوون، وتیان ئەوانە نەسرانین و تەسلیم بەمن کرانەوە بەجیاو بەبەدوو تەوافەی لەپێست دروستکراو بەکەڵەك و سەوڵان بەئاوی دیجلەدا جەزیرەمان بەجێهێشت و بەرەو موسڵ گەڕاینەوەو لەچواری تەمووز گەیشتینەوە شار.

ا ر . دبلیو . ستیڤن

یاریدەری قونسولیە لەموسڵ

(*) نامەویٚ بەگشتی سەرنج لەسەر بەڵگەنامەکە دەربڕم ئەمە ئەگەر پیوست بوایە بەشایستەی دکتۆرم دەزانی بەلام لێرەدا تیٚبینی هێندە زەق هەیە، میربەدرخان وەکو بەدیاری دەخا نیگەرانە بە١٠٠٠بیاسترەی باجی سالانەی ئەمارەتەکەی بەولایەتی موسڵ کەچی ئەودیاریەی بۆئەم میوانەی داناوە ١٥هەزار بیاسترەیە کەدەکاتە باجی پانزدە ساڵ، ئەمە ئەگەر لەتەرجەمەی یەکەمی نوسخەی بەڵگەنامەو وەرگێڕانی بۆعەرەبی هەڵەی چاپ نەبێت زۆر جیٚی سەرسوڕمانە.

٩ی جومادی دووەمی ساڵی ٦٣ مایسی ١٨٤٧

عەریزەیەك لەزانایان و پیاوچاکان و پێشەواو وتارخوێنان و پیاوماقوڵ و ناوداران و خەڵك و رەعیەکانی شاری وانی پاسەوان

روون و ئاشکرایە ئەو رق و زوڵم و بەرەنگاریەی تووشی ئێمەی بەندەی هەژار هاتووە هیچی بەدەستەوە نەهێشتووین و ناتوانین ئەوەی داوامان لێکراوە بیدەین و پێشکەشی بکەین بەخەزێنەی خاوەن پایە. لەتوانامان دا نیە ئەوەی بەڵێنمان دابوو جیٚبەجێی بکەین. ئەوەی ناتوانین ئەمەکدار بین بەبەڵێنمانەوە هەژاری و نەبوونیە نەك پەنا بەخوا یاخیبوون. هەموو ئەو

فەرمانبەرانەی دێن دەمانترسێنن، هەڕەشەمان لێدەکەن کەبەشمشێری سوڵتان لەگەردنی خۆمانو خانەوادەو منداڵەکانمان دەدەن. هەرچیمان هەبووە تالانیان کرد، ترسو تۆقاندنیان لەناو ئەو هەژانە بلاوکردۆتەوە، بۆباشترکردنی داهاتی ولایەتی ناوبراو قائمقامی موش عەتوفە شەریف بەگیان نارد لەمیرەکانی شارەو لەخێزانێکی شەریفە، دەفتەردار ئەفەندی دەوڵەت رای‌سپاردو وەکالەتی تەواوی دایە هەڵسوکەوتی باشمان لەگەڵ بکاتو بەزەیی پێماندا بێتەوە، ئێمە متمانەمان بەمیری ناوبراو هەیەو پیاوێکی بەئەزموونەو لەباری ناوچەکە ئاگادارە. خەڵك پیان ووت بەهەژاری ناتوانین ئەو ئەندازەی لەسەرمان دانراوە پێنج هەزار قورشە بیدەین، پەیمانیان داینێ سێ هەزار قورش بەشێوەی قیست بدەین ئەمەش لەتشرینی دووەمی ساڵی شەستو دوو لە(وان)و ئەو قەزاو ناحیانەی مەحمود خان بەڕێوەی دەبات بەبێ خواستەکانی(التمتعات)ی میری. هەتا بەدوو قیست ئەو پارەیە بدەین ئەم عەریزەیەمان بۆموقامتان بەرز کردەوە، تکایە داواکاری‌ترمان لێمەکەن.

بەئیمزای ژمارەیەکی زۆر لەخەڵكو ناوداران‌و زانایانێ

1266 Irae Mesail- 1 Muhimme 28

بۆ مەقامی سەدارەتی سامی

(٢٨ مایسی ١٨٤٧)

روونو دیارە لەحالەتی گرتنەبەری رێوشوێنی دروستو بڕیار لەسەردراو بۆلابردنی کێشەی ناوبانگ خراپ ، بەهێزی حەزرەتی مەولامان سوڵتان میری ناوبراو ناتوانێت بەرگری بکات. بەناچاری پەنا دێنێتە بەر دەوڵەتی عیللیە یان هەڵدێ بۆئێران. بەڵام ئەو زیاتر لای فڕوفێڵان دەگرێ.

بەپشتیوانی خوا ڕێگەیەکی‌تر هەیە بۆلابردنی ئەو کێشەیە. پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات لای موقامی بالآتان دیارە تایفەی کوردان لەچەند هۆزێکی جیاجیا پێك هاتوون. هەموو ئەو ناوچەی ئێستای میر بەتەواوی‌و سێ بەشی ناوچەکانی عێراق ئەگەر داواکاریێت دابەشکردنی خەڵکەکەی لەتایفەی ناوبراون. لەو سەرنجە بەدوور نیە پەیوەندی رەچەڵەك لەنێوان ئەمانەدا هەیە‌و کردوونیە یەك لاشە، ئەگەر بەشێکی تووش بێت هەموو بەشەکانی‌تر دەگرێتەوە، لەرووی مادی‌و مەعنەوی یەکدەگرن. هەتا رەسوڵ پاشای رەواندزی‌و ئەحمەد پاشای سلێمانی لێرە هێندە ناکۆك بوون بەئاوی گەرم ماوەیەك بمان کولآندایە مەحاڵ بوو یەکبگرن. لەکاتێکدا ساڵی پار ناردمانن بۆسلێمانی کەچی بەیەکدا هەڵنەشاخان‌و بوونە دۆست‌و ڕێکەوتن. بەقسەی ئەوانەی لێیانەوە نزیکن ئەو دوو پیاوە لەیەکەوە نزیکن‌و بەنهێنی یەکتر ئاگادارن. لەسەر ئەو ئاراستەی بۆم روونکردیەوە دەورووبەری بەغدا جمەی دێت لەکورد بەتایبەتی ئەیالەتەکانی سلیمانی‌و کۆیەو هەریرو رەواندز بەم نزیکانە چوونەتە چوارچێوەی گوێڕایەڵی. رەسوڵ پاشای لێپرسراوی چالاکی پێشووی رەواندز بەهەموو لایەکدا دەسووڕێتەوە، سەعدونی شێخی عوبەیدو شێخی جەربە لەبازنەی گوێڕایەڵی ئەون، لەدەورووبەری بەغداو موسڵ تەنگ بەیەکتر هەڵدەچنن‌و لەگەڵ میری ناوبراو لێك تێگەیشتن‌و یەکگرتنیان هەیە. ئەگەر بەهاندانی ئەمیری ناوبراو هەڵبگەڕێنەوە ئەوە هێزی پێویستمان لەسەرباز لەبەردەستدایە هەم بۆسەرکۆنەو تێکشکاندن هەم دەتوانین ڕێگەیان لێبگرین‌و نەیەڵین پشتیوانی میری ناوبراویان پێ‌بگات لەلایەکی‌ترەوە باری ئەو چالاکیە سەربازیانە سووك دەکەن کەلەشکری ئەنادۆڵی هەمایوونی ئەنجامی دەدەن. دەتوانین بەشێك لەو هێزە نیزامیانەی لای من بەرەو شوێنی قەیرانەکەیان

بـەرین، پێویسـتە بەشـێك لـەهێزەكان بـەرەو هـەولێر بـەرین كـە قەزایـەكی بەغدایەو دوازدە سەعات لەبەغداوە دوورە. بەپشتیوانی خوا میر هەرچەند هێز كۆبكاتەوە ناتوانێت بەرانبەر بە لەشكری سوڵتان بەرگری بكات. هێـزی سەركەوتوو بۆحەزرەتی مەولانا سوڵتانە. ئەزموونی رۆژانـی رەشید پاشای خـوا لێخـۆش بـوو بەتایبـەت بۆئـەو بـەدڵنیایی سـەلماندی بەرانبـەر دوو تابوری سەرباز لەزەوی دەشتایی دەدۆڕێن. هـەركاتێك هێزەكان لێیان نزیـك ببنـەوە بـەرەو چـیاكان پاشەكشـە دەكـەن . هەرچـەندە بتوانێـت كـوردان لـەدەوری خـۆی كۆبكاتـەوە هەنـدێكیان ناچـار دەبـن لەچـیاكانەوە بۆكوكردنـەوەی بەهەمـەكانیان بێنـە خـواریێو هەنـدێكیتر بـۆبینینی كـوڕو منداڵەكانیان. واباشترە بەیەك جار سوپا بەرەو گونـدو شارۆچكەو رێڕەوو پردەكان رەوانە بكرێنو ئەوانە لەچیاكان گەمارۆ بدرێن، بەسروشتی خۆیـان نـاتوانن بۆماوەیـەكی زۆر لـەوێ بمێننـەوە هەنـدێكیان دێنـە خـواریێو داوای ئەمان دەكەنو هەندێكیتر بڵاوەی لێدەكەنو میری ناوبراویش دەمێنێ یـان داوای ئەمان دەكات یان هەڵدێ ئەوكات بەرژەونـدیمان بەئاسانی دێتـە دی. دوایـی دەتـوانین بەرپرسـی حكـومی لـەو ناوچـانەی ژێردەسـەڵاتی مـیری ناوبراو دابنێین بەمەرجێ هێزی تەواو لەسوپا لەشوێنە پێویستەكان دابنێین بۆدابینكردنی كاری پۆستەو پارێزگاری لەنەوەكان

٣ی جەمادی دووەمی ساڵی ٦٣

والی بەغدا

# جـــولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نـــەهـــــری
## لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکارە کاریگەرە ئیقلیمیو دەولیەکان

- بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری

- ئامانجو رووداوەکانی را پەڕین

- هۆکارەکانی نوشستی جولانەوەی بەدرخان

بوختەی توێژینەوە

- پاشکۆی بەڵگەنامەکان

# بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری

بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵای کوڕی شێخ تاهیری نەهری نەقشبەندی (١٨٧٨-١٨٨٣) بەخاڵێکی ڕۆشنی مێژووی مسوڵنانانی کوردو بزاڤی جیهادی دەژمێردرێت لەجیهانی ئیسلامی. ئەو بزاڤە هەلقەیەك بوو لەو هەلقە جیهادیەی تەریقەتی سۆفیگەری شۆڕشگێڕ لەگەرمەی دواشاڵاوی ئەوروپیەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی ئەنجامیاندا، ئەمە درێژەدەری بزاڤی شێخ عەبدولقادری جەزائیریو بزاڤەکانی قەوقازیایە بەسەرۆکایەتی شێخ شامیلو شێخ عوسمان دان فیدۆیە لەنێجیریا(*).

بزووتنەوەکەی شێخ عوبێدوڵڵا لەگەڵ ئەوەشدا وەکو هەموو جولانەوەکانیتر پشتگیریەکی گەورەی لەناو مسوڵمانانی کورد هەبووە بەڵام نەیتوانی ئامانجەکانی خۆی بەدەست بهێنێت،

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەرئامانجو هۆکارە ئیقلیمیو دەولیە کاریگەرەکانی سەر ئەو جولانەوەیە.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم هەموو ئەو میرنشینانەی بەدرێژایی دەسەڵاتی عوسمانیو ئێرانی بەردەوام بوون لەناوبران، کوردستانی باشوور بەسەر میرنشینەکانی بابان، سۆران، بادینان دابەش کرابوو، میرنشینی ئەردەلان لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتو بۆتانو بەتلیسو چەند میرنشینێکی بچوکی تر لەکوردستانی باکور.

لەسەرەتای سەدەی هەژدە دەوڵەتی عوسمانی بەدەستی هێزە ئەورووپیەکان تووشی چەندان تێکشکان ببوو کە لەوماەیە سەرقاڵ بوو

بەچاکسازی ئیداری و فیکری و سەربازی. ئیبن خەلدونی بیریارو زانای کۆمەڵناس دەڵێ : ئاساییە دۆڕاو لاسای سەرکەوتوو بکاتەوە. بۆیە بانگەوازکارانی چاکسازی لەدەوڵەتی عوسمانی لەسیستەمی سەربازی و ئیداری مەرکەزیەتی تۆکمە کەوتنە لاسایی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی ئەورووپا، راوێژکارەکانی سوڵتان سەلیمی دووەم و دوایی سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩) دوای ئەوان پیاوانی تەنزیمات لەدەوڵەتی عوسمانی واز لەسیستەمی ئیداری عوسمانی (ئەیالات)ی لامەرکەزی دەهێنن و دەوڵەتی عوسمانی دامەزراو لەسەر بنەمای فرەڕەگەزی دەگۆڕن بۆدەوڵەتی نەتەوەیی لەسەر شێوازی رۆژاوا، لێرەوە بۆیەکەم جار (نیشتیمانی عوسمانی) پەیدا بوو دوایی لەسەر دەستی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی (١٩٠٨-١٩١٨) ئەم بیرۆکەیە گۆڕا بۆناسیونالستی تۆرانی(١). لەناوبردنی ئەم میرنشینە کوردیانە بەشێك بوو لەو هەلقە بەرفراوانەی کەوتنی میرنشینەکانی ئەلبانیا و ئەنادوڵ کە سەدان ساڵ بوو بەناوی(Der eBey) حوکمی زاتیان هەبووە، هەروەها دەوڵەتی مەمالیك لەئێراق و ئەمارەتی جەلیلی لەموسڵ و ئەمارەتی مونتەفیك لەباشووری ئێراق و مەمالیك لەمیسرو سوریا و سۆرانی و بابانی و بادینانی لەکوردستانی ئێراق. موحەمەد رەشید پاشای چەرکەسی سەدری ئەعزەمی دەوڵەتی عوسمانی و والی کوردستان موحەمەد بێرقدار ئەرکی لەناوبردنی میرنشینە کوردییەکانیان گرتە ئەستۆ و لەو پێناوەش قونسوڵیەکانی بەریتانی و رووسی لەبەغداو ئەستەنبوڵ و شارە کوردیەکان پشتگیری بەهێزی دەوڵەتی عوسمانی بوون(٢).

لەدوای نەمانی سەرکردایەتی تەقلیدی کورد کەخۆی لەمیرە کوردیەکانو خانەوادە دەرەبەگان دەدیتەوە، لەسەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم لەبەرانبەر لادانی ئیتحادیەکان لەسیستەمی دەسەڵاتی عوسمانی شێخەکانی ریبازی سۆفیگەری بەتایبەتی نەقشبەندیو قادری بۆسەرکردایەتی کورد لەهەرێمە کوردیەکان بەبەرفراوانی کوردستان گەشەیان کرد. سەرهەڵدانی جولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لەناوچەی شەمدینان (پارێزگای هەکاری ئەمڕۆ) بەشێکە لەو رێڕەوە مێژوویەی کەدواتر چەندین شێخیتری رێبازی سۆفیگەری لەکوردستان پەیوەندیان پێوەکرد بۆتێکۆشان، بەتایبەتی جولانەوەی شێخ عەبدوسەلامی بارزانو(١٨١٤)، جولانەوەی شێخ سەعیدی بالۆ لەکوردستانی تورکیا بۆگەڕانەوەی خەلافەت (١٩٢٥)، جولانەوەی شێخ مەحمودی حەفید لەکوردستانی عێراق لەدژی ئینگلیز (١٩١٨-١٩٣٢)، بەدواداچوونی بەرنامەو ئامانجی هەریەك لەم جولانەوانە بەڕوونی بەدیار دەکەوێ کە پەیوەندیەکی ئۆرگانیان هەبووە لەبەرگری لەشەریعەتی ئیسلامی وەکو بەرنامەی حوکمو بەرگری لەمەزلومیەتی مسوڵمانی کورد(٣).

چەندین خاسیەتی سەرکردەیی مسوڵمان بەکەسایەتی شێخ عوبێدوڵڵاوە دیار بووە. لەخوا ترسو زانایەکی کاراو گران بووە، زانایان لەهەموو لایەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو ئێرانی روویان لەتەکیەکەی دەکرد هەتا رای ئەو لەچەندین بابەتی زانستیو کاروباری ئەو کاتەی مسوڵمانانی کورد وەربگرن، شێخ شارەزاییەکی باشی لەزانستە ئیسلامیەکانو بەتایبەت لەزانستی فەرموودە دا هەبووە(٤).

شارەزابووە لەئەدەبو فۆلکلۆرو مێژووی کورد، ئەمە سەرەڕای شارەزایی لەزوهدو وەرعو رەوشت بەرزی، بەهۆی ئەمانەوە خۆشەویستی

هـەزاران لەمریـدەکانی بـەلای خۆیـدا راکێشـابوو. ڕێـزی لەبەرپرسـانی عوسمـانی دەگـرت، لــەپیش هەموویانــەوە ســوڵتان عەبدولحەمیــد، رۆژهەڵاتناسـی ئینگلیـزی ج. ولسـۆن لەوەسـفی شـێخ عوبێـدوڵڵادا دەڵـێ (لـەدوای سـوڵتان و شـەریفی مەکـە لـەجیهانی ئیسـلامی لەهـەموو کـەس پیرۆزترو خاوەن نفوزترە).

خۆبەکـەمگری و زوهـد لـەخواردن و جل وبـەرگ و هەسـتی خێـر ویسـتی بەتایبـەتی بۆهـەژاران لـەجوتیاران و موحتاجـەکان، ئەوانـەی هاتووچـۆیان دەکـرد سـەرنجی هـەمووانی راکێشـابوو. شـێخ سووربوو لەسـەر گـوێگرتن لەخـەڵك و لـە پێویسـتی هـەژاران و گەشـتیاران و جوتیـاران . سـەرەڕای ئـەوە خانەیـەکی هــەتیوانی لەشــار دانــابوو، خــۆی سەرپەرشــتی دەکــرد و پێویستیەکانی دابین دەکرد.

شـێخ پیـاوێکی دادگـەرو بـەرووی زوڵـم دا توونـد بـووە. چـەند کەسـی لەنــەوەی هۆزەکــەی لەسـێدارە دا کاتێــك گوێبیســتی ئــەوە بــوو یــەکێك لەگونـدەکانی دراوسـێیان بەدەسـتی ئەوانـەوە تووشـی تـالانی بـووە لەگـەڵ ئەوەدا نزیکی خۆی تیابوو.

شــێخ لەبەرانبــەر بیرکردنــــەوەیتردا کــــراوە بــــووە، ئاگــــاداری دواگۆڕانکاریەکانی ئـەو کاتـەی جیهـانی ئیسـلامی بووە، لەنزیکەوە ئاگادار بـووە بـەململانێی نێـوان عوسمـانی و دەوڵـەتـە ئەورووپیـەکان. لێبـووردەیی و کراوەیـی لەگـەڵ گۆڕانکاریـەکان هـەبووە و جێگـای ڕێـزو تەقـدیری گـاورە ئەرمەن و نەستووریەکانی کوردستان بووە ، ئەوان بەبەردەوامی سەردانیان دەکرد(٥).

## ئامانج و رووداوەکانی راپەڕین

شێخ لەروانگەی پابەندی بەدینداریی‌یەوە هێرشەکانی ئەورووپی بۆسەر دەوڵەتی عوسمانی زۆر ئازاری دەدا، بۆیە لەگەڵ شوێنکەوتوانی بەرەو بانگەوازی سوڵتانەوە چوون بۆجیهاد دژی رووس، لەشەڕەکانی ١٨٧٧-١٨٧٨ز، لەو شەڕانەی هێزەکانی عوسمانی زەبت و ورەیان نەمابوو ئەم فەرماندەی هێزێکی گەورەی خەباتکارانی کورد بووە. لێرەوە قەناعەتی بەرووخانی دەوڵەتی عوسمانی رۆژ بەرۆژ زیادی دەکرد، چونکە لەپیادەکردنی شەریعەتی ئیسلام دوورکەوتۆتەوە و گەندەڵی ئیداری پەڕیوەتە ناو دەزگا سەربازی و سیاسیەکانی و بەرپرسان لەئاستی بەرەنگاری هێزەکانی ئەورووپی دانین.

دوا ئەوەی شەڕی عوسمانی - رووسی کوردستانی وێران کرد، چونکە ببووە شانۆی چالاکیە سەربازیەکان، بەهۆی زیادبوونی چەند بارەی باج و دەست بەسەراگرتنی سامانی جوتیاران و خۆسەپاندن بەسەریاندا، باری بژێوی خەڵکی ناوچەکە وێران ببوو، دیاردەی بەرتیل بڵاوببۆوە، شێخ چەندین جار سکاڵای لەسەر ئەو بارودۆخە بۆسوڵتان نووسی هەتا رێوشوێنی گونجاو بگرێتەبەر بێ‌ئاکام بوو.

دکتۆر جوەیدە قەناعەتی وایە دەسەڵاتی هێزە ئەورووپیەکان زۆر ئازاری شێخ عوبێدوڵلایان داوە و پێی نیگەران بووە.، لەساڵی ١٨٧٨ز رێکەوتنامەیان بەسەر دەوڵەتی عوسمانی‌دا سەپاند و پابەندیان کرد بەماف دەستێوەردان لەکوردستانی تورکیا درا بەبەریتانیا بەبیانووی چاکسازی و پارێزگاری لەئەرمەن و نەستوورەیەکان، رێکەوتنامەی ناوبراو لەسایەی

بەریتانیا جۆرێك لەئیدارەی زاتی دابوو بەئەرمەن، شێخ ئاگادار بوو بەرووداوەکانی ئەورووپا و دەیزانی ئەم رێکەوتنامەیە پەردەپۆشی دەولیە بۆبنیاتنانی قەوارەی ئەرمەنی لەناوچەکانی کوردستان، ئەمەش ئاکامی زیاتر لەسەدەیەکی چاوتێبرینی بەریتانیا و رووسیایە، شێخ بەهەرچی لەتوانای دایە خۆی ئامادەکرد بەرهەڵستی بکات و ئەمەشی لەسوڵتان نەدەشاردەوە، لەکاتی سەردانی نوێنەری سوڵتان بۆتەکیەکەی شێخ پێی گوت (ئەوە چیە بیستوومە ئێوە رازین بەهێنانی ئەرمەن بۆسەرمسوڵمانی کورد، نەستووریەکان بەم زوانە ئالای بەریتانی هەڵدەدەن، ئێمە ئەمە قبوڵناکەین و بەهەرچی لەتوانامان دابێت بەرهەڵستی دەکەین، ئەگەر بەپێوستمان زانی ژن و منداڵمان چەکدار دەکەین)(٦).

شێخ عوبێدوڵڵا ئاگار بوو بەرووداوەکانی کوردستان و ئەندازەی نارەزایی و بیزاری کوردانی دەزانی بەرانبەر عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بۆیە بەهێزی سەربازی دەست پێشخەری کرد و چاوی لەتوانای هەموو خەڵکی کوردستان بوو، نوێنەری نارده لای پیاوە چالاك و زانایانی کوردستان لەشارەکانی رەواندز، موسڵ، هەولێر، وان، دیاربەکر، بەدلیس، ورمێ، سنەو سابلاخ (مهاباد).

نوێنەری نارده لای سەرۆك هۆزە گەورەکانی کورد و داوای لێکردن بۆتێکۆشان و یەکخستنی کوردستان ئامادەبن. مسوڵمانانی کورد وەڵامی جیهادەکەیان دایەوە و دووسەد کەسایەتی کوردی لەهەموو گۆشەیەکی کوردستان کۆبۆوە و هاوپەیمانیەتیەکیان پێك هێنا بەناوی (پەیوەندی سەرۆکە کوردەکان).

لەتەمووزی ١٨٨١ز شێخ عوبێدوڵڵا وتاری دەداو دەیوت (عوسمانیەکان لە٥٥٠سال بەر لە ئێستا بەرێگەیەکی ناشەرعی هاتوونەتە سەر حوکم بۆ

٤٠٠ساڵ دەچێت لەبەرنامەی ئیسلام لایان داوە، لەو کاتەی بۆتە ئیمپراتۆریەتێکی لاوازی دیلی هێزە ئەوروپیەکانو بەرەو رووخان دەچێت، هیچ گومانی تیا نیە کەوتنی زۆر نزیکە. بەڕێزان کاتی ئەوە هاتووە گوێ لەئامۆژگاری باپیرانمان رابگرین و لەئێستاوە ملکەچی زوڵمی تورکە بێئیلتیزامەکان بەئیسلامەتی نەبین. ئێوە بانگکراون بۆبەرگری لەبەرژەوەندی کوردو بیروباوەڕی ئیسلامیو نیشتیمانەکەتان کە باپیرانتان بەبەردەوامی بەرگری لێکردووە.

لەراستیدا دەوڵەتی عوسمانی تاکە دەوڵەت نیە زوڵمان لێبکات براکانمان لەئێران لەژێر باری ئابووریو سیاسی دەسەلاتێك دەژین کەهیچ مافێ بەئیسلامەوە نیە. وەکو دەزانن لەم رۆژانە حکومەتی ئێرانی سەرقاڵی شەڕی هۆزە تورکمانەکانەو ئەو هێزەی هەیەتی بۆشەڕی ئەوانی ناردووە. ئەگەر هێرش بۆسەر ئێمە بهێنێت ناتوانن هەزار جەنگاوەر دژمان کۆبکەنەوە، نیوەی ئەوانەش کوردنو لەکاتی شەڕ پەیوەندیمان پێوە دەکەن، سەردەکەوینو بەمەش پێگەیەکی گرنگو دەوڵەمەندمان دەبێت لەوێوە بۆشەڕی دوژمنی گەورەمان کە دەوڵەتی عوسمانیە(٧).

سوڵتان عەبدلحەمید سوپاسی عەزیمەتی شێخی کردو موفتی (وان)ی نارد هەتا بەشێخ عوبێدوڵڵا بڵێ (لەشەریعەتدا نابێت لەگوێڕایەڵی سوڵتان دەربچیت)، شێخ وەلامی دایەوە : (دەوڵەت لەجێبەجێکردنی شەریعەت دوور کەوتۆتەوەو زوڵمو زۆری هەیە، وەکو زاناو فەرماندەی گروپێکی ئیسلامی وای دەبینم بەرەنگاربوونەوەی واجبە)(٧).

شێخ عوبێدوڵڵا لەسەرەتای تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨٠ز لەکوردستان چالاکیە سەربازیەکانی دەست پێکرد، هێزەکانی کرد بەسێ هێز :- هێزی یەکەمو سەرەکی ژمارەیان ٢٠هەزار جەنگاوەر دەبوو بەسەرۆکایەتی شێخ

عەبدولقادر لەباشووری ورمێ بەرەو مهاباد دەچوو. ٢)-هێزی دووەم بەسەرۆکایەتی شێخ سدیقی برازای شێخ عوبێدوڵڵا بەهەزار چەکدارەوە لەمەرگەوەڕ مایەوە بۆ پشتگیری هێزی یەکەم. ٣)-هێزی سێیەم بەسەرۆکایەتی خەلیفە موحەمەد ژمارەیان پێنج هەزار چەکدارو بەئاراستەی ناو شاری ورمێ دەڕۆیشتن .. هێزێکی‌تر بەسەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵڵا بەپێنج هەزار چەکدارەوە پەیوەندی پێوە کردن، ئەم هێزە گەمارۆی شاری ورمێیان دا.. زۆربەی هۆزە کوردیەکانی کوردستانی ئێران‌و عێراق دایانە پاڵ بزاڤەکەی شێخ. بەماوەی چەند هەفتەیەك ئیدارەی ئێرانی لەکوردستان نوشستی هێناو شێخ ئیدارەیەکی جێگرەوەی کاتی پێکهێنا. هیچ گومان لەوە دانیە ژمارەیەك لەنەوەی هۆزەکان بەمەستی تالانی‌و زەوتکردن چووبوونە پاڵ جولانەوەکەی شێخ، ئەوانە بارودۆخەکەیان بەهەل زانی بۆتالانی گوندە ئازەری‌و شیعەکان‌و سەروەت‌و سامانی گاورە نەستوریەکانی ناوچەی ورمێ کە کەوتبوونە ژێردەسەلاتی ئیدارەی کوردی. هەتا لەمیاندواو کارەساتی دڵتەزێن رووی‌دا، دوای گەمارۆدانی شار شێخ عەبدولقادر خاڵی لەگەڵ چەند پاسەوانێك ناردە ناو شار بۆدانوسان بەمەرجی خۆبەدەستەوەدان. حاکمی شار فەرمان دا بەکوشتنی نمایندەو یاوەرەکانی لەگەڵ ناشیرن کردنی لاشەکانیان. ئەمە رقی کوردانی ورووژاندو چوونە ناو شارەوە ، بەپێی هەندی سەرژمێری حکومەت ٣٠٠کەسیان کوشت لەناویاندا ژن‌و منداڵ هەبوو، ئەم کارە هەڵەو پێچەوانەبووە لەگەڵ نەریتی کوردو ئاکاری سوارچاکی، حکومەتی ئێرانی بەخراپی سوودی لێوەرگرت بۆناشیرن کردنی راپەڕین لەناوەندە رەسمی‌و جیهانیەکان هەتا وێنەی هەموو راپەڕینەکە بگرن بەوەی کاری کوشتن‌و تالانی‌و گەڕەلاوژەی خێلایەتیە. هەروەها حکومەتی ئێرانی ئەو رووداوەی

قۆستەوە بەوەی شەڕی سوونە ـ شیعەیە، ئەمەش بۆبەگەڕخستنی ئازەرو فارسی شیعە دژ بەکورد(٨).

لەناوەڕاستی ١٨٨٠ز شای ئێران بەیارمەتی دەوڵەتانی ئەورووپی و دەوڵەتی عوسمانی کەوتنە خۆ بۆبەرپەچدانەوەی هێزەکانی کورد، قەیسەری رووسی بەخێرایی هێزو تەقەمەنی زۆری ناردە ئازەربێجان و قونسوڵی گشتی بەریتانی (ئابووت) بەپەلە هاتە ورمێ، بەر لەگەیشتنی ئابووت شێخ بەنیاز بوو دەست بەسەر ورمێ دا بگرێ بەڵام قوسوڵی بەریتانی و دکتۆر کۆچرانی مسیونەری ئەمریکی کە لای شێخ جێی متمانە بوو داوای لێکرد ئەم کارە بۆماوەی بیست و چوار سەعات دوا بخات، بەو بیانووەی بەر لەچوونە ناو شار دەرفەت بدرێتە گاورو مسیونەرەکان و خەڵکی شار بەڵام لەراسیدا ئەمە پیلانێکی نێوان دکتۆر کۆچران و فەرماندەی سەربازی بوو، ئەوان دەیانزانی یارمەتی ئێرانی بەرێوەیە و ویستیان ئەم دەرفەتە وەربگرن هەتا لەئازەربێجانی رۆژاواوە ئەو هێزە دەگات بۆشکاندنی گەمارۆی ورمێ، ئەمە بەکردەوە رووی‌داو شێخ عوبێدوڵڵا دەرفەتێکی مێژوویی لەدەست چوو، وای لێهات شەڕەکە چووە بەرژەوەندی هێزەکانی ئێرانی.

لە٢٤ی تشرینی یەکەم هێزێکی گەورەی ئێرانی بەسەرۆکایەتی حیشمەت دەولە سوپا سالار (فەرماندەی هێزەکانی شا) گەیشتە کوردستان . ئەو هێزە پێکهاتبوو لە٢٠هەزار سەربازو ٢٠ تۆپ و ١٢هاوەن، هێزەکانی ئێرانی لەژێر چاودێری چەند پسپۆڕێکی سەربازی نەمساوی دابوون. سەرەڕای ئەوەی هێزەکانی شێخ هەوڵیان دا بچنە ناو ورمی بەڵام خراپ شکان و ناچار وازیان لەگەمارۆی سەر ورمێ هێنا. لێرەوە راپەڕین پێچەوانە بۆوە. شێخ پێی وابووە رووس هێز بۆنەخچەوان دەنێرێت و

لەئایندە ئێران دەکەوێتە شەڕەوە . هەروەها حکومەتی عوسمانی چەند لیوایەکی هێنایە هەکاری لەناوچە سنووریەکان بۆبڕینی هاوکاریو تەقەمەنی لەهێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا. لەگەرمەی شەڕەکاندا ژمارەیەکی کەم لەوانەی بۆمەبەستی تاڵانی پەیوەندیان پێوە کردبوو مەیدانی شەڕیان بەجێهێشت، ئەمەش کاریگەری مەعنەوی خراپی هەبووە بۆسەر وورەی کورد. لە١٢ی تشرینی دووەمی ١٨٨٠شێخ فەرمانی بەپاشماوەی هێزەکەیدا بڵاوەی لێبکەن، خۆی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هێزەکەی لەگەڵیدا بوون گەڕانەوە بۆناوچیا لەنەهری -هەکاری (٩). بەمەش ڕاپەڕینەکەی شێخ توایەوە.

لەدوای گەڕانەوەی شێخ بۆ بارەگای خۆی لەهەکاری حکومەتی ئێرانی بەپشتیوانی بەریتانیاو رووسیا کەوتنە شاڵاوێکی دیبلۆماسی چڕ بۆدوورخستنەوەی شێخ لەناوچە سنووریەکان. حکومەتی ئێرانی لەسەر زاری باڵوێزەکەی لەئەستەنبوڵ هەڕەشەی کرد بەوەی ناچارە بۆسزادانی شێخ بچێتە ناو خاکی عوسمانی ئەگەر حکومەتی عوسمانی نەیگرێ. حکومەتی ئێرانی داوای قەرەبووی دەکردەوە لەحکومەتی سوڵتان بەو حیسابەی شێخ عوبێدوڵڵا لەرەعیەی دەوڵەتی عوسمانیە. هەروەها شا داوای تەسلیم کردنەوەی سەدان سەرۆك هۆزو شێخی کوردستانی ئێرانی دەکرد بەتایبەت هەمزاغای مەنگوڕ کە یەکێك بووە لەفەرماندەکانی شێخو لەگەڵ هاوەڵانی پەنای بۆتورکیا بردووە، حکومەتی عوسمانی ژمارەی پەناهێندەکانی بەسی هەزار پەناهەندە حیساب دەکرد. کە لەبارێکی خراپ دا دەژیان (١٠)لەدوای فشارێکی زۆری باڵوێزی رووسیاو بەریتانیا لەئەستەنبوڵ دوای گەیشتنی نێردراوی سوڵتان بۆنەهری شێخ ناچار بوو بەرێ بکەوێ بۆئەستەنبوڵ بۆقبوڵ کردنی بەزۆر هێشتنەوە (الاقامە

الجبريه). هەموو ئەو شوێنانەی کاروانەکەی شێخی پێدا تێدەپەڕی بۆئەستەنبوڵ وەکو پاڵەوان نەك دیل لەلایەن خەڵك و بەرپرسانی عوسمانی پێشوازیەکی میللی گەرم دەکران، نمایندەی هەردوو حکومەتی بەریتانی و رووسی لەئەمە نیگەران بوون. لەئەستەنبوڵ سوڵتان رێزی لێگرت و شوێنی حەوانەوەو موچەی شایستەی بۆدیاری کرد(۱۱) شێخ لەئابی سالی ۱۸۸۲هەڵات و گەڕاوەیەوە نەهری دووبارە لەلایەن خەڵکی کوردستان و مرید و مەنسووبەکانی پێشوازی و پشتیوانی گەورەی لێکراوە هەتا حکومەتی ئێرانی سەغڵەت دەبێت و حکومەتی عوسمانی تاوانبار دەکات بەوەی لەپشت هەڵاتنی شێخەوەیە بۆیە دووبارە دەگیرێ و دوور دەخرێتەوە بۆئەستەنبوڵ. لەکۆتایی تشرینی سالی ۱۸۸۲لەگەڵ کامیل پاشای نوێنەری سوڵتان دەکەوێتە گفتوگو لەسەر دوورخستنەوەی بۆمەکەی پیرۆز(۱٤). لەسەر داکۆکی شێخ گواستیانەوە بۆموسڵ لەرێگا لەکاتی گواستنەوەی بۆموسڵ لەلایەن شێخ عەبدولقادرەوە هەوڵی دەربازکردنی دەدرێت بەڵام بێئاکام بووە. لەموسڵەوە بۆمەکەو دوای سالێك لەوێ دەمرێ(۱۲)

د. عەبدولعەزیزی شەمزینی یەکێکە لەنەوەکانی شێخ عوبێدوڵڵا دەنووسێ : هەندێك لەتوێژەروان روخساری ئاینی دەبەخشن بەراپەڕینەکەو ئێرانی و ناحەزەکانی بەوە تاونباری دەکەن خواستی هۆزە کوردیەکان بووە بەئاراستەی فەوزاو تالانی، هەیە لەو قەناعەتەدایە شێخ لەبازنەی نەخشەی تورکی دابووە دژی ئێران و هێزە ئەورووپیەکان، بەڵام براقەکەی لەبەر هیچ لەم هۆکارانە نەبووە بەڵکو لەپێناو بەدیهێنانی سەربەخۆی کوردستان بووە(۱۳) بەخوێندنەوەی بەڵگەنامەکانی تایبەت بەجولانەوەکەی شێخ دەگەینە ئەو تێگەیشتنەی پەیامی شێخ عوبێدوڵڵا

لەچوارچێوەی کوردایەتی بووە (کارکردن بووە بۆبەرژەوەندی کوردی نەك کارکردن بەبیری نەتەوایەتی کوردی).

ئەم دەربڕینانەی سەروەی مامۆستا شەمزینی پوختەیەکی باشەو سروشتی گفتوگۆی ئامانجی راپەڕینەکەی شێخ عوبێدوڵلا دیاری دەکات، لەوەدا لەگەڵی کۆکین کە رزگارکردنی کوردستان لەدەسەلاتی ئێرانیو عوسمانی ئامانجی جولانەوەکەی شێخ بووە بەلام ناتوانین مامەڵە لەگەڵ جولانەوەکەی شێخ بکەین وەکو جولانەوەی نەتەوەیی هاوچەرخ لەبەدەسهێنانی ماف چارەنووس. بۆیە سروشتی بزاڤی شێخ لەچوارچێوەی زەمەنی مێژوویی خۆی وەردەگرینو حالی دەبین کە کوردایەتی بەتێگەیشتنی شێخەکانی تەریقەتی سۆفیگەری (نەقشبەندیو قادری) بووە لەکوردستان، لێرەدا ناتوانین فاکتەری ئایینی کورت بکەینەوە بەوەی خواستی شەخسیەو نەیوستووە ئەمارەتێکی کوردی یا حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ لەژێر فەرمانی خۆی دابمەزرێنێت. لەسالی ۱۸۷۹عەبدولقادری کوڕی دەنێرێ بۆئەستەنبوڵ هەتا پرۆژەی پێکهێنانی ولایەتی کوردستانی گەورەی پێشنیاری باوکی بخاتەڕوو بەلام ئەو دەست پێشخەریە سەرکەوتوو نەبوو(١٤) تێکشکانی عوسمانی لەشەڕی رووسی - عوسمانی سالانی ۱۸۷۷-۱۷۸۸و رێکەوتنامەی بەرلین لەدەستێوەردانی هێزە ئەورووپیەکان لەبەرژەوەندی ئەرمەن لەراستیدا کاریگەری بەرچاوی هەبووە لەسەر جولانەوەی شێخ عوبێدوڵلا.

مەترسی دامەزراندی قەوارەی ئەرمەنی لەسەر خاکی کوردستان لەژێر پەردەی چاکسازی هەستی زۆربەی شاعیرانی ئەو کاتەی وروژاندووە، حاجی قادری کۆیی لەشیعرێکیدا ئەو راستیە بەدیاردەخاو دەڵێ:-

خاکی جـــــــەزیرو بۆتان / یەعنی ولاّتی کـــــــوردان
سەد حـــــەیف و سەد مخابن / دەیکەن بەئەرمەنســـتان
مەسجیـــــــد دەبێتە دێـرە / ونـــــاقوسیان مـــوئەزین
مەتـــران دەبێتە قـــــازی / مـــــــوفتی دەبێتە رەهبان

## هۆکارەکانی کەوتنی راپەڕینی شێخ عوبێدوڵلاّ

چـەندین هۆکـار هەیـە بـۆ ئـەو رووخانـە لـەناکاوەی بزاڤەکـەی شـێخ عوبێدوڵلاّ، لەگرنگترین ئەو هۆکارانە ململانێی هێزە ئەورووپییەکان لەپێناو نفوزی خۆیـان بـۆدابیکردنی دەسـەلاّت لـەناو دەوڵـەتی عوسمـانی و ئێـران، هاریکاری ئیقلیمی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لەسەر حیسابی کورد، سروشتی شێخ عوبێدوڵلاّو خراپ تێگەیشتنی لەهێزی هەریەك لەدەوڵـەتی عوسمانی و ئێرانی، پشتبەستنی شێخ عوبێدوڵلاّ بەهەندێك شێخ و سەرۆك هۆزی کوردی دەروەی تەریقەتی نەقشبەندی.

مامۆستا ساڵح ئەمین دەڵێ (کەوتنی لەناکاوی بزاڤەکەی شێخ عوبێدوڵلاّ دەگەڕێتەوە بۆشارەزانەبوونی بەشەڕی پارتی زانی و داواکاری لەلایـەنگرانی بەوەی بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان، لەتوانادا هەبوو شێخ بەرەو ناوچە شاخاویە سـەختەکانی سـەر سنوور بکشـابایەوە)(١٥)پـەنا نـەبردنی شـێخ عوبێدوڵلاّ بۆشـــەڕی پـــارتیزانی بەراســـتی بابـــەتێکی قســـەهەڵگرە. لەکاتێکـــدا نەقشـبەندیەکانی ئـەوکات کەلـەپورێکی دەوڵەمەنـدی هاوچـەرخیان هـەبووە لەخـەبات لەشێوەی شـەڕی پـارتیزانی. شـێخ شـامیلی داغستانی بۆمـاوەی

سێ گرێ (عقود) لەسالانی(١٨٣٤-١٨٥٩) لەداغستان و چاچانستان لەدژی داگیرکەری رووسی شەڕی پارتیزانی کردووە. لەوکاتە شێخ شامیل لەپەیوەندی پتەودا بووە لەگەڵ شێخ تەهای باوکی شێخ عوبێدوڵڵا. لەهاوکات لەگەڵ ئەودا میر عەبدولقادری جەزائیری سەرۆکی تەریقەتی قادری سۆفیگەری لەسالانی ١٨٣٢-١٨٤٧ سەرکردایەتی تێکۆشانێکی تالی دەست پێکرد دژی فەرەنسیەکان و بۆماوەی ١٥سال بەهۆی مریدەکانی تەریقەت لەشەری پارتیزانیدابووە. پرسیارێکەو دێتە پێشەوە بۆچی شێخ عوبێدوڵڵا لاسای ئەو دوو شێخەی نەکردۆتەوە لەکاتێکدا ئەم لەلاویەتیەوە هەوالی ئەوانی بیستووە. پێکهاتەی دانیشتوان و سرشتی شاخاوی سنووری تێکۆشانی هەردوو شێخی ناوبراو جیاوازیەکی زۆری نەبووە لەگەڵ سروشتی جوگراف و پێکهاتەی خێڵەکی کوردستان.

خالێکیتری جیاوازی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا لەگەڵ ئەوانیتر ئەوەیە رێگەی دابوو بەژمارەیەکی زۆری بەرژەوەندچی بێنە رێزی شۆڕشەکەی لەکاتێکدا شێخ ئاگادار نەبوو بەسروشتی ئیستسغلال و بەرژەوەندی چیەتی ئەو توێژە لەکۆمەڵگای کوردی کەبێجگە لەبەرژەوەندی خۆیان و خانەوادەیان بیریان لەهیچیتر نەدەکردەوە، لەشەڕدا بەلای بەهێزدا دەشکانەوە. ئەوانە لەبەر بەرژەوەندی مادی بەپەلە بیر لەتێکۆشانی درێژخایەن ناکەنەوە. وازهێنانی ئەوانە لەگەرمەی شەڕو چوونە پال دوژمن بێگومان دەبێتە هۆی داڕوخانی مەعنەویاتی ناو هێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا.

شێخ عوبێدوڵڵا هەڵەبووە لەبەکەمگرتنی دوژمنەکانی و زیادڕۆیی لەهێزی خۆی، هەروەها هەڵخەڵەتابوو بە بەڵێنی بالوێزەکانی بەریتانی و میسیونەرە ئەمریکیەکانی کوردستان. لەئەو نامەی پێشتر کە بۆشێخ عەبدولقادری بریفکانی ناردووە دەڵێ شتێك نەماوە بەناوی دەسەلاتی عوسمانی و

حکومـــەتی عوسمـــانی دەتوێتـــەوەو مومتەلـــەکاتی لەلایـــەن هێـــزە ئەورووپیەکانەوە دابەش دەکرێ، بەڵام لەناکاو هێزەکانی لەموسڵ (ئامێدی) تووشی بەرگریـەکی بەهێزی هێزەکـانی لایـەنگری حکومـەت بوون. لەسـاڵی ١٨٧٩ لەناکاو شێخ جیهادی لەدژی دەوڵـەتی عوسمانی کۆتایی پێهێنا و رووی سوڕاند بەرەو ئێران. قسـەشمان هەیە لەسـەر وتارەکـەی نـەهری بـەر لەهێرشی بۆسەر ئێران کەپێشتر ئاماژەمان پێدا، لەوتارەدا راستیەك هەیە ئەویش ئەوەیە شێخ وایئەزانیووە حکومەتی ئێرانی دەتوانێت هێزی تـەواو بنێرێتـە سـەر هێزەکـانی. وەکـو بینیمـان شـا هێزێکـی نـارد لەئـەزموون و تەقەمەنی زۆر بالاتر بووە لەهێزەکانی شێخ.

سەرەڕای ئەمانە شێخ عوبێدوڵڵا باش لەزمانی دیبلۆماسیەتی بالوێزو میسیونەرەکان نەدەگەیشت، وەکو بەدیاردەکەوێ ببووە نێچیری دۆستایەتی رووکەشانەو فرۆفێڵی دکتۆر کۆچران و قونسوڵ ئابوت و یاریدەری قونسوڵ کلایتـــۆن، ئەوانـــە رووکەشـــانە هاوســـۆزیو بایـــەخی خۆیـــان بۆشـــێخ بەدیاردەخســتو بـەنهێنی راپۆرتیـان دەنووسـی لەبابـەت مەترسـی شـێخ لەسـەر ئـەمن و ئاسایشـی نـاوخۆی ئێـران و دەوڵـەتی عوسمـانی. شـێخیان والێکردبوو قەناعەتیان پێبکات بەوەی حکومەتەکانیان قەناعـەت پـێدەهێنن لەسـەر پشـتگیری شـێخ دژی دەوڵـەتی ئێرانـی و عوسمـانی. هـەروەها شـێخ هەقیقـەتی حکومـەتی عوسمـانی تێنەگەیشـتبوو کـەهێرش دەکاتـە سـەر کوردسـتان. لەکاتێکـدا لەسـەرەتاوە عوسمانیـەکان ئیشـارەتی پشـتگیریان دابـووە شـێخ لەسـەر خۆئامـادەکردنی هێـرش بۆسـەر ئێـران. بۆیـە شـێخ عوبێدوڵڵا بەئیشـارەتی پشـتگیری پێیوابـووە لەحالـەتی هێرشـکردنە سـەر ئێـران دەوڵـەتی عوسمـانی بـێدەنگ دەبێـت. سـاڵح ئـەمین لـەو بارەیـەوە نامەیـەکی شـێخمان بۆدێنێتـەوە کـە دەنووسـێ (کاروبار بەچاك دەڕوا بـەم

دوای‌یە ئەحمەد بەگی راوێژکاری سوڵتان هاتووە بۆئەنجامدانی هەندێ کاری نهێنی لەناوچەکەماندا ...... ئەو دووڕووییە نەبێت خەڵکی کوردستان لەنێوان خۆیاندا رێککەون بێگومان بەخێر کۆتایی دێت.. هەموو حکومەتەکان هەقیان داوە بەئێمە کەعەجەمی دەستدرێژکارن(١٦).

پشتبەستنی شێخ عوبێدوڵڵا بەمیسیونەرەکان بەجۆری بەهاوپەیمانی خوی دەژماردن هەر ئەوانیش بوون لەورمێ لەگەورەترین سەرکەوتنی سەربازی بێبەشیان کرد . دەست تێوەرانی د.کۆچران و قونسوڵ ئابووت لەگەماڕۆی سەر ورمێ لەئاکامی نەخشەی پێشتر هاتبوو لەگەڵ حکومەتی ئێران کەهێزی ناردبوو بۆرزگارکردنی شار. میستەر سبیر لەوکاتەدا لەورمێ بووەو دان بەو راستییەدا دەنێت و دەڵێ ( ئەگەر شێخ گوێی بە داواکاری ئێمە نەدابا و٢٤ سەعات هێرشەکەی دوانەخستبا ورمێ دەکەوت و ئەوەی ئێمە لەئاکامەکانی دەترساین دەهاتەدی(١٧).

دەستێوەردانی هێزە ئەوروپییەکان لەبەرژەوەندی ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بە هۆکارێکی بنەڕەتی دادەنرێ لەهەرەسهێنانی جولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بەتایبەتی سیاسەتی هەمبەری هێز کەزامنی پاراستنی ئاسایش بووە لەئەورووپا لەسەدەی نۆزدەهەم و هۆکاری لەباریەکبردنی ئەو بزووتنەوەیە بووە، ئەمە پیشتریش هۆکاری رووخانی زۆربەی جولانەوەکانی کوردی بووە. ئەوکات و دواتر سیاسەتی بەریتانیا بەرگری رووسیای قەیسەری بووە لەفراوانخوازی بەئاراستەی باشوور لەناو دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی. چونکە دەستبەسەراگرتنی دەوڵەتی عوسمانی یا لێك هەڵوەشانەوەی مانای دەرفەت دانە بەرووسیا بۆدەست بەسەراگرتنی گەرووی بۆسفۆڕو دەردەنیل و کەنداوی فارس. ئەمەش بەرژەوەندیەکانی بەریتانی لەدەریای سپی ناوەڕاست و هیند دەخستە مەترسیەوە. لەبەر ئەوە

هەر ناکۆکیەکی ئێرانی - عوسمانی لای بەریتانیا نەخشەی رووسیایە بۆدروستکردنی بارودۆخێك هەتا دەرفەت وەربگرێ نفوزی خۆی لەئێران و دەوڵەتی عوسمانی لەسەر حیسابی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا پەرەپێبدات. بەریتانیاش سووربووە لەسەر ئاشتی نیوان دەوڵەتی ئێرانی و عوسمانی. هەروەها سوور بووە لەسەر پاراستنی یەکیەتی خاکی ئەو دوو دەوڵەتەو بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم بەچاوی گومانەوە دەیڕوانیە جولانەوەکانی کورد چوکە دەبنە هۆکاری نائارامی ناوچەکە(١٨).

هێرشی هێزەکانی شێخ عوبێدوڵلا بۆسەرکوردستانی ئێرانی قەیرانێکی جیهانی دروست کرد، رووسیا ئەو هێرشەی بەبەشێك لەنەخشەی بەریتانی - عوسمانی دەزانی لەپێناو پەشێوی خستنە ناو ئێران. چونکە ئەوکات حکومەتی ئێرانی پەیوەندی پتەو بووە لەگەڵ رووسیا بەلام حکومەتی بەریتانی گومانی هەبووە جولانەوەکە لەنەخشەی عوسمانی بێت بۆخۆدزینەوە لەو ئیلتیزاماتانەی هێزە ئەورووپیەکان لەرێکەوتنامەی بەرلەینی ١٨٧٨بەسەریاندا سەپاند بەتایبەتی ئەو بڕگانەی پەیوەندی هەبووە بەچاکسازی ئەرمەن. بەریتانیا نیگەرانی لەرووسیاش هەبوو دەترسا جولانەوەی شێخ عوبێدوڵلا بەدەرفەت بزانێ بۆپەرەپێدانی نفوزی خۆی لەناو خاکی عوسمانی، بەناوی بەرەنگاری شاڵاوی کوردان بێتە ناو خاکی ئێرانی و دواتر حالەتی گەڕەلاوژەیی ناوچە سنووریەکان بەدەرفەت بزانێت بۆلکاندنی خاکی عوسمانی لەئەنادۆڵی رۆژهەلات بەخاکی رووسی. ناسرەدین شاش لەلای خۆیەوە هەوڵیدەدا رووس قەناعەت پێبکات دەوڵەتی عوسمانی کوردی هانداوە بۆدروستکردنی ئەو قەیرانە هەتا رووس بێبەش بکات لەو دەستکەوتانەی لەم شەڕەی دوایی رووسی - عوسمانی بەدەستی هێناوە کە لەرێکەوتنامەی بەرلین دا خوی دەبینێتەوە. ئەوەی

شایانی باسە ڕێکەوتنامەکە مافی پاراستنی ئەو خاکەی رووس داگیری کردبوو لەرۆژهەڵات دابوو بەرووس بەتایبەت لەئەردەهان و قارس و باتۆم. ئەمەو سەرەڕای مافی دەستێوەردانی رووسی لەکوردستان لەبەرژەوەندی ئەرمەن و نەستۆریەکان. لەکاتێکد دەوڵەتی عوسمانی لەدوای فشارێکی زۆر نەبێت رازی نەبوو ڕێکەوتنامەکە قبوڵ بکات ئەویش دوای فشاری گەورەی باڵوێزی رووسی (جۆرج ئەگناتیف) لەئەستەنبول و ئەو یاداشتنامەی وڵاتانی ئەورووپی دایان بەدەوڵەتی عوسمانی لەنێوان دوو شت سەرپشکیان کرد یان قبوڵ کردنی ڕێکەوتنامە یان بەتەنها بەرەنگاری شەڕی رووسی دەبێتەوە. بەرهەڵستی دەوڵەتی عوسمانی هەڵقولاوی ئەزموونی مێژوویی ولایەتەکانی عوسمانی ئەورووپی بووە لە بەلقان، دەستێوەردانی وڵاتانی ئەورووپی بەناوی چاکسازی دەستی پێکردو بەپشتگیری ئەو گەلانە بۆجیابوونەوە دوایی هات. رۆژنامەی (بیرخ)ی رووسی لەوتارێکی درێژیدا لەسەر جولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا خاوەنی وتار دەنووسێ : ورووژاندنی کورد لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دژی ئێران و رووسیا سیاسەتێکی ناسراوی عوسمانیە. پێشتر عوسمانیەکان مەسەلەی ئەلبانیان بەکارهێنا بۆئەوەی مۆنتینیگرۆ نەگات بەسەربەخۆیی(١٩). هۆکارێکی تری بەهێزی رووسیا بۆجولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بەبۆچوونی جوەیدە لەبەر بارودۆخی ناوخۆی رووسیای قەیسەریە. جوەیدە دەڵێ رووسیا تازە لەشەڕی شێخ شامیل و مریدەکانی ببۆوەو ئەو شەڕە خەرجیەکی زۆری ویستبوو. جولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵای بەزیندووکەرەوەی ئەو کەلەپوورە جیهادیەی تەریقەتی سۆفیگەری دەزانی و رووسیا دەترسا سەر لەنوێ لەقەوقازیشەوە سەرهەڵبداتەوە(٢٠). ئێرانیەکان بڕەویان بەو پڕوپاگەندەیە دەدا کە دەوڵەتی عوسمانی مومتەلەکاتەکانی لە

بەلقان لەدەست داوەو دەیەوێ مەسەلەی یەکیەتی مسوڵمانانی سوونە بوروژێنێت ئەوەش بۆدەربازبوون لەدەسەڵاتی شیعە لەئێران و ئیستیعماری رووسی لەولایەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقازیا و هەڵدان بۆلکاندنی ئازەربێجان و کوردستان بەڕێگەی جولانەوەی شێخ عوبێدوڵلا وەکو هەنگاوی یەکەمی ئەو سیاسەتە.

حکومەتی بەریتانی لایەنێکی تری نیگەرانی ئاکامەکانی جولانەوەی شێخ عوبێدوڵلایە. لەسەرەتاوە حکومەتی بەریتانی و بەتایبەتی باڵوێزەکەی لەئەستەنبوڵ میستەر کوشن و قونسوڵ ئابووت لەتەورێز قەناعەتیان وابووە حکومەتی عوسمانی لەپشت ئەو راپەڕینەوەن بۆخۆدزینەوە لەو ئیلتیزاماتانەی لەرێکەوتنامەی بەرلین دا هاتووە. بەرپرسەکانی ئینگیز لەدەوڵەتی عوسمانی لەسەرچاوە ئەرمەنەکانەوە ئەو بابەتانەیان وەردەگرت. مۆن سیۆر کەسایەتیەکی ئەرمەنی لەکوردستان لەراپۆرتێکیدا لەحوزەیرانی ١٨٨٠واتە پێش مانگێك لەکۆبوونەوەی سەرۆکە کوردەکان لەنەهری کە کۆمەڵەی سەرۆکە کوردەکانی لێ لەدایك بوو، دەڵێ (بەم نزیکانە هەندێ کەسایەتی کوردی بەهاندانی حکومەتی عوسمانی کۆمەڵەیەکی کوردی پێك دەهێنن ئەمەش بۆورووژاندنی مەسەلەی کوردی و لەبیرچوونەوەی مەسەلەی ئەرمەنە)(٢١).

هەروەها مۆن سیور کەریمیان لەراپۆرتەکەیدا دەڵێ :

هیچ گومانی تیا نیە حکومەتی عوسمانی لەپشت کۆمەڵەی کوردیەوەیە بۆ ورووژاندنی مەسەلەی کورد و دەستبەسەراگرتنی مەسەلەی ئەرمەن، ئەو کومەڵەیە رەنگدانەوەی سیاسەت و پەلهاویشتنی عوسمانیە، شێخ عوبێدوڵلا هەر بەناو سەرکردایەتی دەکات و سەرۆکی کردەیی بەحری بەگی کوڕی میربەدرخان بەگی نزیکی حکومەتی عوسمانیە. لەکاتێکدا بەحری

بەگ نفوزو دیاریو سامانو هەتا هەڕەشەو سەرنج راکێشانیشی نەك بەتەنها لەگەڵ کوردی دەوڵەتی عوسمانی بەڵکو لەگوڵ کوردی ئێرانیش بەکارهێناوە بۆپشتیوانی لەکۆمەڵە(٢٣).

راپۆرتێکی تری مسیتەر کۆشن هەیە لەگەڵ ئەو راپۆرتەی پیشتر باسمان کرد دوای مانگێك نووسیویەتیو دەڵێ (بەڵگەی یەکلایی کەرەوە نیە لەسەر دەستیوەردانی دەوڵەتی عوسمانی لەیاخی بوونی کوردی بەلام هەندێ بەڕێوەبەرایەتی سیاسی لەقەسر هەیە بەنهێنی رووداوەکانی کوردستان دەوروژێنن). قونسوڵ ئابوتیش جەخت دەکاتە سەر قسەکانی کۆشنو دەنووسێ (هەندێ بەڕێوەبەرایەتی پارێزگار لەدەوڵەتی عوسمانی بۆورووژاندنی دەمارگیری ئسلامی دژی دەوڵەتانی ئەورووپی پشتگیری بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵلا دەکەن)(٢٣).

بەلام میجەر ترۆوتر قونسوڵی ئەرزڕۆم دەڵێ بانگەشەی تێکەڵکردنی عوسمانیەکان لەجولانەوەی شێخ عوبێدوڵلا تەنها شتێکەو لەو پشتگیریەوە هاتووە رۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ بەشێخیان داوە(٢٤).

میستەر تومیسون باڵوێزی بەریتانی لەتاران هۆکارێکیتر دێنێتەوە بۆئەو گومانەی بەریتانیو قەناعەتی وایە حکومەت رازی نەبووە لەسەر ئەو پشتگیریەی هەندێ لەئەفسەرە بچوکەکان بەنهێنی پێشکەشی جولانەوەی شێخ عوبێدوڵلایان دەکرد(٢٥) نامەکانی شێخ بۆسەرۆکەکانی کوردو بانگەشەی ئەوەی سوڵتان پشتیوانیم لێدەکات فاکتەرێکیتری بوونی ئەو قەناعەتەیە لای هەندێك کە بەراستی دەوڵەتی عوسمانی پشتگیری دەکات(٢٦) والی هەکاری بۆبابی عالی دەنووسێ شێخ عوبێدوڵلا لەناو کوردەکان بلاوی کردۆتەوە کە سوڵتان پشتگیری لێدەکات (هیچ پیلانێك ناگێرێ بەفەرمانی سوڵتان نەبێت)(٢٧).

هەردوو حکومەتی بەریتانیو ئێرانی دەوڵەتی عوسمانییان تاوانبار دەکرد بەوەی نەرمە لەبەرانبەر شێخ عوبێدوڵلا چونکە ڕێوشوێنی توندی لەو بارەیەوە نەگرتۆتە بەر. ئەمەش : یەکەم، ڕێوشوینی تەواوی پیادە نەکردووە لەنەهێشتنی پەڕینەوەی هێزەکانی شێخ عوبێدوڵلا بۆئێران. دووەم، لەکاتی گەڕانەوەی شێخ بۆهەکاری دەوڵەتی عوسمانی بەجدی خۆی بۆگرتنی ئامادە نەکردووە. ئێرانیەکان دەیانوت لەچەندین بۆنەدا داوامان لەحکومەتی عوسمانی کردووە هێزی تەواو لەسەر سنوور دابنێت هەتا شێخ عوبێدوڵلاو لایەنگرانی لەکاتی راوەدوونانی هێزەکانی ئێرانی لەتشرینی دووەمی ۱۸۸۰هەڵنەیەت . لەکاتێکدا لەئابی ۱۸۸۰ واتە چەند رۆژێك پێش ئەوە هێزەکانی شێخ عوبێدوڵلا بچنە ناو ئێران میستەر کۆشن لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمید روونی کردبۆووە کەشێخ عوبێدوڵلا مەبەستی رابوونی چەکداری هەیە دژی ئێران، داوای لێکردبوو ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر بۆنەهێشتنی بەلام بێئاکام بووە(۲۸) حکومەتی عوسمانی بەتەواوی نکوڵی دەکرد لەوەی دەستی هەبێت لەجولانەوەی شێخ عوبێدوڵلاو هەروەها لەسەرەتاوە حکومەت رایگەیان شێخ عوبێدوڵلا رۆڵی لەراپەڕینی کوردان دا نیە دادگەریش نیە شێخ بەتاوانی کوڕو نەوەکانی بگیرێت. لەکاتێکدا شێخ لەسەرەتاوە بەیاننامەیەکی دەرکردو نیەتی ئاشتیخوازانەی خۆی بەرامبەر حکومەت دەربڕی بوو هیچ رۆڵێکی نەبووە لەوەی کوڕەکانی ئەنجامی دەدەن(۲۹)

وابەدیار دەکەوێ لەسەرەتاوە حکومەتی عوسمانی هەوڵیداوە شێخ لەو راپەڕینە بێتاوان بکات بۆئەوەی گازاندە لەسەر خۆی لاببات چونکە شێخ رەعیەتی دەوڵەتی عوسمانیە. لەچەندین بۆنەدا ئێرانو هێزە ئەورووپیەکان داوایان لە دەوڵەتی عوسمانی کردووە هەندێ ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە

بەر دژی شێخ عوبێدوڵڵا بەڵام بێئاکام بووە، بەڵام لەنامە ناوخۆیەکانی نێوان بابی عالیو دەسەڵاتدارە خۆجێییەکانی کوردستانو بەرپرسانی عوسمانی باسی شێخیان کردووە بە(خراپەکار)و (بێئاقڵ)و (خاوەن بیری پیس)، دەیانوت جولانەوەکەی بەرئەنجامی مەترسیداری هەیە بۆدەوڵەتی عوسمانی. دەروازەی باڵا بەفەرمانی سوڵتان بانگەوازێکی بۆکوردان دەرکردو رایگەیاند بڕوا بەشێخ عوبێدوڵڵا مەکەن لەوەی دەڵێ سوڵتان پشتگیریم دەکات(٣٠). بەڵام لەراپۆرتی کابتن کلایتن لە٥ی تشرینی یەکەمی ١٨٠٠ تێبینی دەکری لەرووداوەکانی راپەڕین دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەهەکاری لەئاستی ئەو هەڵوێستەدا نەبوون بتوانن نەیەڵن کورد لەکوردستانی تورکیا بەشداری جولانەوەی شێخ نەکات، ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەکەم، بەر لەرووداوەکە شێخ بەتەواوی باڵا دەست بووە بەسەر هەموو ولایەتی هەکاری. دووەم، سوپاو زەبتیەی عوسمانی لەولایەتی هەکاری لەمانگرتنی گشتگیر دابوون چونکە ماوەیەکی زۆر بووە موچەیان وەرنەگرتبوو بۆیە گوێڕایەڵی فەرمان نەبوون. ئەوەش زیاتر نیگەرانی سوپاو زەبتکەرانی زیاد کرد بڵاوبوونەوەی بێدەرامەتیو برسیەتی بووە لەناوچەکە(٣١).

لەئەم خستنەرووەی سەرەوە روون دەبێتەوە ئەو تاوانانەی ئاراستەی حکومەتی عوسمانی دەکرێت بەوەی رۆڵی هەبووە لەجولانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بەجدی تاوانبارکردنە چونکە نکوڵی لێکردنی ئاسان نیەو دەستێوەردانی هەقیقی لەرووداوەکان هەستی پێدەکرێتو بەرپرسانی ئێرانیو رووسو بەریتانی وەکو راستی مامەڵەیان لەگەڵ کردووە. بەڵام بەشێکی ئاسانی ئەو بەڵگەنامانەی عوسمانی دەست نووسەر کەوتووە لەخانەی بەڵگەنامەکانی عوسمانی لەئەستەنبوڵ پشتگیری ئەوە ناکەن

نەرمی هەبوو بێت لەنێوان شێخ عوبێدوڵلاو دەوڵەتی عوسمانی. ئەگەر توێژەرەوانی تر بەڵگەنامەی دیکە لەئاینده بەدەست بخەن لەسەر راستی ئەو پەیوەندیە. چەند ئەگەرێکی جدی هەیە لەسەر هەڵوێستی حکومەت کە نەیتوانیوە هەڵوێستی توونـد وەربگرێ لەقەدەغەکردنی پەڕینەوەی هێزەکانی کوردی بۆناو خاکی ئێرانی.: یەکەم، زۆر گونجاوە هێزە محەلیەکانی کوردستان وەکو یەك لەو راپۆرتانە باسی دەکات توانایان هەبوو بێت بۆئەو کارە، دووبارە مەعقوڵە حکومەتی عوسمانی لەسەرەتاوە ئاگادار بوو بێت بەڵام چاوی لێپۆشی بێت هەتا بیکاتە ئامرازێك بۆرزگاربوون لەفشاری حکومەتە ئەورووپیەکان لەسەر جێبەجێکردنی بەندەکانی رێککەوتننامەی بەرلین، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بەماف ئەرمەنەوە هەیە لەکوردستانی تورکیا. دەوڵەتی عوسمانی چەندان جار هەستی بەوە کردبوو حکومەتی بەریتانی لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ وەکو بەنهێنی لەدوای رێکەوتنامەی بەرلین لەسەری رێکەوتوون و هەردوولا ئیمزایان لەسەر کردووە پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی دەوڵەتی عوسمانی ناکات. ئەوەی شایانی باسە دەوڵەتی عوسمانی بەڵێنی لەبەریتانیا وەرگتبووە فشار بخاتە سەر رووسیا هەتا لەئەردەهان و قارس و باتومی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بکشێتەوە. دوور نیە بەنهێنی سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ شێخ عوبێدوڵلا رێکەوتبێت لەسەر هێرشکردنە سەر ئێران بۆلکاندنی کوردستانی ئێرانی سوونی بەدەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش بەمەستی جێبەجێکردنی بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی لەسەر قەناعەتی سوڵتان عەبدولحەمید لەپێناو نەهێشتنی ئەرمەن لەدەستبەسەراگرتنی کورد کە هێز ئەورووپیەکان نەخشەیان بۆکێشا بوو.

بەڵام رۆڵی دروستی عوسمانی لەوقەیرانە هەرچۆنێك بێت ئەوە ئیران بەجدی مامەڵەی لەگەڵ دا دەکردو هەرەشەی پەرینەوەی دەکرد بۆناو خاکی عوسمانی، دەست پێکردنەوەی سەرلەنوێی شەڕی ئێرانی ـ عوسمانی بەریتانیای زۆر ترساند، چونکه بەرژەوندیەکانی لەناوچەکە دەکەوتە مەترسییەوە. میستەر تۆمیسۆن دەڵێ ئەو ململانێیە رەهەندێکی جیهانی دەبوو هێزە ئەورووپییەکان نەیاندەتوانی بێلایەن بن و نەخزێنە ناو. بۆیە بەدرێژایی ماوەی راپەڕینی کوردان هێڵی پەیوەندی نێوان بیترسبۆرگ (پایتەختی رووسیای قەیسەری)و لەندەن گەرم بووە هەتا لێك حاڵی نەبوونی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە روو نەداتو نەبێتە شەڕی نێوان هەردوولایان. هەتا لەکۆتاییدا هەردوو دەوڵەت توانیان یەك هەڵوێست گەڵاڵە بکەنو ئێرانو دەوڵەتی عوسمانی ناچار بکەن بەرێگەی دیبلۆماسیو هاریکاری ئیقلیمی دژی کورد ئەو قەیرانە چارەسەر بکەن. نەهێشتنی شێخ عوبێدوڵڵا لەناوچە سنووریەکانو دوورخستنەوەی بۆحیجاز بەرهەمی ئەو هەوڵانەیە(٣٢).

بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا هەردوو حکومەتی ئێرانیو عوسمانی ناچار بەکۆمەڵێك سازشی ئیقلیمی کرد. رووسیا بەروونی پشتگیری ئێرانی دەکردو لەحاڵەتی قەیرانەکە بەئاشکرا رایگەیاند هێزەکانی بۆهاوبەشی لەگەڵ هێزەکانی ئێرانی دەنێرێتو هێزی زیادە دەنێرێتە ناوچە سنووریەکان بۆئەوەی لەکاتی زەروورەت بەپەلە بەشداری بکەن، نفوزی خۆی لەلای شا پەرەپێدا. شا لەلای خۆیەوە سازشی لەسەر هەندێ مەسەلەی ناکۆکی نێوان رووسیاو ئێران کرد لەئاسیای ناوەڕاستو قەوقازیا(٣٤).

بالوێزی بەریتانی هەریەك لەتاران و ئەستەنبوڵی قەناعەت پێهێنا پرۆتۆكۆڵێكی تایبەت ئیمزا بكەن بۆچارەسەری ئەو گرفتانەی بەهۆی هۆزە كوردەكانەوە سەرهەڵدەداو بەشالآوی خێڵەكیانە سنوور دەبەزێنن. هەروەها هەردوو دەوڵەت رێكەوتن لەسەر رێگەنەدان بەمافی پەنابەری سیاسی و حەوانەوەی سەرۆكە كوردەكان لەهەردوو دەوڵەت. هەر لەو وەرەقەیە ئێران ئیمزای لەسەر پرۆتۆكۆڵی كەشتی رانی لەرووباری كارون كرد كەماوەیەك بوو بەریتانیا داوای دەكرد، عوسمانیەكانیش ئیمتیازی بەكارهێنانیان بۆبازرگانی پێدرا(٣٥). هەر لەوێدا ئێران ناچار بوو سوور نەبێت لەسەر جێبەجێكردنی بەندی ژمارە (٦٠)ی رێكەوتنامەی بەرلینی تایبەت بەگەڕانەوەی قوتوور لەژێر دەسەلآتی دەوڵەتی عوسمانی بۆئێران(٣٥).

## پوختەی توێژینەوە

بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا وەكو هەموو بزاڤە كوردیەكانیتری ئەوكات كاردانەوەی هەوڵەكانی عوسمانی بووە كە بەناوی چاكسازی دەستی گرتبوو بەسەر دەسەلآتی خۆكارگێڕی لەكوردستان. بزاڤەكە بەئەندازەیەكی كەم بەرگری بووە لەبەرژەوندی كورد بەرووی فەسادی ئیداری دەوڵەتی عوسمانی و زیادبوونی نفوزی رۆژاوا و هەوڵی سەپاندنی هەیمەنەی ئەرمەنی لەكوردستان. هەروەها جولانەوەكە سوودی لەكەلەپووری تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە لەپەیوەست كردنی بەرگری لەئیسلام و بەرژەوەندی كورد كە پێیان دەگووت كوردایەتی (بەبێ بیری كوردایەتی) بەراستی شێخ عوبێدوڵلا بەپێشەنگی كوردایەتی دەژمێردرێت. چونكە

پوختەی ئیسلامەتی لەگەڵ پالآفتەی کوردایەتی لەیەك تەرازوو دانابوو.
هەوڵەکانی شێخ بۆدامەزراندنی کوردستانی سەبەخۆو هەوڵی بەردەوامی بۆبەدەستهێنانی پشتگیری هێزە ئەورووپیەکان لەسەر بنەمای براگماتی وەکو گۆڕینی دۆستایەتی لەحکومەتی عوسمانیەوە بۆحکومەتی بەریتانی، شارەزایی قوڵی شێخمان بۆ بەدیاردەخا لەهەمبەری هێزە جیهانیەکان و کاریگەریان لەسەر کوردستان. شێخ عوبێدوڵلا تێڕوانینی گشتگیری هەبووە بۆکورد وەکو گەل و دوودڵ نەبووە لەپشتیوانی ئەو راستیە (ئەمەش بەداواکاری کوردستانی سەربەخۆی یەکگرتوو بەدیار دەکەوێ) بەپێچەوانەی زۆربەی پارتە عەلمانیەکان کە تێڕوانینی جیاوازیان هەیە بۆ کوردستان، ئەوەش شەرعیەت دانە بەواقیعی دابەشکردنی کوردستان.
نهێنی هێزی شێخ عوبێدوڵلا لەوەدایە بەهۆی کەسایەتیەکی کارزماتی جەماوەرێکی زۆری لەدەور کۆبووە بەمەش جولانەوەکەی بەراستی ببووە جولانەوەیەکی جەماوەری لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتی کارزماتی لەجولانەوەی کورد لەسەدەی نۆزدەو بیست بووە هۆکاری نوشستی چونکە بەکۆتایی هاتن یان بەمردن یان بەگرتنی سەرکردە شۆڕشەکەشیان کۆتایی هاتووە.

# پەراوێزو سەرچاوەکان

(*) جۆرە یەکدەنگیەك هەیە لەسەر ئەوەی بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا سەرەتای بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوایەتی کوردی بێت، بەڵام لەو تایبەتمەندیە کەم ناکاتەوە کەسروشتێکی لەو جۆرەی هەبێت کە دکتۆر باسی دەکات، چونکە هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم سەرکردایەتی بزاڤی نیشتیمانی کوردستان خاسیەتی کوردایەتی لەبەرگی ئیسلامەتی و ئیسلامەتی لەبەرگی کوردایەتی پێوە دیار بووە.

١-بۆ زیاتر بەدیارخستنی کاریگەری رۆژاوا لەسەر چاکسازیو تەنزیماتی ناو دەوڵەتی عوسمانی بڕوانە بەشی سێیەمو چوارەم لەکتێبی
Bernal Lewis, The Emergence of Modern Turky. London ;Oxford Univ ,Press.1961.

٢-صديق الدملوجي: امارە بهدينان، موصل،١٩٥٢.

ژمارە (١,٢)ی دەنگی .1، حکومەتەکەی شێخ مەحمود دەری دەکرد.

٣-بڕوانە ووتاری (کورستان لەسایەی دەسەڵاتی ئیتحادو تەرەقی) لە ئەم کتێبە.

٤-جویدە، ل٢٢٣-٢٢٢

٥- جویدە، ل٢٢٣-٢٢٤

٦-جویدە، ل٢٢٣

٧-ن.م. خالفین، خەبات لەڕێی کوردستان، ١٩٧١، ل١٦٧-١٦٨.

٨- جویدە، ل٢٦٣-٢٦٥

٩-جمال میرزا ، لەتاریکیەوە بۆروناکی، بەڵگەنامەکانی شۆرشی ١٨٨٠، سلیمانی، ١٩٩٩، ل١٦-١٧٠ . شێخ عوبێدوڵلا لە نەخشەی هێرشکردنە سەر تەورێزو گەماڕۆدانی شار مەبەستی بوو ئەمە وەکو کارتی گفتوگۆ بەکاری بهێنێت لەگەڵ حکومەتی مەرگەزی. بڕوانە: (Speer, 83).

١٠-میرزا عەزیز، ل٤٧-٤٩ لەمانگی ئابی ١٨٨١ حاکمی سابلاخ لێبوردنی بۆهەمزەو پیاوەکانی دەرکرد، ئەویش گەڕایەوە ئێران، لەکاتی سەردانی حاکمی سابلاخ

بەفەرمانی حکومەت بۆسەیەکیان بۆنایەوەو هەمزاغاو ١٣لەپیاوەکانی کوژران. حاکم سەری براوی هەمزاغای نارد بۆحاکمی ئازەربێجان (بڕوانە

FO,60\441 No ,2,telegram. From Abott to Thamson, Tarabzoon Augest, 31881.

11-Speer, 83-Speer, pp99-101, Jwaideh, pt,1 pp243-244

12-Y.A.Res Jamadud ula 20, 1298, (Abril, 19,1881); Y.A 4 Res/1299 h 2258 (August 21, 1882); Jwaideh, pt.1, pp.265-266.

١٣-عزیز شمزینی، جولانەوەی رزگاری نیشتیمانی کوردستان، وەرگێردراوی کوردی، ل٦٠. ئەو کۆمەڵە کوردیە لەکاتی پێکهێنانی ٤٠٠٠هەزار چەکداری کوردی لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا هەبووە ٢٠٠ چەکدار لەوانە لەکوردی ئێران بوون. بەماوەیەکی کەم توانی لق لەهەموو شارو گوندەکانی کوردستان بکاتەوە

14-78\8096 Inclosure 3 in.Erzerum, Teleg.No 27 D Stewart

١٥- کوردو عەجەم، ل١٧٤.

١٦- کوردو عەجەم، ل١٧٤.

17-The Forign Doctor, pp 83-84.

١٨-جویدە، ص ٢٦٦-٢٦٨.

19-Kurdish Natonalist Movement, p.274.

20- Kurdish Natonalist Movement, pp.270-274.

21-Enclosure in No. 6, Letter From Monseigneur Krimain to the Armenian Patriach Van June 20 1880, Turky No 5(1881) p.6.

22- in No. 6, Leeter from Moneigneur Krimian to Armenian Patriarch, Van June 20,1880, Tutky, No. 5, (1881) pp.6-7.

٢٣-جەمال میرزا عەزیز، ل٤٤-٤٥.

٢٤-جویدە، ص٢٤١.

٢٥- میرزا عەزیز، ١٣٦-١٣٧.

٢٦- میرزا، ل٣٤.

27-Y.A . Res\ 2199 H. Shawa17(Augest 21,1882)

٢٨-میرزا، ل٦-٧، ل٤٦-٤٧.

٢٩- میرزا، ل١١٠-١١١.

30-Res. Y.A 1297\11\9848 Teleg. Augest 18,1880Teleg.30 Aylul, 1296.(September 16, 1879)

٣١-میرزا، ل٤١.

٣٢- جویده، ٢٨٠-٢٨٣.

٣٣-سالح ئەمین، ل١٨٨، میرزا، ل٣٣.

34-FO 60\446 No. 34 Tabreez, Auguest 29,1882, fO 60\447 memo by Mirza Muhsin Khan,dated 6th july 1881.

٣٥- سالح ئەمین، ل١٩٥

# چاوپێکەوتنێکی دانسقەی مێژوویی لەگەڵ شێخ عوبێدوڵڵا

## فـەرمـــــاندەی راپەرینی کوردستـــــــان ۱۸۸۱

---

تـــــــــەوریز/ ۱۸۸۱/۱/۱ز

وەزارەتی دەرەوە، ژمارەی دۆسیە ٦٠/٤٤١

ژمـــــارەی بەڵگەنامە ٢٣ـ زۆر نهێنی

---

گەورەم ئیرڵ ئۆف کرانفڵ

پێشترو لەیادشتنامەی ژمارە ٢٧ ئاماژەمان بەمەسەلەی شێخ عوبێدوڵڵا کردبوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا شـەرەفمەندی بـوو بـۆمن لەسـاڵی رابـردوو نامـەم بۆناردن، ئێستاش هۆکاری مانـەوەم ئەو شـەرەفەیە کە لەئەستەنبوڵ چاوم بەشێخ بکـەوێ، لـەم رۆژانـەو لەناوەنـدە سیاسـیەکان سـەنگی خـۆی هەیـە، کورتەی ئەو چاوپێکەوتنەتان بۆدەنووسم کە لـەنێوان منو شێخ دا ئـەنجام درا، لەگەڵ پێشەکیەکی کورت لەباسی شێخ عوبێدوڵڵاو کەسایەتی ئەو، تکا دەکەم شایستەی بایەخ پێدانی ئێوە بێت.

لەسـاڵی رابـردوو (ورمـێ)م بەجێهێشـتو بەناوچـە کوردیـەکانو بـەلای نوێنـەری شـێخ عوبێـدوڵڵادا تێپـەڕیم، قسـەم لەگەڵـدا کـردن، ئامـادەیی شێخیان نیشاندا کە لەکاتی تێپەڕبوونم بەناوچە سنووریەکاندا پاسـەوانی تایبەتیم بۆدابین بکات، گومانم نـەدەبرد، ئـەوە منم بەئاراستەی سـەربازگەی شـێخ بـەڕێ دەکـەوم بـۆوەرگرتنی پاسـەوانی تایبـەت، دووبـارە ئـەوەش

ئەدەب و گەورەیی بوو من بۆخۆم لەدەوارەکەی سەردانی شێخ بکەم، لەپێشەوە سوپاسم کرد لەسەر ئەو بایەخەی بەپاراستنی منی داوە.

وادیار بوو شێخ سەردانەکەی گۆڕی بوو بۆسەعاتێکی تەواوی گفتوگۆی نێوان من و خۆی، گەرچی خۆم ئامادە نەکردبوو بەلام لەگەڵ گەیشتمە دەوارەکەی فەرمانی‌دا بەهەموو ئەوانەی لەدەوری بوون بچنە دەرەوە هەتا پێکەوە لەرەشماڵەکەداماینەوە.

دان بەوەدا دەنێم چاوم پێی کەوت زۆر سەرم سووڕما چونکە ئەو هەرگیز ئەو کەسە ترسێنەرە نەبوو کە کتێبی شین و سەرچاوەکانی‌تر بۆخەڵکیان وێناکردبوو.

سەرەرای ماندویەتی و مەینەتی رۆژگار بەسەر رووییەوە دەدرەوشایەوە و نەرم‌ونیانی بەڕووە بڕ سۆزەکەیەوە دیار بوو، لەچاوەکانی رامابای هەستی ناسك لەکەسایەتی سەرنج راکێشی رەنگی دەدایەوە.

ماندوویەتی و شوێنەواری نەخۆشی نەیان دەتوانی لەوورەی کەم بکەنەوە، ئەمەش بەڵگە بوو بۆکەسایەتی ئەو شێخەی زۆر کەس گەواهی بۆدەدەن کە بۆتە خاوەن شکۆی گەورە لەکوردستان، بەلام دەم و بەتایبەتیش بەشەویلاگی خواریی هەندێك جار مەترسی لێ‌دەباری بەبەراوورد لەگەڵ چاوە نیگابەخشەکانی کە بڕ سۆزو نەرمی بوون، بالای شێخ دەستە بوو، ئەوەی لەرووخساری بڕوانێت وادەزانێت تەمەنی لەچل و پێنج ساڵ تێ‌پەر نادەکات لەراستی‌دا زۆر لەوە بەتەمەنترە، ریشێکی کەم بۆیاخی رەشی کردبوو، ئەوەی لێی تێگەیشتم شێخ عووبێدوڵلا خاوەن ئیرادەو عەزم بوو، زۆر بەتوانا بوو لەکارتێکردنی دەوروبەری و بزواندنیان لەپێناو ئامانجەکانی‌دا، شێخ شارەزای زمانی عەرەبی و تورکی بوو بەلام

شـوێنەواری زمـانی دایـك (كـوردی) بەقسـەكانیەوە دیـار بـوو، هـەروەها شارەزایی فراوانی لەزمانی عەرەبی‌دا هەبوو.

ئاگاداریـان كردمـەوە شێخ زۆر شـادمانە بەگەیشـتنی مـن بە(ورمـێ) واتـە گوێبسـتی گەیشـتنی نوێنـەری حكومـەتی خـاوەن شـكۆ (پاشـایەتی) بـووە بۆناوچـەكە، ئەمــەی بەدەرفــەت زانــی هــەتا ئامانجـە شـاراوەكانی لەمـەڕ شاڵاوەكەی بۆخاكی ئێران بـەدیار بخات، بەقسـەی ئـەو نیـەتی پـاكی پـاڵی پێوە ناوە.

لەوەڵامـدا منـیش خۆشـحاڵی خـۆم بەناسـینی ئـەو دەربـڕی كـەزۆرم لەبارەیەوە بیستبوو چاوەڕێم نەدەكرد پشكم لەدیداری ئەودا هـەبێت. ئـەوەم دەربڕی خۆشحاڵم‌و ڕێزم هەیە بۆت كە ڕێزم لێ‌دەگری‌و بەناوبـژیوان قبوڵم دەكـەی لای ئـەو هاوڵاتیـە گـاورە نەسـتۆریە لادێیانـەی لـەماوەی شـەڕ لایەنگرانی شێخ تالانیان كردبوون. دواتـر پرسیارم لێ‌كرد بەرنامـەی چیە لەوڵامدا گوتی دەمەوێ دووبارە كوردسـتان ڕێك بخەمـەوە. پرسیارم لێ‌كرد چۆن بیر لـەو بیرۆكەیـە دەكاتـەوە لەكاتێكـدا هـیچ بیانوویـەك نیـە شـۆڕش لەدژی ئێران بكات یان بەڕووی توركیادا هەڵگەڕێتەوە. قسـەی لەسـەر ئـەو بابەتە كردوو ووتی هەردوو دەوڵەتی ناوبراو مامەڵەیان لەگەڵ كورد خراپ بووە، سەبارەت بەعوسمانی تقدیری نیەت پاكی ناكرێت، شێخ ڕای گەیاند كوردستان پێویستی بەكارگێڕیەكە بەدەستی ئاسنین حوكمی بكات، كەسێك نەبوو لەو ڕاستییە تێ‌بگات، لێرە بەشێخم ووت ئەمە زۆر ووردە، لێم پرسـی مەبەسـتی دامەزراندنی دەوڵـەتێكی سـەربەخۆیە لەدەوڵـەتی عوسمـانی یـان بەتـەنها ئامـانجی كۆكردنـەوەی ناوچـە كوردیەكانـە لەسـایەی ئیدارەیـەك بۆزاڵبـوون بەسـەر گـەڕەلاوژەیی‌و دابینكردنـی جۆرێك لـەئارامی‌و ئاسـایش لەناوچـەكەدا لەسـەرووی ئـەو ڕژێمـە ئیداریـەوە بێـت‌و لەبەرانبـەر سـوڵتان

بەرپرسیار بێت بۆزەمانەتی ئیدارەیەکی باش و کۆکردنەوەی باج.؟ شێخ لەوڵامی ئەو پرسیارەدا وتی کەسێك نیە گومانی هەبێت لەگۆێڕایەڵی من بۆسوڵتان بەڵام ئەو بەچاوی ڕێزو تەقدیرەوە سەیری بەرپرسان (پاشایانی هەرێمەکان) ناکات، بەڕاستی ئەو لەسەر ئەو قەناعەتە بوو کاتی ئەوە بەسەرچووە کارێك نەکرێت بۆبەرژەوەندی کوردستان. شێخ گەلەکەی خۆش دەوێت و بەپێویستی دەبینێت کاروباریان چاك بێت. ڕاستە کورد نەخوێندەوارن و حەز بەزەبت کردن ناکەن و لەبێسەرەوبەرەیی دان، بەڵام شێخ عوبێدوڵڵا دەیەوێت ئەو نەخۆشیە کۆمەڵایەتیە چاك بکات هەتا گەلەکەی بگاتە ئاستێك بگونجێت لەگەڵ ژیانێکی کۆمەڵایەتی شایستە بەئادەمیزاد. دواتر شێخ وتی مامەڵەی ئێران لەگەڵ کورد مامەڵەیەکی ریسواییە لەسێدارەدان و کوشتن و قینی لەرادە بەدەر، سەرەڕای ئەمە هەرچی مرۆڤ بەلای دا دەچێت لەخراپەکاری لەهەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی ئێرانیە، بەرانبەر بەکورد، هیچ ڕێوشوێنێکیان نەگرتۆتەبەر بۆمایل بوون بەلای هۆزە کوردەکانەوە، ئەمەش دەمارگیری کوردانی جۆشداوە هەتا ئاستی دواکەوتوویی.

لەگەڵ ئەوەدا لەو مەسەلانە لەگەڵ شێخ و بۆچوونەکانی کۆك بووم بەڵام ناچار بووم کات بەسەر بەرم و بێدەنگ بم، دەیوت ناوچەی (هۆجە) دەکەوێتە ناو سنووری تورکی -ئێرانی و لەژێر دەسەڵاتی تورکیایە، ساڵی رابردوو کەوتبووە بەر شاڵاوی تاڵان و دەستبەسەراگرتنی هۆزی شکاك و ئەو هۆزە کوردانەی لەئێران دەژین. هەتا ئێستاش حکومەتی ئێرانی هیچ ڕێوشوێنی نەگرتۆتەبەر بۆئەو شاڵاوانە. هەروەها دەرفەتی شێخ نەدراوە کارێك بکات بۆبەرگری لەهۆزە زیان لێکەتووەکانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا (عوسمانی = وەگێڕی عەرەبی) لەدرێژەی قسەکانی دا شێخ عوبێدوڵڵا

دەیوت هۆزی شکاك سەرچاوەی نائارامی ناوچەکەن، بەتەنها بۆهۆزەکانی ژێردەسەڵاتی شا لەناوچەی (سەلماس) بەڵکو هەمان دەستدرێژیشیان لەدژی هۆزە کوردیەکانی ژێردەسەڵاتی سوڵتان لەتورکیا بەتایبەتی لەناوچەی (الباغ) ئەنجام داوە، بۆنمونە بەم دوای‌یە لەناو خاکی تورکیا تاوانیان کردووەو هێرشیان بردۆتە سەر ئەرمەن. ناتوانین وەسفی خراپەکاریان بکەین لەبڵاوکردنەوەی ویرانی لەناو خاکی بەرفراوانی ناوچە سنووریەکان، حکومەتی ئێرانی هیچ زیانی زیان لێکەوتووانی نەبژاردووە. بەناوی شاڵاوی ناوبراوەوە بەرتیلی زۆریان لە سەرۆکی شکاك وەگرتووە. بەرپرسانی ئێرانی بۆلابردنی لەکەی ئابڕۆیان لەئازەربیجانەوە گەڕانەوە بۆتاران‌و راپۆرتێکی پڕ لەدرۆیان دا بە(شا)و دەریان بڕی کەسزای سەرۆکی هۆزی شکاکیان داوەو کەوتوونە پڕوپاگەندە بەوەی نیزام‌و ئارامی‌و ئاسایش لەناوچە سنووریەکان بالادەستە.

بۆیە شێخ رای‌گەیاند کە لەسنوور پەڕیوەتەوە بۆناو خاکی ئێرانی بەمەبەستی وەستاندنی ئەو پێشێلکاری‌و زوڵمەی کراوە دەرهەق بەو هۆزە کوردانەی لەژێر دەسەڵاتی تورکیا نیشتەجێن. هەروەها رای‌گەیاند گۆێڕایەڵی تەواوی سوڵتانە، دواتر پرسیارم لێ کرد ئەگەر نیەتی فراوانکردنی شۆڕشەکەی هەیە بۆناوچە کوردیەکانی توورکیا ئەوە ریشەی ئەم کارە مەترسیدارەو سوور بووم ئامۆژگاری بکەم لەڕێگەی میرکور (میرکەوە = وەرگێڕی عەرەبی) بکشێتەوە بۆنیشتیمانی ئەسڵی خۆی، وەڵامی شێخ ئەوە بوو وشەیەکی حکومەتی ئینگلیز بەسە قەناعەت بهێنم لەهەموو خاکی ئێران بکشێمەوە، من بەبیرم هێنایەوە چالاکیە جەنگیەکانی ئەوی خستۆتە هەڵوێستێك بەهیچ شێوەیەك نەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانی‌و هەتا نوێنەری حکومەت

لەتاران هەبێت. هەروەها بۆم روونکردەوە کەدەسەڵاتی ئاگربەستی نێوان ئەوو ئێرانم نیە بەو سیفەتەی نوێنەری حکومەتی بەریتانیم لەبارەگای مانەوەی وەلی عەهدی ئێرانی (لەئازەربێجان)، ئەو پەڕی نائارامیو ناڕەحەتی خۆم لەشاڵاوەکەی شێخ بۆناو خاکی ئێران دەربڕی، پێم ووت ئەگەر ئەو بەکردەوە سکاڵای لەدژی حکومەتی ئێرانیو توورکی هەیە ئەوە کردەوەکانی ئێستای (هێرش بۆسەر هێزەکانی کوردستانی ئێران = وەرگێڕی عەرەبی) لەهیچ حالەتێکدا لەبەرژەوەندی ئەو دانیە، بەبیرم هێنایەوە ئەگەر سوور بێت لەهێرشەکانی بەئاراستەی تەورێز لەوێ دەکەوێتە بەرانبەر بەرگری هێزەکانی رووسی، ئەوکات لەوێ پڕوپاگەندەی ئەوە هەبووە رووس هێز لەناوچە سنووریەکانی نزیك ئاراس (سنووری ئێرانی - رووسی) کۆدەکاتەوە.

وڵامی شێخ ئەوە بوو ئەگەر رووس هێرشی بۆبکات خۆی لەباوەشی ئینگلیز دەهاوێ، پێم وت مەحاڵە پشت بەهاوکاریو پشتگیری ئێمە ببەستێ، پێویستە ئەوە بزانی پەیوەندی پتەو لەنێوان بەریتانیاو حکومەتی ئێرانیدا هەیە، حکومەتی بەریتانی رازی نابێت ئێران (وڵاتی هاوپەیمان) لەهەر لایەك بێت تووشی دەستدرێژی بێت. دوایی هاتینە سەر مەسەلەی ئەرمەن، نیگەرانی زۆری دەربڕی لەچارەنووسی ئەرمەن کە هەڕەشەی لەناوچوونیان لەسەرە. پرسیارم لەشێخ عوبێدوڵڵا کرد کەئەگەر لەبەرنامەکەی سەرکەوتو ئەوەی ویستی بۆی هاتەدی چیدەکات بەئەرمەن؟ ئەوەشم بۆروونکردەوە حکومەتی بەریتانی چاودێری جالیەی مەسیحی دەکاتو رێگە نادات هیچ جۆرە چەوسانەوەیەك لەدژیان بکرێتو رازی نابێت لەهیچ حالەتێك وەکو گەلێك لەناوچەکە لەناو ببرێن.

شێخ خێرا وڵامی دایەوە ئەگەر کوردستان لەئەو بەرپرسیار بێت ئۆباڵی زەمانەتی مامەڵەی باش دەکات لەگەڵ ئەرمەن، لەوێ هیچ ئاستەنگێك لەبەرانبەر ئەرمەن نیە ئەگەر بیانەوێ کۆچ بکەن بۆشوێنەکانی‌تر.

ئەم وڵامەم بەلێڵ دانا بۆیە وازم لێهێنا بێ‌ئەوەی هیچ بڵێم، دوایی شێخ تکای لێکردمو سووربوو داواکاریەکەی بگەیەنمە حکومەتی بەریتانیو جەختی لەسەر ئەوە دەکرد ئەمڕۆ پێویستی بە بەدەستهێنانی پشتیوانی مەعنەوی بەریتانیایە بۆ پڕۆژە تایبەتیەکەی لەرێکخستنەوەی کوردستان.

وتم لاریم نیە لەگەیاندنی ئەو قسانەی نێوانمان بەنەزارەتی حکومەتی بەریتانی لەکاتێکی گونجاودا بەڵام رێگە بەخۆی نەدا ببێتە پێ‌پەستی خەونو خەیاڵاتی دوور لەراستی، بەبیرم هێنایەوە خەونە سیاسیەکانی زۆر دوورن لەوەی لەواقیع لێك بدرێتەوەو بێتە دی، هەرچەندە رەزامەندیشم دەربڕیوە لەگەیاندنی داواکاریەکانی بەحکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانیا.

لەوکاتەی قسەمان گەیشتە ئەو خاڵە، لەو بڕوایەدابووم ئێستا گونجاوە بەزمانێکی روون شێخ بەم چەند قسەیە ئاگادار بکەمەوە لەهەڵوێستی دروستی خۆم لەسەر بەرنامەکەی ئەو : هەتا ئێستا هەست بەلێڵی دەکەم لەو بەرنامەیەی بۆمنتان خستە روو، لەو کاتەی دەیخەمە بەردەم حکومەتی بەریتانیا ناتوانم بیکەمە وێنەیەکی باش چونکە حکومەتەکەم پشتیوانی لەهیچ پرۆژەیەك ناکات زیان بەبەرژەوەندی هاوپەیمانەکەی (ئێران) بگەیەنێت، هەروەها پشتیوانی مەعنەوی هیچ نەخشەیەك ناکات زیان بەبەرژەوەندی جالیەی مەسیحی بگەیەنێت لەناوچەکەدا، هەروەها نامانەوێت بەرژەوەندیەکانی ئەرمەن بێتە دی لەسەر حیسابی بەرژەوەندیەکانی کورد، دووبارە قبوڵی ناکەین بەرژەوەندیەکانی کورد بێتە

دی لەسەر حیسابی بەرژەوەندیەکانی ئەرمەن، پێم ووت من وەکو خۆم ئەو ڕێزە لەبیر ناکەم کە لەمنتان نا هەروەها بەم شێوەیە ئامۆژگاریتان دەکەم.:-

بەڵگەی تەواوم بدەیە لەسەر ئەندازەی گوێڕایەڵیتان بۆفەرمانەکانی سوڵتان، هێزەکەت لەخاکی ئێران بکشێتەوەو بگەڕێتەوە شوێنی ئەسڵی خۆتان لەتوورکیا، ئەگەر قەناعەتی سکالات هەیە بیخەمە بەردەم نەزارەتی دەوڵەتی خۆتان هەتا یەکەم جار سوڵتان ئاگادار بکەمەوە لەنەخشەو بەرنامەکەت، پێشبینی هیچ هاوکاری یان پشتگیری لەحکومەتی بەریتانیا مەکەو کارێك بکە لەپێناو چەسپاندنی ئاسایش‌و ئارامی ناوچە سنووریەکان، تێبکۆشە لەپێناو پشتیوانی لەماف هاولاتی بۆمسولمان‌و گاورەکان بێ‌جیاوازی. گیانی نیزام‌و توندو تۆڵی لەناو کورددا بلاو بکەوە، هەروەها پێم وت ئێمە گرنگی بەبەرژەوەندی کورد دەدەین بەئەندازەیەك کەمتر نەبێت لەو گرنگیەی بەبەرژەوەندی ئەرمەنی دەدەین، ئەمە ئامانجی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانیە کەپشکی لەشکۆمەندی ئەو کارەدا هەیە، حکومەتەکەم خۆشحاڵە ئەگەر کارێکتان ئەنجام دا بەقسەی ئەو بێت، ئەگەر دەتانەوێ بەچاوی سۆزەوە سەیری داواکانتان بکرێ ئەوە ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر شانتان هێنانی بەڵگەی قەناعەت پێ‌کراوی دەوێ کە ئێوە بەوپەڕی دڵسۆزی کاردەکەن لەپێناو ئامانجە سەرەکیەکانی بەریتانیا لەناوچەکە. هەروەها پێویستە لەسەرتان گوێڕایەڵی بۆسوڵتان بسەلمێنن(*).

هەتا ئێستاش هیچ نوێنەرێك لەنوێنەرانی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی وەکو من ئەو دەرفەتە زۆرەی دەست نەکەوتووە لەنزیکەوە بۆدابیکردنی هەڵسەنگاندنی بابەتیانە لەسەر ئامانجەکانی شێخ عوبێدوڵلا قسەبکات کەئێستا وا لەکەسایەتیە ناودارەکانی پایتەختی توورکیا بێت،

شۆڕشەکەی کارێکی وا ئاسان نیەو ئەگەری ئەوەی هەیە ڕۆڵی هەبێت لەسیاسەتی ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی عوسمانی. ساڵێك بەسەر گفتوگۆمان تێپەڕی لەدەوارەکەی ئەو مـن هەڵسـام بەرێکخسـتنی تێبینیەکانمو نووسینی ئەو گەشتەی بەناوچە کوردیەکاندا کردم. هەوڵم دا فشار لەسەر خۆم دروست بکەم بۆ وتوویێژو دووبارە داڕشتنەوەو نووسینەوەی لەسەر شێوەی یاداشتنامەیەك بۆ بەڕێزتان، ئەمەش لەدوای ئاماژە کردنی بەڕێزتانە بەو بابەتە.

شاراوە نیە لەلامان گرنگیدانی بەرچاو بەبەرژەوەندیەکانی ئەو ئەرمەنانەی لەناوچە کوردیەکان دەژین لەئەولەویاتی سیاسەتی بەریتانیایە لەناوچەکەدا لەسەر ئەوە سەرنجم داوەو کاتی ئەوە نەماوە یاداشتنامەتان بۆبنووسم بەو هیوایەی ئەمە بەسوود بێت بۆبەدیهێنانی ئەو ئامانجە ئاشتەوایە من ناتوانم حوکم بدەم لەسەر ئەندازەی راستگۆیی قسەکانی شێخ عوبێدوڵلا، ڕۆژانی ئایندەو ئەو ماوەی لەئەستەنبوڵ مامەوە ئەندازەی دڵسۆزی تیا دەبینم بۆسوڵتان، هەتا ئەگەر حوکمان دا لەسەر بێمتمانەیی قسەکانی ئەو لەسەر گوێڕایەڵی لای سوڵتان ئەوە لەقورسایی سیاسیو ئاینی ئەو لەکوردستان کەم ناکاتەوە، قەناعەتم وایە وا باشترە بۆحکومەتی سوڵتان هەوڵ بدات کاریگەری لەسەری هەبێت لەرێگەی چاودێری جولانەوەکانیو دڵنیا بوون لەمەبەستی داهاتووی، لەجیاتی ئەوەی بەرەقی مامەڵەی لەگەڵ دا بکات لەسنووری توورکی. ئێرانی دوورخراوەتەوەو وا چاکە لەداهاتوو رێگەی پێنەدرێت تەئسیری هەبێت لەسەر کورد بەجۆرێ ببێتە هۆی تێکدانی ئەمنو ئاسایش لەئێران، لەسەرەتاوە ئەستەم بوو بۆحکومەتی سوڵتان سنوور بۆچالاکیەکانی دابنێت بەلام ئەو با ئەم کاتە ئەوە نەورووژێنێت، ئێستا بۆپیاو قورسە هیچ بنەمایەك لەو دادگەریە

بەدەست بهێنێت کە سوڵتان بۆسزادانی پشتی پێدەبەستێ. لەکۆتایی هیوادارم ئەوەی پێشکەشم کردن و ئەوەی وتم جێگەی ڕەزامەندی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بێت.

دڵسۆزو خزمەتکاری گوێڕایەڵتان

ولیم ا. ئابووت (قونسوڵی ئینگلیز لەتەوریز= وەرگێڕی عەرەبی)

==========================

(*) ئەوە بەریتانیا و وڵاتانی زلهێزیتره سیاسەتی چەسپاویان هەبووە لەناوچەکەو ئەوەش سەکردە کوردەکانن لەو قەناعەتەدان بەموجامەلە خواستەکانی میللەتەکەیان بەدی‌دەهێنن. لەراستی‌دا قونسولیەکی بەریتانی وورد ئاگاداری مەسەلە ستراتیژیەکانی وڵاتەکەی هەیەو نەخشەیان روونە بەڵام هەمیشە کورد بووە ستراتیژیەتی ئەوانی نەناسیووەو خەونی گەورەی لەسەر هۆکاری دەولی بنیاتناوە، تێگەیشتن لەسروشتی تێکگیران لەنێوان خواستی کوردو ستراتیژیەتی ئەوان پێویستە بۆتێگەیشتن لەئەندازەی پشتبەستن بەفاکتەری دەولی یان مەترسی ئەو فاکتەرە لەسەر خواستەکانی کورد، دەشگونجێت بەشێکی ناوەرۆکی ئەم بەڵگەنامەیە جێی گومان بێت چونکە کەس بەدیاریانەوە نەبووە.

## بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی

FO\ 146
Letter ١٨٨٢/١٢/٧

(هەوڵی شێخ عوبێدوڵڵا بۆهەڵاتن)

شادمانم ئەو هەواڵەتان پێدەدەم کە شێخ عوبێوڵڵا هەڵات و دووبارە گیرایەوە، شێخ و دوو لەکوڕەکانی لەبن دەستی پاسەوانی هێزەکانی عوسمانی بەڕێوبوون بۆموسل، هەتا بتوانین لەم هەموو هەواڵە لێڵ و تێکگیراوانە بگەینە راستی بڕیارماندا میرزا جەوادخان بنێرین بۆهەکاری هەتا لەوێ پەیوەندی بکات بەموسا پاشای فەرماندەی سەربازی و راستییەکان روون بکاتەوە، راپۆرتی میرزا خان کە بەنامەی نێردراوی موسا پاشا و مستەفا پاشا (دوو فەرماندەی سەربازی عوسمانین لەهەکاری = نووسەر) دڵنیامان دەکاتەوە لە ووردەکاریەکانی و دەنووسێ :-

لەدوای زنجیرەیەك لەخۆخافڵاندن و هەوڵی دواخستنی سەفەر بۆموسڵ، شێخ عوبێدوڵڵا رازی بوو بەیاوەری کامیل بەگ نێردراوی تایبەتی سوڵتان و چەند سەربازێك سەفەر بکات. کاتێك گەیشتنە گوندی شەبتان ئەوناوچەی پڕە لە هۆزەکوردیەکانی لایەنگری شێخ . لەوێ شێخ بەبیانووی نەخۆشی هاوسەرەکەی و بیانووی‌تر سەفەرەکەی راگرت بەو هیوایەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە پەیوەندی پێوە بکەن بۆشۆڕش و لەدیلی رزگاری بکەن. کامیل پاشا بۆی دەردەکەوێ شێخ نایەوێ بەردەوام بێت لەسەفەر بۆموسڵ هەڕەشەی لێدەکات کەلەبەرانبەریدا رێوشوێنی توند دەگرێتە بەر، ئەمە وای لەشێخ کرد داوا لەسەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە بکات کامیل پاشا و سلێمان پاشا بگرن. لەو ماوەیەدا کوڕی حەسەن بەگ (یەکێك بووە لەلایەنگرانی

شێخ عوبێدوڵلا) هەوڵی کوشتنی کامیل پاشا دەدات، تیرێکی لێداو ساقۆیەکەی دڕاو بەسەرسوڕمان رزگاری بوو بەڵام ئازاری پێنەگەیشت. بەو شێوەیە سەربازو ئەفسەرە تورکەکان بوونە دیل لەلای شێخ. پێش ئەوە عەبدولقادری کوڕی بەرووداوی شەبتان بزانێت و هێزێک بنێرێ بۆرزگارکردنی باوکی کامیل پاشا بەبەرتیل دوو کەس دەنێرێت هەواڵ بدەنە موسا پاشاو مستەفا پاشا بەزوویی هێزێکی سەربازی بنێرنە ناوچەکە، هەر لەو ماوەیە شێخ عوبێدوڵلا سەر لەنوێ کەوتەوە خۆئامادەکردنی شۆڕشی کوردی و بۆئەو مەبەستە پەیوەندی بەهۆزەکانەوە کرد. بەڵام خێرا هێزەکانی عوسمانی گەیشتنە ناوچەکەو شەبەتان و شێخ عوبێدوڵلایان گەمارۆدا. هێزەکانی عوسمانی بەتۆپ لەشەبتانیان داو نزیکەی دوو سەد کەس لەهێزەکانی شێخ عوبێدوڵلا کوژرا ئەوە شێخ عوبێدوڵلای ناچارکرد یەکێک لەلایەنگرانی بنێرێتە دەرەوەی قەلا و ئالایەکی سپی بەرز بکاتەوە، بەمە شێخ دەیویست خۆی بەدەستەوە بدات. بەماوەیەکی کەم یەکێک لەئەفسەرەکانی سوپا بەناوی حوسێن پاشا هات بەرەو قەلا و شێخ عوبێدوڵلا هاتە دەرەوەو داوای خۆبەدەستەوەدانی کرد. حوسێن بەگ تفی کرد بەرووی شێخ و بەهێز بەسەری رایکێشا بۆئیهانەکردنی داوای لێکرد لەناوەڕاستی کۆمەڵە سەربازەکە بوەستێ. حوسێن پاشا کامیل بەگی رزگار کردو بایدایەوە بەلای شێخ و کەوتە جوێن دان بەشێخ بە(ئێزیدی) و (بەران) ئیهانەی کرد، شێخ رووی لەکامیل بەگ کرد یارمەتی بدات بەڵام ئەو وتی هەتا ئێستا سەرکۆنەی زۆر کراوم لەسەر رێزو مامەڵەی باش لەگەڵ شێخ . بەشێخی ووت کردەوە ناشیرنەکانت شایستەی لێبووردن نیە جوێنی بەشێخ دا بەوەی لەبەراز خراپتری . موحەمەد سادقی کوڕی شێخیش گیراو

هێزەکانی عوسمانی باری ٣٠٠ هێستری شێخ عوبێدوڵڵایان دەست بەسەرداگرت‌و کەلوپەلی خەڵکی شەبەتانیان تالان کرد. ئەو کوڕەی حوسین بەگیان گرت کەپێش ماوەیەك بەتیر هەوڵی کوشتنی کامیل بەگی دابوو. مەلا ئەحمەدیش دەگرن کە یەکێك بوو لەو زانایانەی دەرسی شەرعی بەکوڕەکانی شێخ عوبێدوڵڵا دەوت لەنەهری‌و ئیمامی مزگەوتی نەهری بوو. هەروەها قاچ‌و دەستی شێخ عوبێدوڵڵایان بەستنەوەو بەئیهانەو بەسواری کەرو بەهێزو پاسەوانی عوسمانیەوە بردیان بۆ موسڵ. وەهاب ئەحمەد بەدرخان‌و سەرۆك هۆزە کوردەکانی لایەنگرانی شێخ هەموو دەگیرێن. شێخ عەبدولقادریش بیستی چی بەسەر باوکی هاتووە ناچار خۆی دابەدەستەوەو داوای لەلایەنگرانی کرد بڵاوەی لێبکەن. ئەمیشیان گرت‌و لەگەڵ باوکی رەوانەی موسڵیان کرد. بەو شێوەیە موساو مستەفا پاشا بەیەکە سەربازیەکانیانەوە گەڕانەوە دوای ئەوەی ئەرکی خۆیان لەگواستنەوی شێخ‌و بنەماڵەکەی بەهێزو سەربازی تەواوەوە بەزەمانەتی سەلامەتی گەیاندە موسڵ .

ئێستا شای ئێران بەبیستنی ئەو هەواڵە زۆر دڵخۆشە کاروباری نیوان ئەو دوو وڵاتە دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی. منیش لەسەرمە بۆراپەڕاندنی هەندێ ئەرك بچمە تەورێز.

ئیمزا: میرزا جەواد خان

Y.A.Res

1298-5-18/H. 1064

وێنەی یاداستنامەی وەكالەت

**ئـەو بروسـكەی خسـتمانە بـەردەم مـەقامی حـەزرەتی مـەلانا سـوڵتان كەشاهیدو بەدواداچوونی تایبەتی ئەحمەد راتب پاشای یاوەری سوڵتانی لەموسڵ لەخۆگرتووە، لەسەر شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی وێنەیمان ناردووەو لـەدوای ئاگـاداری ئەنجومـەنی راسـپێردراوی تایبـەت بەگرتنـە بـەری رێوشـوێن‌و مامەڵـەی پێوسـت بڕیـاری‌دا . بـەپێ‌ی یاداشـتنامەی عللیـەی عوسمانی تایبەت بەگلەیینامـەی باڵا بەبروسكەی ناوبراوەوە ناردمان، ئەم یاداشتنامەمان ئامادە كرد بۆ بەعەزم بوون لەسـەر جێ‌بەجێكردنی ئیرادەی سوونی لەو بارەوە.**

**١٨جومادی یەكەمی ساڵی ٩٨، ٤ی نیسانی ساڵی ٩٧، (١٦ی نیسانی (١٨٨١)**

**سەعید**

وێنەیەك وەكو خۆی

## وێنەی پەراوێز

مەحزەرەی ئەنجومەنی وەكلا هاوپێچی نمایندە بۆ سكالانامەی بالا كەموقامی بالا لێی ئاگادارە، لەو رووەوە وەكو بەدیار دەكەوێ ئەگەر عوبێدوللا ئەفەندی بەزۆر بهێنرێتە خانەی سەعادە ئەوە ناچار دەبێت پەنا بەرێتە بەر ئێران، نەزارەتی دەرەوە لەگەڵ باڵوێزخانەی ئێرانی تەخویل كراوە قسە بكەن لەگەڵ ئێران هەتا داڵدەی نەداو دژی ئێمە بەكاری نەهێنێت، موشیریەی هەمایونی لەشكری چوارەمو ولایەتی وان ئاگادار كرانەوە بەناوی حكومەتی سوونی لەو شوێنانەی پێویستە ئاگاداری بڵاوبكەنەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەوەی شێخ لەرابردوو بڵاوی كردۆتەوە، هەروەها ئیرادەی سوونی مشیریەی ناوبراوی ئاگادار كردۆتەوە هەوڵبدات نەیەڵێ شێخ پەنا بەرێتە بەر ئێران، مەحزەرەكە بگەڕێنێتەوە بۆشوێنی خۆی.

٢٠جەمادی یەكەمی ساڵی ٩٨ و ٨ نیسانی ساڵی ٩٧ - وێنە وەكو هی ئەسڵیەكە

## بروسکەی ئەمیر لیوا تۆفیق راتب پاشا یاوەران

حەزرەتی مەولانا سوڵتان ئێستا لەو دەڤەرەیە بەفەرمانی هەمایونی ئەو پەیوەندیانە ئەنجام دەدات، ئەنجومەنی ئێمە بەدواداچوونی کردووە لەسەر بانگەشەی شێخ عەبێدوڵڵا ئەفەندی بەدواداچوون تەواو بوو لەگەڵ بیرخەرەوەیەکی تایبەت بەئیرادەی سوونی، کورتەی بروسکەکە ئەوەیە شێخی ناوبراو ئامادەیی خۆی نیشان داوە بەپیر داوای سوونیەوە بێت بەڵام هەندی ترسی ماوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیە فەرمانی لەو جۆرە قبوڵ بکات، بەڵام مەبەستی نیە سەفەری خانەی سەعادە بکات بەڵکو خۆی سوود لەکات وەردەگرێت هەتا ئەوەی دەیەوێ ئەنجامی بدات، ئامادەکاریو دەستدرێژیەکانی بەبۆچوونو رێنومایییەکانی بەناوی دەوڵەتی عیللی نیگەران کردووە، لەوە دەترسێت ئەو دەنگو باسی بانگەوازی دەوڵەتی سوونی بگاتو بۆخەڵکی دەربکەوێ کردەوەکانیو ئەوەی رایگەیاندووە پێچەوانەی رەزامەندی باڵایە، ئەوکات خەڵکی لێدوور دەکەوێتەوە. هەندێ لەهۆزەکانیش لێی دەکشێنەوە، بەمەش تووشی وازهێنانو بێئومێدی دەبێت، لەو روانگەوە کوردستان بەجێدەهێڵێتو لەبەرژەوەندی نابێت بمێنێتەوە، ئەگەر لەرێگەی پەیوەندی بەئێرانیەکانەوە داوای ئەمانی کرد کە لەوانەیە پەنا بەرێتە بەر ئێران، دەبێت زەمانەتی ئەوە هەبێت بەرەسمی ئەوە بەدەست نەیەت. ئەنجومەنی تایبەت بەشێوەیەکی روون لەوکارەی کۆڵیوەتەوە. ئەنجومەن وای دەبینێت رووس هاوشانی ئێرانیەکان نیگەرانە لەجولانەوەو کردەوەکانی، بەرەسمی ئەوەیان گوتووە ئەگەر دەوڵەتی عیللی

ڕێوشوێنی گونجاو نەگرێتە بەر ئەوە ناچار دەبن بەدوای بکەون. لەکاتێکدا شێخ خۆی بەجۆرێك لەجۆرەکان هەڵخەڵەتاوە. لەبنەڕەتەوە بانگەشەی سوونی لەسەر بڕیاری ئەنجومەنی ئێمە لەو بارەیەوە دەیەوێت بەڕێگەیەکی گونجاو دوور بخرێتەوەو سنوورێك بۆئەو سکالآیانە دابنرێت. بەلآم بەدڵنیایی شێخ بەرەزامەندی خۆی سەفەری خانەی سەعادە ناکات، ئەگەر ناچاری سەفەر بکرێت پەنا دەباتە بەر ئێرانیەکانو لەو حالەتە دژی ئێمە بەکاری دەهێنن، ئەو سکالآیانەی لەئێرانیەکان بەر گوێمان دەکەون ئەوە پێویست دەکات یەکەم جار لەگەڵ ئێرانیەکان وتووێژ لەسەر ئەو بابەتە بکەین، چونکە هەوڵ بۆدوورخستنەوەی شێخ لەئەنجامی سکالآی ئێرانیەکانە دژی ئەو، لەحالەتی ناچارکردنی پەنادەباتە بەر ئەوان، بۆیە لەسەریانە زەمانەتی رەسمی بدەن کە قبوڵی ناکەن. ئەگەر ئێران ئەو زەمانەتەیان نەدا دەبێت واز لە سکالآ بهێنن. لەحالەتی زەمانەت دانی ئێرانیەکان ئەوە دوورخستنەوەی شێخ زەرووری دەبێت. ئەنجامدانی ئەو کارە لەسەر وەلآمی ئێرانیەکان وەستاوە، شێخی ناوبراویش بۆهەڵخەڵەتاندنی هۆزەکانی دەوروبەری رایگەیاندووە ئەو کارانە بەرەزامەندی دەوڵەتی عیللی دەکات. ئەوانەش کەدەبیستن وەلی ئەمر بەکارەکانی رازی نیە لێی دەکشێنەوە. موشیریەی لەشکری هەمایونی چوارەمو ولایەتی وان بەبروسکە ئاگادارمان کردوونەوە بەبڕیاری ئەنجومەنمان ئەو قسانە بەدرۆ بخەنەوە. بۆیە وای دەبینین ناکۆکیو دووبەرەکی بکەوێتە نێوان ئەوو هۆزە هەڵخەڵەتاوەکان. لەحالەتی رەزامەندی مەقامی بالآ دەسەلآت دەدرێتە نەزارەتی دەرەوە لەگەڵ سەفارەتی ئێرانی قسە بکاتو موشیریەتو ولایەتی ناوبراو ئاگادار بکرێنەوە بەناوی

**حکومەتـەوە راگەیانـدن بڵاوبکەنـەوە بـۆ ئـەو بـەدرۆ خسـتنەوەی قسـەکانی شێخ.... لەهەموو حاڵەتاندا فەرمان بۆخاوەن فەرمانە**

**١٨ی جەمادی یەکەمی ساڵی ٩٨و ٥ی نیسانی ٩٧ (١٦ی نیسانی ١٨٨١)**

**ئیمزاکان**

بیرخەرەوەی نەزارەتی دارایی بەڕێز خراوەتە ڕوو لەسەر روونکردنەوەی ولایەتی هەکاری بەوەی پێویستە بکرێت بۆعەریزەی عەبدولقادر ئەفەندی کوڕی شێخ عەبێدوڵڵا بەگ کە موچەیەکی کەڵەکەبووی مانگانە بەئەندازەی چوار هەزارو پێنج سەد قورش هەیە بەشێوەی کاتی دانرابوو بۆباوکی لەسالآنی نەوەدو شەش‌و نەوەدو حەوت داوا دەکات بەحیسابکردنی سەدو هەشت هەزار قورشی‌تر کەهی هەندێ لەخزمەکانی شێخ بووە بەناوی دەیەك‌و میرانەی مەڕومالآتی ئەو سالآنە. هەروەها داوا دەکات ماوەی مانەوەی لەخانەی سەعادە موچەی مانگانەی بەپێی ئیرادەی سوڵتانی بەشیوەی کاتی بۆخەرج بکرێ کەلە مانگی ئازاری سالی نەوەدو هەشتە، چوارهەزارو پێنج سەد قورش لەو پارەیەی پێشوو بەشێوەیەکی کاتی هەڵوەشاوەتەوە بەو ئیعتیبارەی بەهۆی مانەوەی ئەو پیاوە لێرە راگیراوە کە دەکاتە دیاریکردنی موچەی دوایین مانەوەی لێرە، مەجالی حیسابکردنی کەڵەکەبووی هەردوو سالی نەوەدو شەش‌و نەوەدو حەوت نیەو لەخزمەکانی داواکراوە، کەهەلآتووەو پێویستە موچەی رابگیرێت، ئەم بیرخەرەوەیەم ئامادەکردووە بۆروونکردنەوە هەتا رەوانەی نەزارەتی ناوبراو بکرێت ، ئەوەی تائێستا ماوە حیسابی بکات‌و ئەوەی دەمێنێتەوە بەتەواوی لەسەر فەرمانی هەمایونی بیبڕێت.

٧ی شەوالی سالی ٩٩و ٩ئوغستسی سالی ٩٨(٢١ی ئابی ١٨٨٢)

سەعــــید

Y.A. Res/ 1299- H – 225

باسی ئەو بروسکەی لەولایەتی هەکاری هاتووە لەسەر هەڵاتنی شێخ عوبێدوڵڵا بەبێ روخسەت ئێستا پێویستە فەرمانی باڵا دەربچێت بۆروونکردنەوە بەناوی حەزرەتی مەولامان سوڵتان، ئەوەی لەبروسکەدا بەدیار دەکەوێ شێخی ناوبراو هەندێ ئاگاداری بڵاوکردۆتەوە بۆزەمینەسازی گەڕانەوە، ئەم هەواڵە وابڵاوبێتەوە کەپێچەوانەی رەزامەندی باڵایە هەتا خەلکی دەورووبەری هەڵنەخەڵتێنێت بۆجێبەجیکردنی خواستەکانی. لەکاتێکدا فەرمان دەرکردن بۆفەرمانی باڵا و ناردنی کاتێکی زۆر بەپیرۆ دەدات. ناردنی فەرمانی باڵا لەو بارەیەوە بەبروسکە دەوەستێتە سەر ئیرادەی سوونی حەزرەتی مەلانا سوڵتان. ئەو بروسکەیەمان بۆئەو مەبەستە تەرخان کردووە

٩ی شەوالی ساڵی ٩٩و ٩ی ئۆغۆستسی ٩٨

سەعید پاشا

بەڕیوەبەرایەتی سەرۆکایەتی وەزیران – ژووری برووسکە

وەڵامی بروسکەی ولایەتی وان

دوێنی و لەپێشتریش ئەوەمان روونکردەوە و ئاگاداریمان بڵاوکردەوە کەشێخ لەناو خەڵك نەمتمانەی هەیەو نە بەقسەی سەدری ئەعزەمو نە بەقسەی ئەنجومەنی وەزیران دەکات، بەتەنها بەفەرمانی حەزرەتی مەولامان سوڵتان دەجوڵێتەوە، دەمانەوێ ئەوە روون بکەینەوە دەرکردنی فەرمانی بالآ بۆراگەیاندنی هەلآتنی شێخ بەبێ مۆڵەتی حەزرەتی مەولامان سوڵتان چووە بۆئەوێ. گرتنە بەری رێوشوێنی هەر سزایەك بۆ ئەو بەناوی حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەتەوە دەبێت. ئەمەش بەرای نەزارەتی بالآیە

٩٩ و ٩ئۆغۆستسی ٩٨ (٢١ئابی ١٨٨١)

موحەمەد حیلمی

17\53 Y.A. Res

ساحێبی دەوڵەت

ئاشکرایە لەلای دەوڵەتانو پێشتر بەمێژووی ٧ی شەوالی ساڵی ٩٩ بەبڕینەوەی ئەوەی لەپێشوو وەکو موچەیەکی مانگانەی چوار هەزارو پێنج سەد قورشی بۆ شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی دیاری کرابوو، ئەوەش بەم دواییە لەماوەی مانەوەی لێرە بۆی دیاری کرابوو دەگەیشتە پێنج هەزار قورش، لەدوای حیسابکردنی ئەوەی تا ئێستا نەدراوە بەهۆی هەڵاتنیەوە، لەبیرخەرەوەی نەزارەتی ناوخۆی بەڕێزدا بەم دواییە کە هاوپێچی موقامی باڵا کراوە هاتووە، لەماوەی گەیشتنی ناوبراو بەخانەی سەعادەت لەرابردوو ئیرادەی سوونی بڕیاری دەرکرد لەشوێنێکی گونجاو نیشتەجێ بکرێنو ژیانو ئاسایشو خەرجی بۆدابین بکرێت، بەسەرپەرشتی فەرمانبەرێکی دیاری کراو سەدو حەوت هەزارو دوو سەدو بیستو دوو قورشو نیوی بۆخەرجکراوە ، لەماوەی چواردەی تەمووزی ساڵی ٩٧ هەتا کۆتایی شوباتی ساڵی دوایی، ئەوە بۆبەکرێگرتنی خانوو موچەی کرێکارو خزمەتکارو خواردەمەنیو رایەخو هەموو پێویستیەکانیتر، داوام لەنەزارەتی دارایی کرد ئەم موچانە لەسەر ناوخۆ حیساب بکات. ئەوەی لەدەفتەرو سەنەداتەکاندا هاتووە لەلایەن شورای داراییەوە ووردبینیو پشتگیری کراوە کە دەکاتە بیستو چوار هەزار قورش لەشێوەی زێڕو پەنجا هەزارو پێنج سەدو حەفتاو هەشت قورشو پێنج باڕ لەسەر شێوەی مەجیدیەی زیوی بووە، سی هەزارو پێنج سەدو سیو پێنج و دە بارات بەشێوەی موسەدەسە (یان سوداسی) بووە. رووخسەتم لەژمێریاری نەزارەت وەرگرت لەمووچەی بەخشین ئەمە حیساب بکات، بەپێی ئەوەی میوانی ئەو ساڵە لەگەڵ خەرجی گونجاو نەبووە، ئەو بیرخەرەوەیەم ئامادە

کـــردووه بۆروونکردنـــەوەی حـــوکمی بـــالا لەحالـــەتی دەرچـــوونیەوە بۆرەوانەکردنی بۆ نەزارەتی ناوبراو هەتا رێوشوێنی پێویست لەسەر ئەو ئەساسەی هەستی پێدەکرێت بگیرێتە بەر.

٦ی ذی الحجە سالی ٩٩و ٧ی تشرینی یەکەمی سالی ٩٨ (١٩ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٢)

سەعـید پاشـا

Y.A.Res. 1297. 11.9-848

بۆ مەقامی نەزارەتی بالآ

لەبیرخەرەوەکەی ئەم دواییەی نەزارەتی ناوخۆی بەڕێز کەخراوەتە بەردەم موقامی بالآ هاتووە، لەپێشترو کاتی گەیشتنی ناوبراو بەخانەی سەعادەت، ئیرادەی سوونی بڕیاری دەرکرد بەنیشتەجێکردنی لەشوێنی گونجاوو دابینکردنی بژێوی‌و خەرخیەکەیان بەسەرپەرشتی فەرمانبەرێکی دیاری کراو، دوایی سەدو حەوت هەزارو سەدو بیست‌و دوو قورش‌و نیوێکی لەماوەی چواردەی تەمووزی سالّی ٩٧ هەتا کۆتایی مانگی شوباتی سالّی دوایی بۆخەرجکراوە بەکرێ خانوو موچوی کرێکارو خزمەتکارو خواردن‌و رایەخ‌و هەموو پیویستیەکانی‌تر، داوام لەنەزارەتی دارایی کرد لەسەر مووچەی ناوخۆ حیسابی بۆبکات، ئەوەی لەدەفتەرو سەنەداتەکاندا هاتووە لەلایەن شورای داراییەوە ووردبینی‌و پشتگیری کراوە کە دەکاتە بیست‌و چوار هەزار قورش لەشێوەی زێرو پەنجا هەزارو پێنج سەدو حەفتاو هەشت قورش‌و پێنج باڕات لەسەر شێوەی مەجیدیەی زیوی بووە، سی هەزارو پێنج سەدو سی‌و پێنج و دە باڕ بەشێوەی موسەدەسە (یان سسوداسی) بووە. رووخسەتم لەژمێریاری نەزارەت وەرگرت کە لەپەراوێزی بیرخەرەوەکەدا هاتووە لەمووچەی بەخشین ئەمە حیساب بکات، بەپێی ئەوەی میوانی ئەو سالّە بەبەراورد لەگەڵ سالاّنی ناوبراو موچەی دیاری کراو بەشی نەکردوە . فەرمان بۆحەزرەتی وەلی ئەمرە

٢١ی ذي القعدە سالّی ٢٩٩ و ٢١ ئەیلول ٢٩٨ (٣ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٢)

مەحمود پاشـــا

Y.A.Res. 1297. 11.9-848

هاوپێچ و بروسکەی هاتووی موشیریەی بەڕێز لەشکری چوارەم خرایە ڕوو لەسەر ئەوەی فەرماندەو موتەسەریفی هەکاری هەستی پێدەکەن لە بزاڤو ئامادەکاری شێخ عوبێدوڵلا ئەفەندی بۆهێرشکردنە سەر لایەنی ئێرانی، هەروەها دوێنێ ولایەتی وان لەسەفارەتی سوونی تاران ئاگاداری پێگەیشتووە کە دەسەلاتدارانی ئێرانی بەشێوەیەکی ڕەسمی داوای قەدەغەکردنی دەستدرێژی کوردەکانی سەر بەشێخ عوبێدوڵلاو سەرکۆنەکردنی دەکەن کە لەلای ئێمەوە هێرش دەکەنە سەر ئەوان، گرتنەبەری ڕێوشوێن لەو بارەیەو بۆچوونی موشیریەی ناوبراو ئەوەیە کەلای موقامی بالاتان روونە کەئەندازەیەك پارەو خۆراك پێویستە ڕەوانەی ئەوێ بکرێ هەتا سەرباز بگیرێ و ڕەوانەی ئەو شوێنە بکرێ بۆئەوەی لەلای ئێمەوە هۆزەکان نەپەڕنەوە بۆئێران و پارێزگاری لەئاسایشی سنوور بکرێت. سەرەڕای ئەوە ئەگەر فەرمان دەرچوو ئەحکامی عورفی ڕابگەیەنرێت، ئەوەی پەیوەندی بەپارەو خۆراکەوە هەیە نەزارەتی دارایی لێ ئاگادار بکرێتەوە، قسە لەسەر ئەوە نەماوە پێویستە ڕێوشوێنی بەپەلە بگیرێتە بەر لەلایەن حکومەتی سوونیەوە هەتا لەو ماوەیە قەیرانی سنوور لەگەڵ ئێران سەرهەڵنەدا. شێخی ناوبراویش دەبێت جولانەوەکانی لەسەر ڕاسپاردەو ئامۆژگاریەکانی یاوەران (ڕاوێژکار- نووسەر) حەزرەتی مەولانا سوڵتان ڕێك بخات کە بەڕێوەیە. بەلام هەواڵەکان دەڵێن چەکدارە کوردەکان و خێڵەکانی لای ئێمە کۆدەبنەوە. لەحالەتەی ئەگەر هۆزەکانی ئێران پەڕینەوە بۆلای

ئێمه، زەرووریه ڕێوشوێنی بەهێز بگرینه بەر بۆپاراستنی ئاسایش. بەپێی ئەوەی لەبروسکەدا روونکراوەتەوە بۆرووخسەتی ڕاگەیاندنی ئەحکامی عورفی ئەگەر پێویستی کرد. ئەو بیرخەروەیەم ڕێکخستووە هەتا بۆئیرادەی سوونی روون بێت رێ بەموشیریەی ناوبراو بدات لەکاتی پێویست ئەحکامی عورفی رابگەیەنێت و سەربازی پێویست بۆئەو شوێنانە بەرێ بکات هەتا پارێزگاری لەئاسایشی سنوور بکەن و نەیەڵن ئاژاوە سەر هەڵبدات.

٩ذ القعده ساڵی ٩٧ و ١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٦ (٣١ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٠)

سەعید پاشا

Y.A. Res. 1297.11.9 - 848

بروسکەی ۳۰ئەیلولی سالْی ۹٦

(۱۲تشرینی یەکەمی ۱۸۸۱)

بۆموشیریەتی بەرێز / لەبەڕێوەبەرایەتی مابینی هەمایوونی

لەنامەی فەرمانـدەی هـەکاریدا هـاتووە شـێخ عوبێـدوڵڵا ئەفەنـدی لـەکوار(قەزایەکـە ـ وەگێـڕ) و دەورووبـەری خـۆیو لەبـەری ئێرانـی لـەنێوان هەشت تا دە هەزار کەسی کۆکردۆتەوە بەئاراستەی سابلاغو ورمێ هێرشی کـردووە کـە لەنامەکـەی رابـردوو بـۆم روون کردوونەتـەوە. هـەروەها نامـەی لێـرەو لـەوێ دەنێـرێ بۆئـەوەی چەکداری زۆر لەکورد وخێڵـەکان لەسنووری لای (ئەشـتوب)ی تەنیشـت شـەمدینان کۆبکاتـەوە، هـەروەها لـەدوای هەڵگەڕاوەو ئاغاکانی سنووری ئێمەی ناردووە. عەبدوللا ئاغای سەیدانیو عێزەدین بەگ دانیشتووی ئەلباك هەندێ پیاویـان کۆکردۆتـەوەو بـەخێرایی رۆیشتوون. هەروەها خەلیفە سەعید هەراتیێ لێرەو لـەوێ پیـاو کۆدەکاتـەوە، سـەرەڕای ئەمـە خـەڵکی ناحیـەی کـوێگی سـەر بەجولەمێرگ و دانیشـتوانی سوارکانو ماسرۆی سەر بەئەلباك نیشانەی یەکگرتنیان لێ بەدیارکەوتووە، دانیشتوانی شوێنەکانیتریش هـەتا ئێستا لەراوێـژکردن دان. ئەوەی دیـارە شـێخ هێـرش دەکاتـە سـەر ئێـرانو لەعـەلی خـانی شـکاك دەدات کـە زیـانی لەهۆزەکانی دەڤەری ئێمە داوە. بەڵام قسە هەیە کەئامانجی بنـەڕەتی دەسـت بەسـەراگرتنی ئـەو شـوێنەیە، چـونکە هـیچ رێگەیـەکیتری نیـە پێویسـتی بەهێزی سەربازی تەواو هەیە. بیرۆکەی سەرەتاو کۆتایی خراپـی شـێخ زۆر کارەسات دروست دەکات، ئەگەر ئێستا چالاکیەکانی لەسنووری ئێرانەوەیـە ئەوە شای ئێران بەڕیگەی سـەفارەتی تارانـەوە بروسکەیەکی لەمێـژووی ۹ی ئەیلولی سالی ۹٦ (ای نیسانی ۱۸۸۰) ناردوە بۆولایەتی وان کە وێنەیەکی

بەنەزارەتی دەرەوەی بەڕێز گەیشتووە، لەبروسکەکەدا هاتووە ئەگەر هێزی سەربازی پێویست نەنێرن بۆئێرە بۆپرۆسەی سزادانی خێرای کوردەکانی سەر بەشێخ. هێزە سەربازیەکانی ئێرانی روخسەتیان وەرگرتووەو بەدرێژایی سنوور کۆبوونەتەوە بۆراوەدوونان و سزادانی شێخی ناوبراوو لایەنگرانی، ئەگەر بەرژەوەندی واپێویست بکات لەشکری ئێرانی بۆراوەدوونان لەسنوور دەپەڕنەوە بۆبەری ئێرە، ئەو کات بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە سەر شانی ولایەتی وان

پاشماوەکەی‌ترو پاشماوەی بروسکەی ژمارە ٢ی ٢٩ئەیلولی سالّی ٩٦

(١١ی نیسانی ١٨٨٠) سامح

ژماره ٢ ژمارەی وشەکان ٢٠٠
بۆموشیریەی مابینی هەمایۆنی
بۆسەرۆکایەتی وەزیران
بۆنەزارەتی جەنگی بەڕێز

چونکه شۆڕشگێران لەسنووری ئێرانن سزادان و سنوور بۆدانانی دەکەوێتە سەر لایەنەکەیتر. گرتنە بەری ڕێوشوێنی پێویست کورت هەڵدێ لەقەدەغەکردنی پەڕینەوەی هۆزەکان بۆلایەنیترو پاراستنی ئاسایشی سنوورەکانمان، بەئەو شالاوە گەورەی ئێران شۆڕشگێڕان دەشکێن، لەو حالەتە دەپەڕنەوە بۆسنووری ئێمەو بەهۆی ئەو نفوزە زۆرەی شێخ هەیەتی هەر بانگەوازێکی ئەو لێرە دەبێتە پەشێوی ناو هۆزەکانی سنووری ئێمە، ئەمەش خوانەخواستە دەبێتە کێشەی گەورە بۆوڵاتەکەمان، ئێستاش هێزی تەواومان دەوێت بۆبەربەستی کردن، سەرای ئەوە چارەسەری بەپیرەوەچوونی خەڵکی سنووری ئێمە بۆئەفکاری شێخیش چارەسەر بکرێت، ئەوە بەزیادکردنی هێزی سەربازی بۆبەرەی رەواندزو هەکاری، لەوەڵامی ئەوە ئەمڕۆ تابوورێك بەدوو تۆپی شاخی بەفەرماندەی میر ئالای عەلی شەفیق بەگ رەوانە کرا، هەروەها بەخێرایی موسا پاشای فەرماندەی تیپی هەشت بەدوو تابوورەوە لەموشەوە بەڕێکەوت، ئەمە سەرەڕای تابوورێکی لەشکری سوڵتانی لەو دەڤەرە. هەروەها لەمەرکەز داوامان لەتابوورێکی لەشکر کردووە، داواشمان کردووە لەمەرکەز کەتیبەی پیادەی سەر بەتیپی حەوت بەخێرایی خۆی ئامادە بکات بۆکاتی لەدواکردن، هەروەها جەختمان کردە سەر فەرماندەی شارەزوور هێزی تەواو لەرەواندز خڕبکاتەوە، بەفەزڵی حەزرەتی سوڵتان هەموو ڕێوشوێنێك گیراوەتە بەر

بۆپاراستنی ئاسایشی رژێم. نەزارەتی دارایی بەرێزم ئاگاداری کردمەوە دارایی وان باری قورسەو ناتوانێت دەیەکی پێویستیەکانی ئەو شوێنانە دابین بکات، لەم حالەتە کارەکان گران بوون، داوامان کرد کاربکرێت بۆدابیکردنی مەبلەغی پێویست، بەخێرایی باربوو لەهەردوو ولایەتی وان و بەدلیس کۆبکرێتەوەو بگەیەنرێت، رووخسەتیش هەبێت بەپێی رێنومایی تایبەت ئەگەر پێویستی کرد لەبەرەنگاربوونەوەی هەموو ئەگەرەکان ئەحکامی عورفی رابگەیەنرێت

٢٩ئەیلولی سالی ٩٦ (١١ی نیسانی ١٨٨٠)

سامح

Y.A .Res/ 2259

نەزارەتی دارایی ـ قەڵەمی نامەکان

کتێب لەولایەتی هەکاری بەڕێزەوە بۆ نەزارەتی دارایی و لەوێ بۆخەزێنەی باڵا رەوانەکرا بەژمارەی ٢٤ ئازاری ساڵی ٩٨ (٥ی نیسانی ١٨٨٢) لەوێدا هاتووە کە موچەی مانگانەی دیاری کراو بەشێوەیەکی کاتی بۆشێخ عوبیدوڵلا ئەفەندی شێخی زاویەی شێخ تەها لەناحیەی شەمدینان کەهەمووی دەکاتە چوار هەزارو پێنج سەد قورشی کەڵەکەبوو کەحیسابی هەردوو ساڵی نەوەدو شەش و نەوەدو حەوتە، شێخ عەبدولقادر ئەفەندی کوڕی عەریزەیەکی داوەو داوای حیسابکردنی سەدو هەشتا هەزار قورش دەکات، کەهەندێ لەخزمەکانی شێخی ناوبراو موچەی داواکراویان نەداوە بەهۆی دەیەك و میرانەی مەڕو ماڵاتی ئەو ساڵانە کەدەکاتە سەدو دوازدە هەزار قورش. موچەی ناوبراو کاتیەو کەڵەکەبووی دوو ساڵانە لەگەڵ پاشماوەی دەیەك و مەڕو ماڵات کە بەمەرج و کۆت و بەند پەسند کراوە، ولایەت داوا دەکات چی بکرێ رابگەیەنرێت، لەپەراوێزی بیرخەرەوە خراوەتە ڕوو بەمێژووی ١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٥ کە سەیدی ناوبراوو هەندێ لەپیاوو خزمەکانی بەئەندازەی پێنج هەزار قورش و نیو وەردەگرن بۆبەجێهێنانی مەسەلەی جەنگ کە بەرانبەر ئەوە خزمەتی جەنگی پێشکەش دەکەن، لەگەڵ کۆتایی هاتنی مەسەلەی جەنگ دەبێت ئەو موچەیە ببڕێت، هەروەها لەوەڵامی نەزارەتی بەڕێزدا کەلەرۆژی ١١ی کانوونی دووەم دا نووسراوە فەرمان کراوە هەتا ماوەیەکی تریش ئەو موچەیە بدرێت.

لەم رێنوومایانەی دوایی هاتووە کەپێشتر بەدرێژایی مانەوەی لەخانەی سەعادە بەشێوەی کاتی لەخەزێنە پێنج هەزار قورش بۆ سەیدی ناوبراو

براوەتەوە. ئەو موچە دیاریکراوە لەمێژووی رێنومایییەوە لەشەشی ئازاری
ساڵی ٩٨ەوە دەدرێت، موچەیەکە لەبنەڕەتەوە کاتیەو بەئاگاداری محەلی
هاتووەو لەکۆتایی ساڵی نەوەدو پێنج دا تەواو دەبێ. بەڵام لەهەردوو ساڵی
نەوەدو شەش‌و نەوەدو حەوت تەواو نابێت چونکە لەدوای ئەوە هیچ
ئیرادەیەك نیە. رێکخستنەوەی مووچەی ناوبراو لەگەڵ پاشماوەی دەیەك‌و
موچەی ئەو دوو ساڵە حیساب دەکرێت بەرەزامەندی ئیرادەی نەزارەتی باڵا،
بۆئەمەش بەڕێوەبەرایەتی خەرجیە گشتیەکان‌و بەڕێوەبەرایەتی راوێژکاری
دارایی لەسەریان نووسیوە بۆمەقامی باڵا هەتا چی لەسەر ئێمەیە ئەنجامی
بدەین، فەرمانیش بۆحەزرەتی وەلی ئەمرە.

١٦ی رەمەزانی ساڵی ٢٩٩و ١٩ی تەموزی ساڵی ٩٨ (٣١ تەمووزی
١٨٨٢)

مونیر

Y.A Res/ 2258-21-H-2/0

لەراپۆرتی سەفارەتی ئێرانیدا هاتووە کە شۆڕش و هەڵگەڕانەوە لەسنوورەکانی ئێرانی روویداوە، سەرچاوەی ئەو هاندانە هەریەك لەشێخ عەبێدوڵلاو هەمزاغایە، لەسەرمانە سەرکۆنەو ئاگاداری ئەو هۆزو کوردانەی لەلای خۆمان کە سنووری ئێرانیان بەزاندووە، هەروەکو شای ئێران سەفارەتی ئێمەی لەتاران بەزارەکی لەداواکاری لەو جۆرە ئاگادار کردۆتەوە، ئەوەل و ئاخر ئاگاداری هەیە بەوەی پابەندین بەپاراستنی سنوور، بەڵام ئەوەی پەیوەندی هەیە بەسەرکۆنەی ئەو لایەنگرانەی سەڵتەنەی سوونی سنوور دەبەزێنن لەمێژە هۆزە ئێرانیەکان زوڵم و دەستدرێژی دەکەنە سەرخەڵکی دەڤەری ئێمە، دەبێت چارەسەری بکەین و کاردانەوەی وەکو خۆی ئەنجام بدەین، ئەگەر بیستمان هۆزەکانی دەڤەری ئێمە زیانیان بەلایەکەی‌تر گەیاندووە، ئەوە رێکەوین لیژنەیەکی تایبەت بۆلێکۆڵینەوەو گرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو بنێرین هەتا حالەتی لەو جۆرە روونەداتەوە، نەزارەتی دەرەوە بەبڕیاری ئەنجومەن سەفارەتی ئێرانی ئاگادار کردۆتەوە کە رێوشوێنی پێویست گیراوەتە بەر بۆبەربەستکردنی لایەنگرانی دەوڵەتی عوسمانی کەزیان و خەسارەت بەدەڤەری ئێران دەگەیەنن. لەئاکامی ئەو گۆڕانانەی بەهۆی شەڕەکانی رابردوو روویداوە بایەخدانی بەسنووری لای دەوڵەتی عیللی زیاد کردووە، سەرەڕای ئەوە هەردوو ولایەتی وان و هەکاری کوردو خێڵەکان و زۆرێکی ئەرمەن تیا کۆبۆتەوە، ئەمە وای کردووە سنووردانان بۆشێخی ناوبراوو هی وەکو ئەو لەبەکارهێنانی نفوزی خۆیان لەناو خێڵەکان ئەستەم بێت بەجۆری ئەمە لەگەڵ بارودۆخی ئەو ناوچانەو بەرژەوەندی و سوودی دەوڵەت ناگونجێت، کێشەی وادەنێتەوە زۆر جێی

بایەخ بێت. سەفیری ئێرانی فاکتەرو هەڵچوونی بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوە بەهاندانی شێخ دەزانێ. ئەگەر لەسەر سنوور دوورنەخرێتەوە هیوایەك نامێنێت بۆئارامیو زەمانەتێك بۆئاشایش، دەوڵەت هیوا بڕاو بێت لەهاوکاری دەوڵەتی عیللی ناچار دەبێت بەدوای چارەسەریتردا بگەڕێت ئەویش داوای یارمەتیە لەدەوڵەتی رووسی. هەروەکو ناوەڕۆکی بروسکەی موشیریە لەشکری چوارەمی هەمایونی بۆنەزارەتی جەنگو هی ولایەتی وان بۆبابی عالی باسی خڕبوونەوەی هێزەکانی رووسی لەنەخچەوانو ناوچە سنوریەکان تیا هاتووەو خراوەتەڕوو ئەمەش شایستە بەبەئاگاهێنانەوەیە.

ناردنی لەشکری رووسی بۆسنووری ئێرانی بۆپاراستنی سنوور لەڕووکەشا ئەگەر پێویستی کردیارمەتی دانی ئێرانە، لەراستیدا ئەوە ئامانجی تێکدانی پەیوەندی نێوان ئێرانو دەوڵەتی عیللیە کە بەشێوەیەکی ئاسایی دەیپارێزینو زیان بەدەوڵەت دەگەیەنێت. بەڕوونی دیارە سەبارەت بەئێمە لەئێستاو ئایندە مەترسی گەورە هەیە. هەندێ باڵوێزی دەوڵەتی بێلایەن لەو بارەیەوە ئامۆژگاریان کردووینو جەخیان کردووە بەزوویی پێویستە ئەگەر توانا هەبێت رێوشوێن بگیرێتە بەر. ئەمەی ئێستا مەسەلەیەکی تایبەت بەسکالای ئێرانیەکانە. دیارە لەبەدواداچوون لەمەسەلەکە کەم ناکاتەوە، بەرژەوەندی وا دەخوازێ لیژنەی بەدواداچوون پێك بهێنرێتو رەوانەی ناوچەکە بکرێتو دوایی چۆن پێویست بێت کاری بۆبکرێت، سەرەڕای ئەوە ئێرانیەکان ئاگادار بکرێنەوە کەدەوڵەتی عیللی ئەم بابەتەی بەبایەخەوە وەرگرتووە، ئەگەر نا ئێرانیەکان بەلای روسیا مەیل دەکەن، بەقسەی باڵوێزی ئێرانیەوە ئەمە دیار بوو کەهەتا ئێستا لیژنەی بەدواداچوون نەنێردراوە، بۆیە بەخێرایی جەخت دەکەمەوە سەر هەڵبژاردنی لیژنەو ناردنی هەتا پاڵپشتی قسەکەمان بێت. حەیدەر ئەفەندی

چـاودێری پێشـووی بروسـکه دوو جـار لەپلـەی بـاڵوێزی تـاران دابـووەو ئاگاداری بارودۆخەکەیە، بەتەواوی لەو وڵاتە گەڕاوەتـەوە، توانایـەکی باشـی هەیـــە لەراپەڕانـــدنی ئـــەو ئەرکـــە، کەســـێکی‌تر یـــاوەری بێـــت لەلایـــەن بەڕێوەبەرایـەتی جـەنگ وەکـو کۆمیسـترا( پایەیـەکی نزیکـە لەسـکرتێر: نووسـەر) ئامـاژەی بۆبکرێـت، کـەمال ئەفەنـدی کـەدوێنیٚ بەموتەسـەڕیفی عەمارە دامەزراوە کۆمیستراى دووەم بێت. ئـەرکی بەدواداچوونیان بخرێتـە ئەستۆ ئەگـەر وەکـو دەڵـێن دەسـتدرێژی لەسـنووری ئێرانـی هـەبوو پەلـە لەنەهێشـتنی بکرێـتو هـەموو رێوشـوێنی پێویسـت بگرنـە بـەر، ئـەوراقی سـکالآیان بـدرێتیٚو بـەزوویی بۆیـان رەوانـە بکرێـت. هـەروەها بڕیـار بێـت موچـەی ئـەو دوانـە مووچـەی مـەئموورى موفەتیشـی یەکـەمو دووەم بێـت. ئەوانـــەی دەنێـــردرێن بۆدەڤـــەری ئـــەنادۆڵ موچـــەیان بـــدرێت لەگـــەڵ پێویسـتیەکانی سـەفەرو خـەرجی لـەناکاو. .. لەهـەموو حالـەتێك فـەرمان بۆحەزرەتی گەورەمان وەلی ئەمرە.

غره سەفەر ساڵی٩٨و ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٦ (٢ی کانوونی دووەمی ١٨٨١) مۆری ئەندامانی ئەنجومەنی وەکلا

بەڕێوەبەرایەتی نەزارەتی جەنگ

وەڵامی بروسکەی هاتوو بۆمەقامی پایەدارتان بەرز دەکەینەوە کە لەدەوڵەت نافیز پاشا موشیریەی لەشکری هەمایونی چوارەمەوە هاتووەو لەو دەڤەرەن کەزانیاری شابەندەری تەورێزی تیایە بەوەی دەوڵەتی رووسیا لەشکری بۆنەخچەوان و سنوور رەوانە کردووە هۆی ئەمەو ئەندازەی لەشکر. فەرمان بۆحەزرەتی وەلی ئەمرە

٢٤ی موحەڕەمی ساڵی ٩٨و ١٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی٨٦ (٢ی کانوونی دووەمی ١٨٨١)

وەڵامی بروسکەی هاتوو بەمێژووی ٢١کانوونی یەکەمی ساڵی٩٦ (١ی کانوونی دووەمی ١٨٨١) بۆنەزارەتی جەنگ

لەموحەمەد نافیز پاشا موشیریەی لەشکری چوارەمی هەمایونی لە وان لەئاکامی بڵاوبوونەوەی هەواڵی ناردنی هێزی گەورەی سەربازی دەوڵەتی رووسیا بۆنەخچەوان و سەر سنوور پرسیارم لەقونسوڵی جێگیری ئەو دەوڵەتە کرد لەتەورێز لەسەر هۆی ناردنی ئەو هێزە، وەڵامی دامەوە بۆپاراستنی سنوورە. لەنامەی شابەندەریەی تەورێز بەبەرواری ٢٦تشرینی دووەمی ساڵی ٩٦ ئەوە روونکراوەتەوە کەلەدوای دوا سۆراغ و گوێبیستن دەرکەوتووە ئەو هێزە بریتییە لەچوارده تابوورو دوو بەتاریەتی تۆپ. تکایە بەدواداچوون

بەڕێوەبەری سەرۆکایەتی وەزیران - ژووری بروسکە

وەڵامی بروسکەی هاتوو بۆمەقامی سەدارەتی سامی لەولایەتی وان

شابەندەری تەوریز بەبەرواری ٢٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ٩٦ لەنامەیەکدا ئاگاداری کردین کە بەهۆی بەدواداچوون و گوێبیستی ئەم دواییە دەرکەوتووە رووسیا هێزێکی سەربازی گەورەی ناردووە بۆنەخچەوان و سەر سنوور، لەوەڵامی پرسیارێك قونسوڵی رووسی لەتەوریز لەسەر هۆکاری ئەو هێزە وتی بۆپاراستنی سنوور هاتووەو بریتییە لەچوارده تابوورو دوو بەتاریەی تۆپ.

تکایە بەدواداچوون.

کۆنووسی ئامادەکراو و پاشبەندەکانی لەلایەن ئەنجزمەنی وکەلا لەسەر بەدواداچوون و توێژینەوە لەسکاڵای دەوڵەتی ئێران لەسەر جولانەوەو کاری یاخیگەرایی و هەڵگەڕانەوە بەبزواندن و هاندانی شێخ عوبێدوڵلاو لایەنگرانی. نازیری رابردووی پۆستە حەیدەر ئەفەندی و کەمالی ئەفەندی موتەسەریفی عەمارە بەسیفەتی کۆمیسیری یەکەم و دووەم بەیاوەری پیاوێکی شایستە لەبەڕێوەبەرایەتی سەربازی دانران بچن بۆبەدواداچوون، ئەگەر لای ئێمەوە بەواقیع سنوور بەزاندن هەبوو نەی هێڵن لەگەڵ ئەوەی پەیوەستە بەو کارەوە، ئەم رونکردنەوەیەمان دەرکرد بۆجێبەجێکردنی ئیرادەی سوونی بەڕێز لەو بارەوەیەوە.

غرە سەفەر ساڵی ٩٨و ٢١کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٦ (٢ی کانوونی یەکەمی ١٨٨١)

سەعید

Y.A. Res 1297-12-7
H-2053

وێنەی بیرخەرەوەی نەزارەت

بایەخی ستراتیژی دەڤەری وان و هەکاری لای موقامی بالاّتان شاراوە نیە، ئەم بایەخە بەهۆی ئەو گرژیەی ئێستا لەئێران هەیە لەمەترسیدایە، زۆر پێویستە سوور بوون لەسەر ئاسایش و دڵنیایی لەو ناوچانە و رێگە نەدان بەسنووربەزاندن و ئاژاوەی هۆزە کوردەکان لەمومتەلەکاتی ئێرانی لەسنووری خاقانی. بەهۆی لەئاستی رێوشوێن دانەبوونی دەوڵەت موشیریەی لەشکری چوارەمی هەمایونی بەهۆی بایەخی ئەو ئەرکە لەگەڵ نەزارەتی جەنگی بەرێز بەگونجاوی دەبینین سەرۆکی ئەرکان سەعادەتی فەریق نافیز پاشا موشیریەی لەشکری هەمایونی ناوبراو بەرەزامەندی موقامی بالاّ بۆ ئەم ئەرکە دابنرێت. ئەم بیرخەرەوەمان دەرکرد بۆجێبەجێکردنی ئیرادەی سوونی بەرێز لەو بارەیەوە.

٧ي ذي الحجه ساڵی ٩٧و ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٦
(١٠ی تشرینی دووەمی ١٨٨٠)

وێنەکە وەکو خۆی

Irade Dahiliye
69691

ئیرادەی سوونی سوڵتانی نووسراوێکی هەمایونی دەرکردووە لەسەر ڕەزامەندی بۆکامیل بەگ بۆئەرکێکی تایبەتی لەوان کە حەسەن ئەفەندی ئەندامی ئەنجومەنی ئیدارەی ولایەتی وان بەجیاکەرەوەی پلە دوو، ئەحمەدە ئەفەندی بەڕێوەبەری پێشووی شەمانس بەپلە سێ بکرێتە قائمقامی قەزای کوار، عوسمان ئاغا یوزباشی زەبتیەی پیادە لەولایەتی وان وسامی مەجیدی پلە پێنجی بدرێتێ و بگوازرێتەوە بۆموسڵ بۆفەرماندەی یەکەی سوارە، کەتیبەی زەبتی وان چونکە یاوەری شێخ عوبێدوڵلا ئەفەندی دەکات لەکاتی گواستنەوەی بۆموسڵ و بۆخزمەتی باش و ئەمەکداری لەگەڵیدا. فەرمان بۆحەزرەتی وەلی ئەمرە

١٩سەفەری ٣٠٠ و ١٨کانوونی یەکەمی ساڵی ٩٨(٣٠کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٨٢)

عەلی ڕەزا

# سـولْتـان عەبدولحەميـدو كـــــورد

## لــــــەشكرى حەميديەى كوردى ١٨٨١- ١٩٠٩ز( * )

- لەشكرى حەميديەى كورد : سوارەى كورد

- هۆيەكانى سەرهەلْدانى لەشكرى حەميديە : سوارەى كورد

- ئە نجامو شوێنەوارەكانى پێكهێنانى سوارەى حەميد يە

- پووختەى توێژينەوە

ماوەی دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید (١٨٧٦- ١٩٠٩ز) لەمێژووی کورد بەقۆناغێکی مێژوویی گرنگ دەژمێردرێت، لەو قۆناغەدا ململانێی ئیستیعماری تاڵ لەسەر ولایەتەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) دەستی پێکرد. بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن بەپشتیوانی ولاتانی رۆژاوا بەتایبەتی رووسیای قەیسەری دەیویست قەوارەیەکی ئەرمەنی لەسەر ئەو هەرێمەی ئەمرۆ پێی دەوترێت رۆژهەڵاتی تورکیا دابمەزرێنێ کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن، سوڵتان عەبدولحەمید سوارەی حەمیدیەی دامەزراندکە رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی گێرا لەو ململانێیە، هەر ئەمەش شەڕێکی تاڵی زیاتر لەدە ساڵەی لێکەوتەوە.

هەوڵی نووسەری ئەم وتارە خستنەڕووی سیما سەرەکیەکانی سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدە لەناو دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ پەیوەندی ئەو سیاسەتە بەرانبەر کورد، دوایی دەچینە سەر سەرهەڵدانی تەشکیلاتی حەمیدیەو بەرەنجامەکانی.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لەئەنجامی کۆدەتایەك هات کەبانگەوازکارانی چاکسازی رۆژاوایی لەدژی عەبدولمەجید سوڵتانی بەهێزی عوسمانیەوە ئەنجامیان دابووگەیشتە سەر حوکم، سوڵتان عەبدولحەمیدیش لەهەمان ئاراستە بووە، بۆیە مەدحەت پاشای والی پێشووی بەغدا کە بەکارامەیی ئیداری ناسرابوو هێنای کردیە سەدری ئەعزەم (سەرۆك وەزیران)، هەروەها سوڵتان عەبدولحەمید رازی بوو

بـــەدانانی دەســـتوورو پێکهێنـــانی ئەنجومـــەنی نوێنـــەران (المبعوثـــان)و ئەنجومەنی پیاوماقولان (الاعیان). سوڵتان لەبیرەوەریەکانیدا ئاماژە دەکات بەوەی بەماوەیەکی کەمی دەسەڵاتی بۆی دەرکەوتووە مەدحەت پاشاو هاوڕێکانی سەر بەکۆمەڵی تورکە لاوەکانن‌و دەیانەوێت تاکڕەوی بەسەر دەوڵەتدا بسەپێنن، هەروەها بەدیارکەوت مەدحەت پاشاو کارامەکانی لەگەڵیدان دەسەڵات دۆستایەتی تەواویان هەیە لەگەڵ ناوەندەکانی ماسۆنی‌و باڵوێزی بەریتانیا لەئەستەنبوڵ، دەستوورو پەرلەمان پەردە پۆشن بۆ رووخانی پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی‌و سەپاندنی ئاکاری نا ئاینی (عەلمانیەت) بەسەر کۆمەڵگای عوسمانیدا(**). بۆیە مەدحەت پاشای هەمیشە سەرخۆشی لەسەر کار لابردو کارکردنی بەدەستوور وەستاند(١).

گرنگترین بەرەنگاریەکانی سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ سەرهەلدان‌و بڵاوبوونوونەی ناوەندەکانی ماسۆنیەت بوو لەولایەتەکانی عوسمانی، لایەنگرانی ئەو ناوەندانە لەژێر دروشمی کومەڵەکانی چاکسازی (الجمعیات الاصلاحیە) کاریان دەکردو بانگەوازکاری گۆڕانکاری‌و بڵاوبوونەوەی ئاکاری ئازادی‌و یەکسانی بوون، لەراستیدا پەیوەست بوون بەجولەکەو باڵوێزو قونسوڵیە ئەوروپیەکانەوە. سوڵتان هاتبووە سەر ئابووریەکی رووخاوو لەکاتی وەرگرتنی دەسەڵات قەرزی دەرەکی ٣٠٠ ملیون لیرەی عوسمانی بوو، مەترسی رووبەرووبوونەوە دەرەکیەکان لەناوخۆییەکان کەمتر نەبوو. لەپوختەی ئەم مەترسیە سوڵتان دەڵێ : دوێنێ ئەوروپیەکان دەستیان برین بەجیاکردنەوەی سربیاو بولغاریاو میسر لەلاشەی دەوڵەت، قاچیان بڕین بەجیاکردنەوەی پارچەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەئەوروپا،

ئـەمڕۆش بەكێشـەی ئەرمـەن لەبەشـەكانی ئـەنادۆڵی ئاسـیایی لەرۆژهـەڵات دەیانەوێت سكمان بدڕن و هەناومان دەربهێنن هەتا دەمرین)(٢).

سـوڵتان عەبدولحەمیـد بـۆ رووبەڕووبوونـەوەی ئـەو مەترسـیانەو ئامانجەكانی پشتی بەم ستراتیژیە بەستبوو:-

١-نەهێشـتی گەنـدەڵی ئیـداری و رزگـاربوون لـەزیادەڕۆیی و خـراپ بـەكارهێنانی سـامان.. بۆبـەدیهێنانی ئەمـەش جـەختی دەكـردەوە لەسـەر زیندووكردنەوەی ئاكارە بنەڕەتەكانی ئیسلامی لەدڵ و دەروونـی خەڵكیدا، لەسـەرەتاوە سـوڵتان لەخۆیـەوە دەسـتی پێكـرد، لەهەڵبژاردنـدا قەسرێكی ئاسـایی هەڵبـژارد و كەوتـە بەرنامـەی دووركەوتنـەوە لەحـەرام و لەسەرنوێژەكانی هەینی بەردەوام بوو، ئەو باڵەخانە پاشایەتیەی قەسرێكی گەورە بوو لەباب و باپیرانی بۆی بەجێمابوو لە(قاپی سەرای) لەئەستەنبوڵ كردیە گـەورەترین كتێبخانـە لەرۆژهـەڵات لەگـەڵ زانكۆیـەكی ئیسلامی بـۆ خوێندنی زانستی شەرعی و زانستی سروشتی، هەرچی بۆی مابۆوە لەزێرو پارە تەرخانی كرد بۆچاككردنی زەوی وازلێهێنراو (المتروكە) لەناو دەوڵەتی عوسمـانی كـەدواتر بـەو زەویانـەیان دەوت (زەوی سـوونی) لەلایـەن دەسـتەیەكی كارامـەوە بـەڕێوەدەبران و بـەئامێرو پـڕۆژەی ئـاودێری پـەرەی پێـدرابوو، بەقـەرزێكی سـووك دابـووی بـەجوتیارەكان و بـاجی لەسـەر كـەم كردبوونـەوە، بـەكورتی سـوڵتان دەیویسـت زەویـەكانی سـوونی بكاتـە نمونەیەك بۆفەڕزكردنی بەسەر دەزگاكانی حكومەت (٣).

٢-زیندووكردنـەوەی بـیری خەلافـەت لـەناو گـەلانی ئیسـلامی كەپێشـتر سـوڵتانەكانی ئـالی عوسمـان لـەم دامـەزراوە گرنگـەی دیـوانی شاهەنشـایی بایـەخیان بەكورد و عـەرەب نـەدابوو، سـوڵتان سـوور بـوو لەسـەر پتـەكردنی

برایەتی لەهەموو شوێنێکی ئیمپراتۆریەتەکەی و گرنگی تایبەتی دەدا بەپێڕەوی سۆفیگەری و شێخەکانی تەریقەتی لەخۆی نزیك دەکردەوە.

٣-سوڵتان بەرنامەی دانا بۆ چارەسەرو بوژاندنەوەی ئابووری وێرانی عوسمانی، بۆ ئەو مەبەستەش لەهەموو جێگەیەکی ئیمپراتۆریەتەکەی گرنگی بەقوتابخانەو پەیمانگای زانستی‌دا، ئیمتیازاتی‌دا بەشەریکاتی ئەوروپی بۆدەرهێنانی کانزا، بایەخی بەکردنەوەی هێڵەکانی ڕێگەوبان و ئاسن دا، تەواوکردنی هێڵی ئاسنی بەغدا- بەرلین و هێڵی دیمەشق - حیجاز لەدەستکەوتەکانی سوڵتانە.

٤-بەهێزکردنی هێزی سەربازی، سوڵتان عەبدولحەمید بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی عەبدولعەزیزی مامی لەنوێکردنەوەی دامەزراوەکانی سوپا و چەك و بایەخی تایبەتی دەدا بە هێزی دەریایی عوسمانی.

٥- ریبازی سوڵتان لەسیاسەتی دەوەوەی بەلێزانی لەسەر بنەمای بێلایەنی دایڕشتبوو، هەستی بەوەکردبوو دەوڵەتی عوسمانی ئەو دەوڵەتە نەماوە بەتەنها لەڕووی هێزی ئەوروپیدا بوەستێ، بۆیە دەیویست سوود لەهێزی دوژمنەکانی وەربگرێ لەناکۆکی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ دوژمنێکی‌تر، ئەوەش لەو ماوەیە نهێنی هۆکاری لێك نزیکبوونەوەی هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەڵمانی بوو.

چەندین جار لەلایەن عەسابە ئەرمەنی و ماسۆنیەتی هاوپەیمانی جولەکە هەوڵی تیرۆرکردنی سوڵتان دراوە، لەبەر ئەوە بۆیەکەم جار دەوڵەتی عوسمانی ئامێری پێشکەوتووی ئاسایشی دامەزراند، دەوڵەت ئەو کات لەژێر فشاری توندی زایونی دابوو هەتا ڕێگەیان بدات کۆچ بکەن بۆ فەلەستین، سەرۆکی ڕێکخراوی جولەکەی جیهانی (تیۆدۆر هەرتزل) بەسوڵتان عەبدولحەمید گەیشت و هەوڵی‌دا لەخشتەی بەرێ و فەلەستینی

بۆجولەکە لێبکرێ لەبەرانبەر دانەوەی هەموو قەرزە دەرەکیەکانی دەوڵەتی عوسمانی، جارێکیتر هرتەزل هەوڵیدا بەرتیل بداتە سوڵتان ئەویش رەتیکردەوەو پیی وتن ئامانجی جولەکەی جیهانی ئەوەیە رێگە بدرێن کۆچ بکەن بۆ فەلەستین چونکە جولەکە لەئەوروپا دەچەوسێنرێنەوە، هەموو دەزگاکانی عوسمانی کراوەیە بەڵام ئەگەر دەیانەوێت فەلەستین لەمن بکڕن ئامۆژگاریان دەکەم سەروت و سامانی خۆیان لەدەست نەدەن هەتا لەژیاندابم ئەمە بەکەڵکتان نایەت، ئەگەر مردم یان لەسەر حوکم لابرام ئەوە بەخۆڕایی فەلەستین بەدەست دەهێنن(٤).

جولەکە گەیشتنە ئەو قەناعەتە مانەوەی سوڵتان عەبدولحەمید کۆسپی سەرەکیە لەبەردەم هەوڵەکانی ئەوان بۆ زەوتکردنی فەلەستین، بەڕێگەی ناوەندەکانی ماسۆنیەت کەوەتنە چالاکی نواندن بۆ لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید لەحوکم و ئابڕو بردنی، بەهاوکاری باڵویزو قونسوڵیە ئەوروپییەکان هێرش کرایە سەر سوڵتان و بەناوی ناشیرینی وەکو (سوڵتانی سوور) و (دیکتاتۆر) ناویان دەهێنا، شەڕی کورد و ئەرمەن و ئاژاوەی ئەستەنبوڵ بۆدژایەتی ئەرمەن و بۆ بەرژەوەندی ئەرمەن پەیدابوو، تاوانبارکردنی سوڵتان لەم ڕووداوانە زیادی کرد کە دەستکردنی هێزە دەرەکیەکان بوو بۆ لەباریەك بردنی بەرنامەی سوڵتان لەنوێ کردنەوەی بیری ئومەتی ئیسلامی و چوارچێوەی سیاسەتی خەلافەت، هەموویان کەوتنە خۆ بۆ برەودان بەئاکاری نا ئاینی رۆژئاواو پەرەپێدانی بیری نەتەوەیی و تایفەگەری لەناو مسوڵمانان.

سوڵتان لەسەرووی رەخنەوە نەبووە هەروەك و لەبیرەوەریەکانیدا لەهەندێك کاروباردا خۆی بەکەمتەرخەم زانیوە، بەڵام پیاوێکی زیرەك و خاوەن خۆزگە بووە، دەیویست گیانی لەباریەکچوو بکاتەوە بەبەر دەوڵەتی

عوسمانی بەڵام درەنگ هات، باسی سوڵتان دەکرێ بەوەی سینە فراوان و لێبودەو ناتوندووتیژ بووە هەتا لەگەڵ دوژمنەکانیدا، لەسەردەمی ئەودا کەس لەسێدارە نەدراوە کە لەوڵاتانیتر باوبوو، گەورەترین سزا بۆناحەزەکانی زیندان یان ماوەیەك دوورخستنەوە بووە، ئەی بۆچی بەدەستی کۆدەتاچییەکانی ماسۆنیەت کەوت کەئیتحادو تەرەقی سەرکردایەتی دەکرد؟ لەگەڵ هاتنی ئەودا پارتە ناسیونالستەکان بەکردەوە قۆناغێکی نوێی دیکتاتۆریەت دەستی پێکرد، بەجۆرێ ئەو ناسیونالستە توورکانە گۆمی خوێنیان بۆگەلانی ناتورك سازدا دەوڵەتیان لەشەڕێکی ئەورووپی (یەکەمی جیهانی) وەردا کە هیچ بەرژەوەندی مسوڵمانانی تیا نەبوو، ئەمە بووە هۆی لێك هەڵوەشانەوەی دەوڵەت و لەدەستدانی چەندان هەرێمی وەکو فەلەستین

## لەشکری حەمیدیە = سوارەی کورد

لەلایەن کۆمەڵێك لەتوێژەرەوە رۆژاواییەکانەوە باس لەسوارەی حەمیدیە کراوە. بەگشتی تێڕوانینی سەلبیان وەرگرتووە کەرەنگدانەوەی بەڕێوەبەرایەتیە رەسمیەکانی ئەورووپیە لەسەر سوارەی حەمیدیە، لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر لەسەر ئەو بابەتە نیە، توێژەرەوەی سۆڤیەتی ئەمیریانۆف لێکۆڵینەوەیەکی جوانی لەسەر لەشکری حەمیدیە نووسیوە بەڵام وەکو هەموو نووسینەکانیتری سۆڤیەتی لەسەر کورد پشت دەبەستێت بەبەڵگەنامە رەسمیەکانی حکومەتی رووسیای قەیسەری و بەیاننامەو راپۆرتی کۆمەڵە ئەرمەنیەکان، هەموو توێژەرەوەیەکی بابەتی

پێویسته سوود لەئەرشیفی رووسی وەربگرێ بەڵام نابێت خۆ بێمنەت بکات لەبەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەتووركیا.

سوڵتان لەساڵی ١٨٩١ز فەرمانیدا بەتەشکیلکردنی لەشکری حەمیدیە لەهۆزە کوردیەکانی ناوچە سنووریەکانی ئیمپراتۆریەتی رووسی لەرۆژهەڵاتی تورکیای ئێستا، داینابوو ئەم هێزە ببێتە هێزی پشتیوانی سوپای نیزامی لەکاتی شەڕ، لەسەر هۆزە کوردەکان بوو هەر خێزانێك سوارەیەك ئامادە بکات بۆپەیوەندی بەسوارەی حەمیدیە بۆماوەی ٢٣ساڵ بەشێوەی ناوبەناوو بەم پۆلینەی خوارەوە:-

١-ئامادە (الاحضارية) بۆ ئەوانەی تەمەنیان لەسەرووی ١٧ساڵەوەیە، لەناوچەکانی خۆیان مەشق دەکەنو ماوەکەی سێ ساڵە.

٢-نیزامی (النظامية) ماوەی ١٢ساڵە ئەمیش ناوبەناوەو بۆئەوانەی تەمەنیان لەکاتی پەیوەندی کردن لەنێوان ٢٠-٣٢ ساڵان دایە ناوبەناو پابەندن بەمەشقو هەرکاتێك داوابکرێن دەبێت بۆماوەی ٢٤سەعات بەچەكو تەقەمەنیو ئەسپەکانیانەوە ئامادە بن.

٣-یەدەك (الاحتياط) ماوەی ١٨ساڵەو بۆئەوانەیە تەمەنیان لەنیوان ٣٢-٤٠ ساڵانە پابەندن بەمەشقو لەحالەتی پێویست داوا دەکرێن بۆخزمەت.

لەهەموو حالەتێك سوارە ئەسپێکی هەبێتو دەوڵەت لەکاتی مەشقو شەڕ خەرجی دەکێشێتو مەشق زیاتر ماوەی سێ مانگەو ژمارەی تێکڕا (المعدل)ی هەر فەوجێك پێك دێت لە٨٠٠ تا١٠٠٠ هەموو فەوجێك ٣-٦ کەتیبەیەو هەر کەتیبەیەك ٣ تا ٦ کەرتەو هەر کەرتێك٣ تا٤ سریەو هەرسریەێك لە٢٠ تا٣٠ سوارە پێك دێت، لەسەرووی هەمووفەوجێك ئەفسەرێکی سوارە ئەفسەرێکی کارامە هەبووە(٥).

هۆزەکـانی بەشـدارلەحەمیدیە چـەندین ئیمتیازاتیـان هەیـە، لەوانـە چاوپۆشیان لێدەکرێ لەهـەموو باجێکی حکـومی بێجگـە لـەباجی دەیـەك و کۆدە، حکومەت لەسەردەمی سوڵتان لەو دوو جۆرە باجەشدا نـەرمی لەگەڵ دەنواندن، زەویـەکانی دەوڵـەت (ئەمیریـە) کەبـەیار بوون و بەکارنـەهێنرابوون لـەدوای چـاککردنی دەدران بەسـوارەی حەمیدیـە هـەتا بتوانێـت سـوودی لێوەربگرێت. دەقی فـەرمانی حکـومی هەیـە کەئەنـدامانی فـەوجی حەمیـدی ملکـەچ نـابن بـۆ دادگـای مـەدەنی، لەسـەرەتاوە سـوڵتان گرنگـی تایبـەتی بەلەشکری حەمیدیە دابـوو کردبوویـە بـەردی بناغـەی سیاسـەتی داڕێـژراوی خۆی بۆ زیندووکردنەوەی خەلافەتی عوسمانی، بەبڕیاری تایبەتی بایـەخی پێداو بەناوی خۆیەوە ناوی لێنا بوو، زەکی پاشای زاوای، مێردی خوشـکی فەرماندەی سوپای عوسمانی بوو لەئازەربێجان هێنـایی و کردیـە فەرمانـدەی گشتی هێزی حەمیدیە، بۆهاندانی هۆزە کوردەکان سوڵتان و زانایانی ئـاینی بەیاننامەیـەکیان ئاراسـتەی کوردەکـان کـرد بچنـە نـاو ئـەو تەشـکیلاتەوە، چـونکە حەمیدیـە پارێزگـاری لەئیسـلام و کەرامـەتی مسـوڵمانان دەکـات و بەشـداریکردن لـەریزی حەمیدیـە جیهـادی پـیرۆزە، هـەروەکو زانایـان و تەریقـەتی سۆفیگەری رۆڵـی گرنگیـان بـینی لەهانـدانی کـورد بۆچوونە نـاو ریـزی لەشـکری حەمیدیـە، لەسـاڵی ١٨٩١ز کۆنگرەیـەکی بـەرفراوان گـیرا بۆکـوردان و سـەرەرای ئامـادەبوونی زانایـانی ئـاینی و سـەرۆك هۆزەکـان و پیـاوقولاّن سـوڵتان ئامـادەیی بـوو قسـەی بۆئامـادەبووان کـرد و بـەبیری هێنانەوە بەئەرکی خۆیان هەڵسن بەرانبەر بیرباوەری ئیسلامی و ولاّتەکەیان کەهەرەشەی دوژمنانی لێدەکرێت(٦).

# هـــــــۆکارەکانی سەرهەڵدانی تەشکیلاتی حــــــەمیدیە

لازاریف توێژەرەوەی سۆڤیەتی قەناعەتی وایە ئەو سووربوونەی سوڵتان لەســەر دامەزرانــدنی ســوارەی حەمیدیــە بەمەســتی خۆدزینــەوە بــووە لەجێبــەجێکردنی بەنــدی ١٦ی ڕێکەوتنامــەی بــەرلینی ســاڵی١٨٧٨ز کەولاّتانی ئەورووپی ناچاریان کرد ئیمزای بکات. ئاگادارین ڕێکەوتنامەی ناوبراو جۆرێك لەبەڕێوەبەرایەتی خۆیی دابوو بەئەرمەن و لەسەر دەوڵەتی عوسمانی فەرزکرابوو کۆمەڵێك چاکسازی ئیداری و قەزایی ئەنجام بدات بەجۆری زوڵم لەسەر شانی ئەرمەن نەهێڵێ، لەبڕگەیەکی ڕێکەوتنامەکەدا هاتووە، حکومەتی عوسمانی پەیمان دەدات کەدەستدرێژی کردنە سەر ئەرمەن) لەلایەن کوردەکانەوە نەمێنێ(٧).

جێبــەجێکردنی ئــەو ڕێکەوتنامەیــە واتــە بالاّدەســتیدان بەئەرمــەن لەولایەتە یەکگرتووەکان (ئەنادۆڵی خۆرهـەلاّت) کە کەمینـەن لەبـەڕێوەبردنی ناوچەکە، ئەوەی شایانی باسە وەفدی رووسی باتریاکی ئەرمەنی هێنابوو بـۆ ئـەو کۆنگرەیــەی بــەرلین لەگــەڵ ئەوەشــدا بــۆی نــەبوو لەکۆبوونــەوە رەسمیەکانــدا ئامــادە بێــت و تــەنها دەرفــەتی گفتوگــۆی هــەبووە لەگــەڵ نوێنەرەکاندا، وەفدی ئەرمەنی داوای لـەولاّتانی ئـەورووپی کـرد تێکشکانی هێزەکانی عوسمانی لەبەرانبەر رووس لەشەڕی ١٨٧٨ز بەدەرفەت بزانن بۆگرێدانی ولایەتەکانی رۆژهەلاّتی ئەنادۆڵ بەناوچە ئەرمەنیەکانی ژێر دەسەلاّتی رووسیای قەیسەری(٨).

سوڵتان باش دەیزانی مەسەلەی چاکسازی لەولایەتەکانی رۆژهەڵات پەردەپۆشی وڵاتانی ئەورووپییە بۆ دابڕینی بەشێکیتری دەوڵەتی عوسمانی، لەکاتێکدا هێزە ئەورووپییەکان هەمان رێگەیان گوتبووە بەر لەسربیاو مەسدۆنیاو بولغاریا، لەو هەرێمانە لەژێر پەردەی چاکسازی پشتیوانیان لەهێزی ناسیونالستی دەکرد لەروی سەربازیو سیاسیەوە بۆ جیابوونەوە لەدەوڵەتی عوسمانی، لەبەر ئەوە دوورر نەبوو سوڵتان عەبدولحەمید لەشکری حەمیدیەی کردبێتە هۆکارێك بۆ خۆدزینەوە لەجێبەجێکردنی بڕیارەکە، بەدەربڕینێکیتر سوڵتان ئۆباڵی بەرپرسیاریەتی وڵاتی کوردانی خستە ئەستۆی کورد خۆی(٩).

هەندێکیتر لەسەر ئەو رایەن سوڵتان هەستی بەوە کردبوو دابینکردنی ئەمنو ئاسایشی ولایەتە کوردیەکانی ئەنادۆڵی خۆرهەڵات بەبێ دۆستایەتی کوردو سەردارەکانی نایەتە دی، لەشکری حەمیدیە دەرفەتی دا بەنەوەی خێڵەکان بەدابینکردنی بژێویو گەڕاندنەوەی شکۆمەندی سەرۆکەکانیان. وەکو سوڵتان زەکی پاشای راسپارد شێوازێك بەکاربهێنی بۆ پالاوتنی هۆزەکان بۆتەشکیلاتی حەمیدیە هاوسەنگی نێوان هۆزەکان زامن بکات، هەتا سوارەی حومیدیە نەبێتە هۆکارێکیتری زیادبوونی ئاشووبو شەڕی هۆزەکان، بۆیە ئەو شەڕە دەمارگیریەی چەندین ساڵە هەبوو لەسەر زەویو خوێنگری خاوبێۆوە(١٠).

توێژەرەوانی رووسو نووسەرانی کورد بەو ئاراستەی مەنهەجیەتیە دەنووسن کە هۆکاری سەرەکی لەتەشکیلکردنی لەشکری حەمیدیە دەبەنەوە بۆئارەزووی سوڵتان لەبەکارهێنانی کورد وەکو ئامێرێکی لەباری بندەستی خۆی دژ بەجولانەوەی نەتەوایەتی گەلانی ناتوورکو ئامادەکردنی ئەو هێزە وەکو سوپایەکی یەدەك بۆشەڕەکانی داهاتووی دەوڵەتی

عوسمانی لەگەڵ رووس(١١) گومان لەوەدانیە سوڵتان لەشکری حەمیدیەی بەمەبەستی بەرپەچدانەوەی رووسیای قەیسەری دامەزراند لەبەرانبەر هێرشی فراوانخوازی ئەوان بۆسەر ولایەتەکانی عوسمانی لەرۆژهەلات، بەلام ناتوانین کوێك بین لەگەڵ ئەوەی لەشکری حەمیدیە هاتووە بۆلێدانی جولانەوەی گەلانی ناتورك لەناویاندا جولانەوەی نەتەوایەتی کورد، ئەمەش بەهۆی چەند ئەگەرێکی نەگونجاوی بنەڕەتی. یەکەم: سوڵتان عەبدولحەمید لەناسیونالستە تورکەکان نەبووە هەتا بیر لەلێدانی نەتەوەکانیتر بکاتەوە بەڵکو زۆربەی راوێژکارە نزیکەکانی عەرەب و کورد بوون. دووەم: لەوکاتە (١٨٩١ز) بزاڤی نەتەوایەتی کاریگەر لەناو کورد چ وەکو بیرۆکە لەناو رووناکبیران و چ لەناو جەماوەر بەگشتی نەبوە، بەدرێژایی دەسەلاتی سوڵتان عەبدولحەمید بزووتنەوەی نەتەوایەتی لەناو کورد گەشەی نەکردبوو، دەرکردنی رۆژنامەی (کوردستان)یش لەدەرەوە لەساڵی١٨٩٨ز لەلایەن نەوەکانی بەدرخان و بەپشتیوانی لایەنی ئەرمەنی و ماسۆنی نابێتە بەڵگە لەسەر سەرهەڵدانی جولانەوەی نەتەوایەتی، ئەمە لەکاتێکدا رۆژنامەی کوردستان ئینگلیزەکان پشتیوانیان لێدەکرد و لایەنی ئەرمەنی بەرێگەی سووریەوە دەیانگەیاندە کوردستان چونکە رۆژنامەکە دژایەتی سوڵتان و پشتگیری لەکێشەی ئەرمەن دەکرد(١٢).

نووسەری ئەم وتارە وای بۆدەچێت ئەوەی سوڵتانی هەڵنا بۆدامەزراندی لەشکری حەمیدیە هەستکردنی بوو بەدڵسۆزی کورد و ئەو توانا بەهێزە سەربازیەی کەپێی ناسراوە، سوڵتان لەشەڕەکانی رووسی - عوسمانی ١٨٧٧ز، ١٨٧٨ز بەچاوی خۆی رادەی دڵسۆزی کوردانی دیبوو، چونکە کاتی راپەرینەکەی شێخ عوبێدوڵلای نەهری ١٨٨١ز هۆزە کوردەکان رۆلی گرنگ و شەرەفمەندانەیان گێرا لەبەرگری لەدەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتنی

رووس لەو شەڕە بەهۆی نەبوونی حەماسەتی کوردەکانەوە نەبووە کە لەژێر فەرماندەی سەرۆکەکانیان دابوون لەشێخانی تەریقەتی سۆفیگەری بەڵکو بەهۆی ئەو زیانانەوە بوو کە لەوە پێش بەر دەوڵەتی عوسمانی کەوتبوو لەئاکامی گەندەڵی ئیداری ئەستەنبوڵ و نارێکی و نەبوونی بەگەڕخستنی باشی هێزە نیزامی و خەباتکارە کوردەکانەوە بووە. سوپای رووسی بەمەشق و خۆئامادەکردنی باشتر سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەشداری خەباتکارانی کورد لەو شەڕە بەسەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵلای نەهری ئەزموونێکی باش بوو. لەکاتێکدا ئەرمەنەکان لەسایەی مسوڵمانان زیاتر لەهەزار ساڵە بەئاشتی و تەبایی ژیاون کەچی بەهەزارانیان پەیوەندیان بەهێزی هێرشکەرانی رووسەوە کرد کەسیاسەتی خاکی سوتاو (الاراضي المحروقة)ی پیادە دەکرد لەشالاو بۆسەر ئەرزڕۆم(١٣).

ئازایەتی هۆزە کوردیەکان بۆ فیداکاری لەشەڕی رووسی ١٨٧٨ز کورتهەڵنەهاتبوو لەکوردی هەرێمە سنووریەکانی رووسیا، بەڵکو خەباتکارانی ولایەتی موسلیش رۆڵیان هەبووە، ئەمە لەکاتێکدا شێخ کاك ئەحمەدی بەرزنجی و شێخ سەعیدی کوڕی لە پەیوەندی پتەو دابوون لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمیدو رۆڵی گرنگیان هەبووە لەهاندانی کورد بۆ جیهاد، لەچەند فەوجێك کوردانی ئەو هەرێمە بەشداریان لەو شەڕەدا کرد(١٤) سوڵتان هەستی بەوە کردبوو پێویستە سوود لەتوانای مسوڵمانانی کورد وەربگیرێ و رێك بخرێن و سوپایەکی نیمچە نیزامیان لێدروست بکرێ لەسەر ئەو شێوە سوپا نانیزامیەی لەرووسیا پێی دەڵێن (قەوزاق=القوزاق). ئەم تەشکیلەیەش جۆرێکیترە لەمیکانیزمی پەیوەندی سوڵتان بەکورد.

## ئـــــــه نجام و شوێنەوارەکانی سوارەی حەمـــــیدیە

پێکهێنـانی سـوارەی حەمیدیـە لەچـەند لایەکـەوە شـوێنەواری بەرچـاوی هەبووە لەسەر کورد، مامۆستا کەمال مەزهەر ئەزموونی پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە بەسەرکەوتوو نازانیٚ و دەنووسیٚ: لەدایك بووی تـازە بەسەقەتی و هەروەها بەخراپی پەیدا بوو(١٥)، دکتـۆر کەمال دەیـەویٚ بێتـە سـەر ئـەوەی بلٚیٚ پێکهێنـانی لەشکری حەمیدیە لاپەڕەیـەکی ڕەش بوو لەمێـژووی کـورد، چونکه بـەهۆی ئـەو لەشـکرەوە دەسـتیان چـووە خـوێنی ئەرمـەن و ئەمـەش زیـانی لەبەرژەوەنـدی کـورد داو کردیـە (بەبـەری)وخـوێن ڕێـژ(١٦)لەراستیدا لەسـالٚی ١٨٤٣ وە ناوبـانگی کـورد بـاش نـەبوو، لـەو کاتـەوە گروپـەکانی موژدەدەران و بەرپرسانی بەریتانی و فەرەنسـی دیمـەنێکی ناشیرنیان لەسـەر نـاکۆکی میربـەدرخان و نەسـتووری (ئاشـووریەکان) خسـتبووە ڕوو، ئەوانـە ڕاپــۆرتی درۆو شــیوێندراویان لەســەر کوشــتاری خــەیالٚی ئاشــووریەکان بەدەسـتی کـورد دەنـارد بۆرۆژنامـەکانی رۆژاوا کـەپڕ بـوو لەوەسـفی کـورد بـە(بەربـەری) و دڕنـدەی تینـوو بـە(خـوێنی مەسـیحیەکان)(١٧) ئەمـە حـالی داگیرکەرە ئەگەر خاوەن کەرامەت و بوێر بەرگری لەخۆی بکات (دەماگیر) و (بەبەری)یـە و ئەگـەر لاسای و هاریکای ئەوان بێـت بەنازناوی بـەرزی وەکو (روناکبیر) و (میانەڕەو) و (نیشتیمانی) ناودێر دەکرێت.

توێــژەرەوان یەکــدەنگن لەســەر ســەرکەوتنی ســولٚتان عەبدولحەمیــد لەقەناعەت پێهێنانی هۆزە چالاکە کوردەکان بۆکۆکردنەوەیان لەچوارچێوەی تەشکیلاتی حەمیدیـە لەسنووری رووسیا و دەولٚـەتی عوسمـانی، ئەو هێـزە بەکردەوە بووە هێزێکی بەرگری و نەیهێشت جاریکیتر رووس بیر لەشەڕی

وا پڕلەمەترسی بکاتەوە بۆداگیرکردنی ولایەتەکانی رۆژهەڵات. هێزەکانی حەمیدیە لاپەڕەی گەشیان تۆمارکرد بەتایبەتی لەشەڕەکانی بۆسناو سربیاو یونان، لەسەر قسەی نووسەر وەحیەدین بەراستی بەگیانی سوارچاکی و سەربازی بەرزەوە کورد ئەو لاپەڕانەیان تۆمارکرد(١٨).

ئەم هێزە نانیزامیە هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم لەگەشەسەندن و سەرکەوتن دابوو، هۆزە کوردیەکان لەپێشبڕکێ‌دابوون بۆدەستهێنانی شەرەفی گەورە لەپەیوەندیکردن بەلەشکری حەمیدیە، قەبارەی لەشکری حەمیدیە فراوان بوو لە٤٠لەشکر لەساڵی ١٨٩٢از بۆ ساڵی ١٨٩٩ز بووە ٦٣ لەشکر. زۆری ئیمتیازات و پشتگیری زانایان و شێخانی تەریقەت دەوری گرنگیان بینی لەسەرکەوتنی ئەو ئەزموونە(١٩). ئامانج لەو هێزە بەرپەچدانەوەی رووس و چەتە ئەرمەنیە سنووربەزێنەکان بووە، سوڵتان عەبدولحەمید زۆری هەوڵ دا هۆزە کوردیەکانی کوردستانی عێرق بهێنێتە ناو ئەو تەشکیلاتە بێجگە لەهۆزەکانی سنووری عێراق و تورکیا کە پەیوەندیان بەلەشکری حەمیدیەوە کردبوو[٢٠]. حکومەتی ئیحادوتەرەقی لەساڵی ١٩١٢ز توانی زۆربەی هۆزە کوردەکانی لیوای سلێمانی قەناعەت پێ بهێنێت پەیوەندی بکەن بەلەشکری حەمیدیە ئەوکات ناوەکەی گۆڕابوو بۆفەوجە سووکەکانی سنووور(٢١).

لەگرنگترین ئەنجامەکانی تەشکیلاتی حەمیدیە لەسەر کۆمەڵگای کوردی گەڕاندنەوەی متمانەبووە بۆ کورد بەگشتی و بەتایبەتی سەرکردە تەقلیدیەکانی لەسەرۆك هۆزو زانایانی ئاینی بەتایبەت. دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨١٢- ١٨٣٩) سیاسەتی تازەی بەرانبەر کورد پیادەکردبوو ئەویش بەلەناوبردنی ئەو میرنشینە کوردانەی سەدان ساڵ بوو کاروباری ناوخۆیی میرنشینەکەیان

بەڕیوە دەبرد، لەجیاتی ئەوە دەسەلاتی راستەوخۆی مەرکەزی هێنایە گۆڕیٚ کە لەڕێگەی بەرپرسانەوە بەڕێوە دەبرا، ئەو بەرپرسانەش کەوتنە سەرکوتکردنی خەلك، بەرئەنجامی ئەمە کارەسات و سەرهەلدانی چەندان راپەڕینی کوردانی لێکەوتەوە دژی دەسەلاتی مەرکەزی. پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە ئیمتیازاتی زۆری‌دا بەکورد بەمانای وەستاندنی سیاسەتی تازەو گەڕانەوە بۆ سیاسەتی کۆن، گەڕیدە رۆژاواییەکان چەندین سەربووردە لەسەر زەکی پاشا و سولتان دەگێرنەوە کەچۆن کوردیان پاراست نەك هەر لەدەستی رووس و عەسابەکانی ئەرمەن بەلکو لەدەستی کاربەدەستە خۆجییەکانیش. دەولەتانی ئەوروپا بەبەردەوامی و بەجدی داوای سزادانی هۆزە کوردەکانیان دەکرد، بەرپرسانی عوسمانی لەئەستەنبول رازی بوون و زەکی پاشا و سولتان قبولیان نەدەکرد(۲۲).

توێژەرەوەیەکی هۆلەندی چەندان جار سەردانی ناوچەی کوردانی لەتورکیا کردووەو دەلیٚ هەتا ئێستاش کورد وەکو باوکێکی دلسۆز سەیری سولتان عەبدولحەمید دەکەن(۲۳).

ئەو فەرماندە ناودارانەی لەو ماوەیە پەیدابوون توێژەرەوان ناوی مستەفا پاشای میران دەبەن کە جێگەی متمانەی سولتان بووەو چەندان هێزی حەمیدیەی لەبەر دەستدابوو، مستەفا پاشا توانیبووی جێگەی میر بەدرخانی ناوچەی بۆتان بگرێتەوە، والی عوسمانی و کاربەدەستانی میری نەیاندەتوانی دەست لەکاروباری ناوخۆیی ناوچەکە وەربدەن. ئیبراهیم پاشای میللی سەرۆکی هۆزی میللی (لەسنووری تورکیا، سوریا، عێراق) پەیدابوو وەکو جیٚی متمانەی سولتان. ئیبراهیم پاشا (دایکی عەرەب و لەهۆزی شەمەڕ) بوو، وای لێهات بەکردەوە بووە بەدەسەلاتداری زۆربەی ناوچەکانی نێوان ئورفە، رقە، حەلەب، دیاربەکر. ئیبراهیم پاشا لەتوانای‌دا

هەبوو کاتی پێویست ٢٠هەزار چەکداری حەمیدیە بخاتە گەڕ. ناسیونالستەکانی تورك (ئەو کوردانەی ببوونە تورك وەکو زیا کوك ئەلپ) کاربەدەستی ناوچە کوردیەکان بوون، ئەمانە نیگەران بەدەسەڵاتی ئیبراهیم پاشا حەماسەت بۆخەلافەت، لە١٨٩٤ز خۆپیشاندنیان ڕێکخستو داوایان لەحکومەتی ئەستەنبوڵ دەکرد ئیبراهیم پاشاو هێزەکانی حەمیدیە لەدەوری شاری دیاربەکر دوور بخاتەوە(٢٤). ڤان برۆنسن دەڵێ دڵفراوانی دەوڵەت بەرانبەر سەرهەڵدانی ئیبراهیم پاشا بەو هێزو ڕەفتارە سیاسیو عەسکەریەوە بەڵگەیە لەسەر متمانەی سوڵتان عەبدولحەمید بەکوردو نەبوونی نیگەرانی لەبەرانبەر ناوەندی دەسەڵات لەناو کورد(٢٥).

لەشکری حەمیدیە بەو خاسیەتانە شوێنی لەسەر ژیانی ئابووریو ڕۆشنبیری کوردی بەجێهێشت، سوڵتان فەرمانی کردنەوەی قوتابخانی سەربازیو زانستیدا بۆبەرەو پیشبردنی توانای جەنگیو ئیداری لەشکری حەمیدیە، لەئەستەنبوڵو شارە سەرەکیەکانیتر پەیمانگاو قوتابخانە بەناوی (عەشیرەت مەکتەبلەری) کرانەوە بۆکوڕانی هۆزە کوردیەکانی سەر بەلەشکری حەمیدیە بەئامادەکردنێکی ئیسلامیانەو پێگەیاندنێکی زانستیانە(٢٦) ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر کۆکردنەوەی لاوو روناکبیرانی کورد بەگشتی لەدەوری بیری خەلافەتی ئیسلامی، کورد بەدڵسۆزترین بانگەوازکاری مایەوە لەکاتێکدا بیری نەتەوایەتی درزی خستبووە نێوان خەلافەتو گەلانی دراوسێی. بۆیە غەریب نیە فەرماندەکانی حەمیدیە چەندان ڕاپەڕین سازبکەن بۆگەڕاندنەوەی سوڵتان عەبدولحەمید، ناوچەکوردیەکان سێ ڕاپەڕینی گەورەی بەخۆوە بینی لەبەرژەوەندی سوڵتان، شۆڕشی شێخ سەعیدی بەرزنجی، مەلا سەلیمی بەدلیسی، ئیبراهیم پاشا لەپێناوی خەلافەتی سوڵتان عەبدولحەمید

شۆڕشیان کرد(٢٧) لەبەر ئەوە دەوڵەتە ئەوروپییەکان لەسەردەمی سوڵتان لەسەنگەردابوون بۆلەشکری حەمیدیە، لەیەکەم کۆدەتا کاری ئیتحادیەکان هەڵوەشاندنەوەی لەشکری حەمیدیەو هێرشکردنە سەر ئەفسەرە گەورەکانی کورد بووە لەسوپای نیزامی، چونکە ئەوانە جێی گومانی ئیتحادو تەرەقی بوون، بەڵام حەمیدیەو قوتابخانەکانی سەر بەحەمیدیە شوێنەواری قوڵیان لەسەر کۆمەڵگای کوردستانی بەجێ هێشت، کورد تاساڵی ١٩٢٥ز خەباتی دەکرد لەپێناو خەلافەت، شێخ سەعیدی بالۆ وەك یەکێك لەپشتیوانەکانی سوڵتان جیهادی گەورەی ڕاگەیاندو داواکاری گەڕاندنەوەی خەلافەت بوو، زۆربەی سەرکردەکانی ئەو ڕاپەڕینە لەئەفسەرانی حەمیدیەو دەرچووی قوتابخانەکانی سەر بەحەمیدیە بوون وەك ئیحسان نووریو خالید بەگی جیرانی. پرۆفیسۆر ڕۆبرت ئۆلسن دەڵێ (لەشکری حەمیدیەو قوتابخانەکانی چەندان سەرکردەی سیاسیو سەربازی کارامەی پێشکەش بەکورد کرد)(٢٨).

## لەشکری حەمیدیەو خوێنی ڕژاوی کورد لەدوژمنکاریەتی ئەرمەن

هەندێ لەنووسەرو سەرکردەی ئاراستە نادینیو ناسیونالستی پێیان وایە لەشکری حەمیدیە نەگبەتی بووە بەسەر بەرژەوەندی کوردو ئامرازێکی کارابووە بۆلەناوبردنی گەلی ئەرمەنو دابیکردنی دوژمنکاری ڕۆژاوا بۆ کورد، مامۆستا کەمال مەزهەر لەکتێبەکەی (کوردستان لەساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی) دەیەوێ ئەو بۆچوونە بسەلمێنی.

داوای لێبووردن لەخوێنەر بەدرێژکردنەوەی باسەکەو بەهێناوەی چەند نموونەیەکی ناو کتێبی ناوبراو. مامۆستا لەلاپەڕە ٢٥٧دا دەڵێ (یەکێك لەشێخەکانی کورد بەناوی مەلا سەعید لە١٨٩٥/١/٢٨ز قەسابخانەیەکی بۆ ئەرمەن لەشاری ئورفە سازدا، فەرمانیدا ئەرمەنیەکی بێتاوانیان لەبەردەمی لەسەر زەوی درێژکردو بەدەستی خۆی سەری لەلاشەی جیاکردەوەو هانی خەڵکیدا لەسەر کوشتنی ئەرمەن چونکە ملکەچی سوڵتانی خەلیفە نابن)، بۆئەم هەواڵە پشتی بەستووە بەدیبلۆماسی ئیتالی لەحەلەب، دکتۆر کەمال لەسەری دەڕواو لەلاپەڕە ٢٥٨دا دەڵێ (هەرلەوێ ئاغا کوردەکان کاروانی ئەرمەنیان لەجەندرمە جیادەکردەوەو لەدوای زەوتکردنی ئەوەی پێیانە دەیانکوشتن، لەدوای کوشتن بۆگەڕان بەدوای لیرەی زێڕ سکیان هەڵدەدڕین) بۆئەمەش پشتی بەکتێبەکەی (فائز الغصین) بەستووەو ئەویش لەشوێنی خۆی پشتی بەسەرچاوە ئەرمەنیەکان بەستووە. دکتۆر ڕۆڵی کوردی خەجاڵەت لەبەرانبەر کوشتاری ئەرمەن بۆدەمارگیری کوێرانەو هەستی ئاینی کورد بەرانبەر ئەرمەن ........ مەلاو موفتی (زانایان)و پیاوانی ئاینی بەو پێی ئەو فەرمانەی لەحکومەتەوە دەردەچوو هەستی خەڵکیان دەورووژاندو بەئاشکرا هانیان دەدان بۆکوشتنی ئەرمەن) بۆئەمەش پشتی بەستووە بەڵگەنامەی ناو دەڵەتی عوسمانی کەقونسوڵیەکی بەریتانی باسی کردووە. لەکۆتاییدا دەڵێ (زۆرینەی کوردو ئەوانەی بەشداری کوشتاری ئەرمەنیان کردووە لەسوارەی حەمیدیە بوون، ئەو دامەزراوە سەربازیەی لەبنەڕەتەوە بۆکاری لەو جۆرە پێکهێنرابوو بۆناوزڕاندنی کورد)ل٢٦٢.

سەرەرای ڕێزو تەقدیری زۆرم بۆدکتۆر وای بۆدەچم ئەم زانیاریو هەواڵانەی لەکتێبەکەی باسی کردووە، بەڕاستی دەزانێ وقەناعەتی وایە هیچ هەڵوێستە هەڵناگرێو قابیلی پێداچوونەوە نیە. ئاشکرایە گروپەکانی

ئەرمەنی و نووسەرانی رووس و قونسوڵیەکانی ئەورووپی هاوسۆز لەگەڵ ئەرمەن بەئەنقەست ئەو مەسەلانە گەورە دەکەن و زیادەی پێووە دەنێن بۆمەبەستی ورووژاندنی رای گشتی ئەورووپی هەتا فشار بخەنە سەر حکومەتەکانیان دەست لەکاروباری دەوڵەتی عوسمانی وەربدەن لەبەرژوەندی ئەرمەن. زۆر بەداخەوە نووسەری ناوبراو خۆدەبوێرێت لەراستی ئەو کوشتارە خوێناویەی جەندرمە ئەرمەنیەکان لەدژی کورد لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی ئەنجامیان دا، هەتا هەندێك توێژەرەوەی رۆژاوا وەکو ئەستیڤان شۆی نووسەری ئەمریکی بەسەرژمێری مەیدانی بەزیاتر لە٦٠٠هەزار مرۆڤی کوردی داناوە(٢٩)

نووسەرانی رۆژاوا هەموو لەسەر ئەوەکۆکن لەچوارچێوەی رژێمی میللی عوسمانی ئەرمەنەکان لەسایەی مسوڵمانانی تورك و کورد سەدان ساڵە بەئاشتی و تەبایی دەژین، بەتریاك گریگۆری لەئەستەنبوڵ بەدوای بەرژەوندی ئەرمەندا دەچوو سوڵتان هەموو رێزێکی لێدەنا، بەلام لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەسەلاتدارانی ئەورووپی بەتایبەتی رووسی کەوتنە هاندانی بیری ناسیونالستی لەناو ئەرمەن بەو هیوایەی سوودی لێوەربگرن وەکو پردێك بۆگەیاندنی دەسەلاتی رووسی بەئەنادۆڵی رۆژهەلات. سەربەخۆیی سرب و بولغارو بەشداریکردنی بازرگانە ئەرمەنەکان و باڵوێزی ولاتانی ئەورووپی لەناو دەوڵەتی عوسمانی بەشداری کاریگەری هەبووە لەبلاوکردنەوەی گیانی دوژمنکاری ئەرمەن بەرانبەر دەوڵەتی عوسمانی، بۆئەو مەبەستەش دوو رێکخراوی ئەرمەنیان لەرووسیا دامەزراند بەناوی (هاجناق لەساڵی ١٨٦٦ز و داشناق لەساڵی ١٨٩٠ز) بۆلێدانی دامەزراوە حکومیەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەتا سوپای عوسمانی ناچاری کاری تۆڵەسەندنەوە بکەن لەدژی ئەرمەن، لەئاکامدا

ڕۆژاوا دەست لەکاروباری دەوڵەتی عوسمانی وەردەدات. چالاکیە تیرۆریستیەکانی ئەرمەن هاوکات زۆر بەیەک دەچوون لەگەڵ چالاکیەکانی ڕێکخراوی ئیستریني تۆقێنەر. بەزۆری چەتە ئەرمەنیەکان لەخاکی جۆرجیا یان ئازەربێجان سنووریان دەبەزاندو بەشەو هێرشیان دەکردە سەر ئەو گوندە کوردانەی بەئارامی دەژیان، ماڵەکانیان دەسوتاندو منداڵەکانیان سەردەبڕی و ئافرەتەکانیان دەفراند، ئەمەش بەمەبەستی ترساندنی ئەو گوندەو گوندەکانی دراوسێیان هەتا ئەو گوندانە بەجێبهێڵن. دووبارە کردنەوەی هەمان سیاسەتی جولەکە بوو بۆچۆڵکردنی ئەو گوندەکان هەتا مەیدان چۆڵ بێت بۆکۆچکردنی ئەرمەن بۆ ئەو ناوچانەی پێی دەڵێن (ئەرمینیای کۆن)، چەتە ئەرمەنیەکان دەیانویست کێشەی ئەرمەن بهێننە گۆڕێ بەکوشتنی کوردو سوتاندنی گوندەکانیان هەستی کورد بۆتۆڵەسەندنەوە لەئەرمەن بوروژێنن (٣٠).

لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نیە دۆسیەکی تایبەت بکەینەوە لەسەر کوشتاری کورد بەدەستی ئەرمەن بەتەنها یەک کارەسات باس دەکەین ئەویش ڕووداوی قەزای (سامسۆن)ی کوردیە لەباشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، لەساڵی ١٨٩٤ز چەتە ئەرمەنیەکان بەئیشارەتی ڕووسیا یاخیبوونی گشتیان ڕاگەیاندو بەرپرسانی حکومیان لەناوچەکانی خۆیان دەرکرد، سوپای عوسمانی بۆلایەنگیری بەرپرسانی هاتە ناوشارو شەڕێکی کورت ڕوویدا چەتەکانی ئەرمەن بەئاراستەی شاخەکانی دەورووبەر کشانەوە، بەرێگەوە کەوتنە کوشتاری خەڵک و سوتاندنی کەل‌وپەلی زیاتر لە٣٠ گوند، کاتێک لەشکری حەمیدیە گەیشتە شارەکە گوێبیستی کوشتاری گوندەکانی دەورووبەری بوون لەلای خۆیانەوە هێرشیان کردە سەر ئەرمەن، لەئەنجامی رقی تۆڵەسەندنەوە هەزاران کەسی بێتاوان لەهەردوولا کوژرا،

رێکخراوەکانی ئەرمەنی ئەمەیان قۆستەوەو هەواڵی هەڵبەستراویان لەسەر رووداوەکە بڵاوکردەوە (بەپێی پڕوپاگەندەی ٢٠هەزار ئەرمەن) کوژراوە. ئەمە رای گشتی ئەورووپی هەژاندو داوایان لەحکومەتەکانیان کرد بێنە پێشەوە بۆ وەستانی شەڕی کوردە مسوڵمانە (بەربەری)یەکان لەدژی ئەرمەن، دەوڵەتی عوسمانی لیژنەیەکی بەبەشداری کۆمەڵێ لەرۆژاوایەکان پێکهێناو لیژنەکە بەراپۆرتێکەوە گەڕایەوەو راگەیاندنی ئەرمەن پووچەڵ بۆوە(٣١).

شەڕی ئەهلی نێوان کوردو ئەرمەن هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، ژمارەیەکی زۆری بێتاوان لەهەردوولا بوونە قوربانی ئەو شەڕە هەڵچووە خێڵەکیە، بەتەنهاش وڵاتانی ئەورووپی سوودمەند بوون کەهەرگیز حیسابیان بۆگەلانی ناوچەکەو بەتایبەت گەلی ئەرمەن نەکردبوو.

شەڕی ئەرمەنی . کوردی لەرۆژکاری سوڵتان عەبدولحەمید پیلانێکی دەرەکی بووە بۆتێکدانی بارودۆخی ناوخۆیی دەوڵەتی عوسمانی، ئەرمەن‌و سوپای عوسمانی‌و لەشکری حەمیدیەی بۆکێش کرا، هەندێك لەتوێژەرەوانی ویژدان زیندوو پەردەیان لەسەر بەشێکی ئەو پیلانە لابرد بەڵام چیرۆکی تەواوی ئەو شەڕە دڵتەزێنانە بەتەواوی روون نابێتەوە لەدوای کردنەوەی هەموو دۆسیەکانی عوسمانی‌و رووسیای قەیسەری نەبێت، بەڵام بەڵگەکانی ئیستا هەروەکو برۆنسن دەڵێ ئەوە دەردەخەن سوڵتان عەبدولحەمید سیاسەتی نەخشە بۆکێشراوی نەبووە بۆلەناوبردنی ئەرمەن(٣٢).

پرسیارێکەو بەخەیاڵماندا دێت ئایا ئەرمەن بەپشتیوانی دەرەوە بەکردەوە نیەت‌و توانای گۆڕینی کوردستانی تورکیایان هەبووە بۆدەوڵەتی

ئەرمەنی؟ تاچەند سوارەی حەمیدیە وەکو هێزێکی بەرپەچدانەوەی ئەرمەن بۆسەر کوردستان خزمەتی کردووە؟

لەراستی‌دا رێکخراوە کۆن و تازەکانی ئەرمەنی ئەوراستیەیان نەشاردۆتەوە کەئارەزووی زیندووکردنەوەی مەملەکەتی ئەرمەنی کۆنیان هەیە لەناوچەیەك سەدان ساڵە ناوچەیەکی کوردیە، وەکو لەسەرەتاوە باسمان کرد سەرکردە ئەرمەنیەکان لەچەندان بۆنەدا داوای یارمەتیان لەدەوڵەتانی ئەورووپی کردووە بۆبنیاتنانی قەوارەی ئەرمەنی لەو ناوچانە، لەساڵی ١٨٩٥ز دەوڵەتانی ئەورووپی پێشنیاریان بۆسوڵتان عەبدولحەمید کرد رەزامەندی دەربڕێت لەسەر سیغەی حوکمی زاتی بۆئەرمەن لەولایەتەکانی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات، سیغەی ناوبراو خرابووە ناو بەرنامەی جێبەجێکردنی بەندەکانی پەیوەندیدار بەئەرمەنی رێکەوتنامەی بەرلینی ١٨٧٨ز. ئەورووپیەکان بەتایبەتی رووسیاو بەریتانیا داوای والی ئەورووپی (یان عوسمانی بەرەزامەندی ئەورووپی) یان دەکرد کەئەرکی دانانی رێوشوێنی چاکسازی سیاسی و ئیداری‌و قەزایی بێت لەبەرژەوەندی ئەرمەن لەناوچەکەدا. هەروەها ئەوەی لەداواکاری ئەورووپیەکاندا هاتبوو دانانی لیژنەیەکی یەکسان لەئەرمەن‌و مسوڵمان (کوردو تورك) بۆسەرپەرشتی چاکساریەکان. ئەمە لەکاتێکدا رێژەی ئەرمەن لەوکاتە لە١٨/٠ی دانیشتوانی ناوچەکە تێ‌نەدەپەڕی(٣٣).

لەساڵی ١٩١٢ز بەریتانیا توانی حکومەتی ئیتحادو تەرەقی لەئەستەنبوڵ قەناعەت پێ‌بکات لەسەر سیغەی ساڵی ١٨٩٥ز بەجێ‌بەجێکردنی چاکسازی بۆئەرمەن، ئەورووپیەکان داوایان کردبوو پشکێنەری گشتی (مفتيش العام) دابنرێ لەولایەتەکانی رۆژهەڵات بەهاوکاری کۆمەڵێك لەشارەزایانی ئەورووپی بۆبەڕێوەبردنی ناوچەکە. هەتا ئەڵمانیا هانی سوڵتانی‌دا لەسەر

گوێنەدان بەفشاری رووسی و بەریتانی، لەکاتێکدا ئەو پڕۆژەیەی بەیتانیا پێشکەشی کرد ناوەرۆکی ئەزموونی مەسدۆنیا بوو کە بەسەرخۆیی دوایی هات(٣٤).

هەروەکو لەو دوو ساڵە وتوویژ هەبووە لەسەر کۆچی ئەرمەن بۆولایەتەکانی رۆژهەلات لەئەنادۆڵ کەکوردستانی باکور دەگرێتەوە، ئەو هەرێمانەش لەرێکەوتنامەی سایکس - بیکۆ درا بەرووسیا بەو هیوایەی ئەو ناوچانە بلکێنرێت بەناوچەکانی ئەرمینیای رووسی. لەدوو ساڵی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و کاتی کۆنگرەی سان ریمۆو ساڵی ١٩٢٠ز دەوڵەتە سوێندخۆرەکان بەزەقی لەسەر مەسەلەی دەوڵەتی ئەرمەن قسەیان دەکرد، لەوێ بەکۆی دەنگی نوێنەری دەوڵتە سوێندخۆرەکان ناوچە کوردیەکانی (وان، بەدلیس، دیاربەکر، ئەرزڕۆم) بەشێکی زیندووی دەوڵەتی ئەرمەنی و لەکەناری دامەزراندن دابوو. دەوڵەتە سوێندخۆرەکان لەگەڵ واقیعێکی تاڵ تێك دەگیران ئەویش چۆڵ کردنی کەمینەی ئەرمەنە لەکاتی شەڕ، هەروەها مستەفا کەمال سوپایەکی گەورەی لەکوردان پێك هێناو سوێندخۆرەکانیش پیویستیان بەسەد هەزار سەرباز هەبوو لەولایەتەکانی رۆژهەلات بۆچۆڵکردنی ناوچەکە لەزۆرینەی کوردو چوونە شەڕەوە لەگەڵ هێزەکانی مستەفا کەمال(٣٥).

## پوختەی توێژینەوە

١-سوڵتان عەبدولحەمید بەزیرەکی خۆی درکی بەگرنگی کورد کردبوو لەسیاسەتی دەوڵەتی عوسمانیو زیندووکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامی، هەروەها سوڵتانو بەوردبینی خۆی توانی کورد بگۆڕێ بۆدڵسۆزترین بانگەوازکارانی سیاسەتەکەیو دامەزراندنی سوارەی حەمیدیەش بەرجەستەبوونی سیاسەتێکی حەکیمانە بووە.

٢-تەشکیلاتی سوارەی حەمیدیە شوێنەواری لەسەر مسوڵمانای کورد بەجێهێشتو دڵسۆزی لەدڵیاندا چاندو گەشەی پێدا بۆخەلافەتی ئیسلامی، لەو ماوە مێژوویە کەمە کۆسپی خستە بەردەم گەشەی بیری نەتەوایەتی نائاینی لەناو کورد.

٣-ئەگەر ئەزموونی زایونی لەدەستبەسەراگرتنی فەلەستینو ئەوەی لەبۆسنە روویدا بەهێند وەربگرین ئەوە رابردووی مەترسی ئەرمەن تێدەگەین لەسەر کوردستان، ئەوەی لەشکری حەمیدیەو سوڵتان کردیان مەبەستیان هەرچیەك بووبێت بەشێکی گەورەی کوردستانیان لەمەترسی راستەقینە رزگار کرد لەدەستی ئەرمەنو هاوپەیمانەکانی ئەرمەن.

٤- لەسەر دەوڵەتو جولانەوە ئیسلامی هاوچەرخ پیویستە سوود لەئەزموونی سوڵتان عەبدولحەمید وەربگرن لەمامەڵە لەگەڵ کوردو خۆیان لەپێشنیاری نیشتیمانیو نەتەوایەتیو مەزهەبی بەگەورەتر بزانن.

# سەرچاوەکان

(*) ئەم بابەتە لەژمارە (٣)ی ئەیلولی ١٩٩٣ی ساڵی پێنجەمی گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) بڵاوکراوەتەوە.

(**) هەندێ جار دکتۆر لەخوێندنەوەی بۆ ڕووداووەکان دەچێتە سەر ئەو فاکتەرە فیکریو سیاسیانەی بەناڕاستەوخۆ داینەمۆی ململانێیەکانن، ئەوەی لەسەر کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی خستوویەتیە ڕوو بەڕاستی دانشقەیەو زۆر لایەنی نادیاری ئەو ئاراستەیە ڕوون دەکاتەوە بەڵام ئەوەی لای من جێی تێبینییە سوڵتان عەبدولحەمیدو زۆربەی سەرکردە تەقلیدیەکانی کوردی هاوزەمانی سوڵتانو هاوبیری سوڵتانو بانگەوازکاری گەڕانەوەی سوڵتانە. بەڕاستی ئەو زەمانە ئاڕاستەیەکی مەترسیدار کە لەئیتحادو تەرەقی بەرجەستە ببوو کەوتبووە گیانی ئەو کەلتووە ئیسلامیەی سەدان ساڵە داینەمۆی مانەوەو گەشەسەدنی کۆمەڵگای ئیسلامی بووە، بەڵام من لێرەدا تێبینیم لەسەر کەسایەتیو جۆری بیرکردنەوەو زەخیرەی ململانێی ئەو سەرکردە تەقلیدیانە هەیە کەیەکێك لەتایبەتمەندیەکانیان وابەستە بوون بووە بەسوڵتان عەبدولحەمید، ئەوانەو لەپێشەوە سوڵتان عەبدولحەمید لەبەرانبەر شەپۆلی تازە هەم نەیانتوانیووە گیانی تازە بکەنەوە بەبەر کۆمەڵگاو هەم لەبەر لەبەرژەوەندی دەوڵەمەندیو دەرەبەگایەتی خۆیان نەیانتوانیووە نوخبەی خوێندەواری کورد بخەنە بەرەی خۆیانەوە، بۆیە بەشێك لەهۆکارە بنەڕەتیەکانی سەرهەڵدانی بیری کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بێنەزمیو تەقلیدیەتی سوڵتان و سەکردە کوردە تەقلیدیەکان خۆیان بوون. باشە سوڵتان پەرلەمانو دەستوور هەڵدەوەشێنێتەوە جێگرەوەی چیبوو؟ چەندین بیریاری ئیسلامی وەکو جەمالەدینی ئەفغانی هاوزەمانی سوڵتان بوون ئایا سوڵتان ئەگەر لەئاستی بەرەنگاری بوایە نەدەکرا ئەوانە لەبەرانبەر مەترسیەکان بەگەڕ بخات بەشێوازی بیرکردنەوەی خۆی دەستوورو پەرلەمانو ژیانی ئازادی لەسایەی دەوڵەتەکەی زامن بکات؟ پێم وایە دکتۆر لێرەدا لەبەرانبەر شاڵاوی مەترسیداری ئیتحادیەکان ناچار بووە بەشێك لەناتەواویەکانی سوڵتان و سەرکردە تەقلیدیەکان نەخاتە ڕوو ئەگینا پێم وانیە دکتۆر لەمە بێئاگا بێت کە خۆی لاوازی ئەم بەرە لاوازەی سوڵتانو سەرکردە تەقلیدیەکانی دەرخستووە بەوەی دەڵێ هیچ لەو ڕاپەڕینانە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە لەگەڵ نەمانی سەرکردە ئەوانیش نووشستیان هێناوە.

١- السلطان عبدالحميد (مذكرات السلطان عبدالحميد) ترجمة وتقديم، محمد حرب، القاهرة،٢٥-٢٦.

2-Joan Hqslip, the Sultan: The Life of Abdol Hamid london. 1958. P.211..

٣-اورخان محمد علي (السلطان عبدالحميد الثاني حياته واحداث عهده) كويت، ص٢٤٨-٢٥١.

٤- موفق بنى تامرجة (صحوة الرجل تامريض) كويت، ص٢١١-٢١٣.

٥-كمال مظهر احمد (كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى) ترجمة محمد ملا عبدالكريم، بغداد، ١٩٨٤،ص٨٥-٨٧.

6-Steven Dugid The Politics of Unity: The Hamidian Policy Eastern Anafolia, Midle Eastern Studies 9 (1973): pp. 137-140.

٧-لازاريف (المسئله الكرديه ١٩١٧-١٩٢٣) ترجمه، م حاجي بيروت١٩٩١، ص٣٦-٣٩.

8-British Dicoments on Foreigen Affairs The Near and Middle East 1914 Doc No. 59.pp.433-37.

9-Dugid, pp.139-43.

10-Dugid, pp.42-43.

١١-كمال مظهر،المصدر السبق،ص٧٤.

١٢-جليل جليلي، (نهضة الاكراد الثقافيةو القومية) ترجمة بافي نازيو د.ولات، بيروت، ص٥-٤٥

Air 20/513 {Northern Kurdistan] 20/51

Report, 18-2-1920

١٣-ن. خالفين، خەبات لەرێی کوردستان. وەرگێرانی: جەلال تەقی ، سالێمانی١٩٧١، ل١٤١-١٤٣

Burinessfn,p. 334.

14-E J. Edmons, Kurd Turk And Arabs Oxford Unvirsity Prees. Routeladge, 1948،

١٥-كمال مظهر، المصدر السابق، ص٨٨-٨٩.

١٦-كمال مظهر، المصدر السابق، ص٢٨٢.

17-H.Layard, Ninneveh And Its Remains New York, 1950,p183.

18-Waheed Shaikh, The Kurds, And Their Contry Lahoure, 1958.p148.

19-Van Bruinessen,pp.234-5.

20-S-Longrigg, four Centuries of Modern Iraq Oxfoed Unvesity, Press,1923.pp.310-12.

21-s.Logging, Iraq from 1900 to1950 Oxford Unversty, 1953. P.49.

22-Sir Edwin pears,Life of Abdul Hamid New York,ARNO Prss, New york, 1873. Pp 226-27.

23-Van Bruinessen, p.235.

24-B.Dikson. {Journey in Kurdstan} Geographical Journal 35[1910] pp.370-1 ;Van Bruinessen,p.238.

25-Van Bruinessen, pp.238—39.

26-Van Bruinessen,239

27-Dickson pp.371-2.

28-Bruinessen, p.239; Riport Olson, The Emergence of Kurdish Nationalism And the Sheid Rebellion Texas, University of Texas Press. Pp.32-4.

29-S-Shaw, History of Ottoman Empire And Modern Turky,Vol. 2, Cambridge Univesity Press,pp.202-203.

30-Haslip, p.218.

31-Shaw,pp.203-204; Pears, p.230.

32-Van Bruinessen, p.239.

33-Pears, pp.226-27.

34-British Documeents on Foregn Affairs, Near And Midle East 1908-1914 Vol . 20.Doc.No.59.pp433-4.

35-British Documents on Forign Affairs, The Near And Midle East 1919-1939 Vol.4. Doc. No.492- pp735-7.

## ١_ ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەن شەش ولایەتەکە /١٨٨٢ز

| ولایەت | ٪ ئەرمەن | کۆی دانیشتوان | کۆ | پرۆستانت | کاسۆلیك | غۆریەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەرزرۆم | ١٦/٦ | ٦٥٩/١٥٥ | ١٠٩/٨٣٨ | ١/٩٧٠ | ٦/٧٣٠ | ١٠١/١٣٨ |
| بەدلیس | ٣٨/٩ | ٢٧٦/٩٩٨ | ١٠٧/٨٠٤ | ١/٤٩٨ | ٤/٩٤٨ | ١٠١/٣٥٨ |
| وان | ٢٢/٣ | ٢٦٩/٨٦ | ٦٠/٤٤٨ | — | — | ٦٠/٤٤٨ |
| دیاربەکر | ٢٠/٩٨ | ٢٨٩/٥٩١ | ٦٠/٧٦٩ | ٣/٩٨١ | ٩/٩٥٥ | ٤٦/٨٣٣ |
| مەئموریەی ئەزیز | ١٦/٦ | ٤٨١/٣٤٦ | ٨٠/٠٦٤ | ٤/٩٧١ | ١/٩١٥ | ٧٣/١٧٨ |
| سیواس | ١٣/١ | ٩٢٦/٥٦٤ | ١٢١/٤٧٣ | ١/٩٩٤ | ٣/٢٢٣ | ١١٦/٢٥٦ |

## ٢-ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەن لەقەزا سەرەکیەکانی رۆژهەلاتی ئەنادۆل ١٨٨٢ز

| قەزا | ٪ ئەرمەن | کۆی دانیشتوان | کۆ | پرۆستانت | کاسۆلیك | غوریەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەرزرۆم | ٢٨/٤٠ | ٣٨/٦٨٤ | ١٠/٨٥٠ | ٣٢٨ | ٧٩١ | ٩/٧٣٠ |
| ئەدەنە | ١٥/٠٠ | ٧٠/٦٦٥ | ١٠/٦٠٦ | ٦٣٦ | ٣٤٦ | ٩/٦٢٢ |
| سیواس | ٢٥/٠٩ | ٨٨/٣٧٥ | ٢٢/١٤٧ | ٨٩ | ١/٥٩٢ | ٢٠/٤٦٦ |
| دیاربەکر | ٢٤/٨٥ | ٦٢/٨٧٠ | ١٥/٦٢٦ | ٩٨٣ | ٢/٥٦٠ | ١٢/٠٨٣ |
| وان | ٦٤/٦٢ | ٥١/١٤٩ | ٣٣/٠٥٣ | — | — | ٣٣/٠٥٣ |
| ترابزوون | ٩/٢٢ | ١١٧/٥٦٣ | ١٠/٨٤٦ | ٩١ | ١/٢٠٩ | ٩/٥٤٦ |
| قەیسەری | ٢٠/٨٧ | ١٣٠/٨٩٩ | ٢٧/٣٣٠ | ١/٣١٥ | ٧٦٥ | ٢٥/٢٥٠ |

Source ; J. Shaw ,History of Ottoman Empir and modern Turky- Cambridge Universty Prees 1977, p. 201.

# کوردستان لەسایەی دەسەلاتی ئیتحادو تەرەقی ١٩٠٨ ـ ١٩١٨

- نەتەوایەتی و بیری نەتەوایەتی کوردی لەچوارچێوەی ئیقلیمی
- هێڵە گشتیەکانی سیاسەتی ئیتحادو تەرەقی لەکوردستان
- رۆڵی کورد لەبزافی دەستووری
- کۆمەڵەو یانە کوردیەکان

پاشکۆی بەڵگەنامەکان

& بزافی کوردی دژبەئیتحادیەکان :-

١-ئیبراهیم پاشای میللی

پاشکۆی بەڵگەنامەکان

٢-شێخ سەعیدی حەفید

پاشکۆی بەڵگەنامەکان

٣-مەلا سەلیمی خێزانی

پاشکۆی بەڵگەنامەکان

٤-شێخ عەبدوسەلامی بارزان

پاشکۆی بەڵگەنامەکان

٥-شۆڕشی بەرفراوانی کوردان سمکۆ، سەید تەها، عەبدورەزاق

- کوردستان لەسالانی شەڕی یەکەمی جیهانی

ئـەو قۆناغـەی مێـژووی کوردسـتان و بزووتنـەوەی نەتەوایـەتی کـورد قۆناغێکی ووردو بایەخدارە لەگەشەسەندن و گەڵاڵەبوونی بیری نەتەوایەتی کـورد، هـەر ئـەم قۆناغـەش شـوێنەواری بۆسـەدەی بیسـتەمی دوای خـۆی بەجێهێشـتووە. لێـرەوە بـەکورتیش بێـت دیراسـەی هۆکـارە دەوڵی و ئیقلیمی و زاتییانە دەکەین کەبوونەتـە هۆی گەڵاڵەبوونی بیری نەتەوایەتی لەلای کورد، زۆر پێویستە لێرەدا. ئەگەر بەکورتیش بێت . باس لەگۆڕانکاریە گـەورەکانی کوردسـتان بکـەین لەچوارچێوەی گۆرانکاریەگـەورەکانی تـر، سـەرهەڵدانی نەتەوایـەتی لـەجیهانی ئیسـلامی و بەتابـەتی لـە نـاو عـەرەب و تورك لەگەڵ کاریگەری لە سەرکورد.

دوایـی دەچـێنە سـەر ڕێـرەوی سیاسـەتی یەکیـەتی و بـەرزی (ئیحادوتـەرەقی) بەرامبـەر کـوردو ئاکـامی کاردانـەوەی سیاسـەتی ئـەوان لەکوردسـتان، بۆگەیشـتنە ئـەنجام لـەو بابەتەمانـدا لـە زۆر ڕووەوە بەرنامەیـەکی جیـا لەتوێـژەرەوانیترمان گرتۆتەبـەر لەبابـەت خاسـیەتی کاردانـەوەی گشـتی و ڕێڕەوەکـانی سـۆفیگەری و کاردانـەوەی نوخبـەی کـوردی، ئەگەرچـی خـاڵی هاوبـەش هەیـە لـەتێڕوانین بەرامبـەر سیاسـەتی ئتیحادوتـەرەقی. روونتر بـۆ زیـاتر تـێ گەیشتن لەو بەرنامەیە دەچێتە سـەر چالاکی یانـە کوردیەکانی ئەستەنبوڵ و بزوتنـەوەی شێخ سەعیدی حەفید، مەلاسـەلیمی خیزانـی لـە بـەدلیس، شێخ عەبدوسەلامی بـارزانی، دوایـی لـە هـەوڵی ئـەوە دا دەبـین وەڵامـی ئـەو پرسـیارانە بدەینـەوە کەلـەبیری زۆر لـە نووسـەران و بایەخـدارانی کاروبـاری کـوردانی سـاڵانی(١٩١٠بـۆ ١٩١٤)دا هـاتووە. هەرلـەو ماوەیـەدا هـەموو پێویسـییەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشـێکی بـەرفراوانی کوردسـتان لـە ئـارادا بـووە بەسـەرکردایەتی نـەوەکانی بـەدرخان وشـێخ عوبەیـدوڵڵا بـۆ ڕزگـار کردنـی کوردسـتان لەدەسـەڵاتی تـورکی،

کەهاوزەمان بولغارو رۆمان رزگار بوون، بۆچی کورد نائومێدو ئەوانی‌تر سەرکەوتن؟ ئەم لێکۆڵینەوە زۆر بابەتی یەکلانەکردۆتەوە کە پێویستی بە بەدواداچوونی زیاتری ئەو بەڵگەنامانەیە لەوماوەیەدا لەئێران‌و تورکیا و عێراق نووسراون‌و تائێستا نەگەیشتوونەتە دەست توێژەروان.

## نەتەوایەتی‌و بیری نەتەوایەتی لەچوارچێوەی ئیقلیمی

زۆربەی گەرێدەو توێژەرەوەو پسپۆرە رۆژاواییەکان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە نەتەوایەتی وەکو بیرۆکە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و بەر لە روخانی خەلافەتی عوسمانی بەگشتی لەجیهانی ئیسلامی نەناسراو بووە ، بیری نەتەوایەتی لەرێگەی نفوزی ئەوروپیەوە هاتە ناو جیهانی ئیسلامی، بۆ نمونە (ناپلیون) لەکاتی شاڵاوەکەی بۆ سەر میسر کۆمەڵێك پسپۆری شارەزای بۆدژایەتی ئایینی ئیسلام لەگەڵ خۆیدا هینابوو ، چونکە ئیسلام ئایدۆلۆژیای ئەوانە بووە کەدەسەڵاتی بێگانە قبوڵ ناکەن، کۆمەڵێك لەو پسپۆرانە بەسەرپەرشتی راستەوخۆی ناپلیون کەوتنە جولاندنی هەستی نەتەوایەتی فیرعەونی لەلای میسریەکان‌و لێرەوە بیرۆکەی میسریەتی لەلای میسریەکان سەری هەڵداو (دامەزراوەی میسر=موسسە المصر) ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆی خۆی(١).

لەماوەی دەسەڵاتی موحەمەد عەلی(١٨٠٥ــ ١٨٤٦ز) دامەزراو مسیۆنەرەکان (میسیونەر) لەچالاکی چڕوپڕ دابوون بۆ هاندانی نادینی‌و بەرۆژاوایی کردنی کۆمەڵگای میسری. (کرۆمەر)ی حاکمی ئینگلیزی لە میسر(١٨٨٠ــ١٨٨٩ز) سەرقاڵی گەشەپێدانی ئاراستە نادینیەکان‌و بەرهەڵستی فیکری ئیسلامی بوو، لەگەڵ هاندانی ئەو زانا و ئەدیبانەی

نـەوەی کەمایەتیـە ئاینیـەکانی میسـرن. (جـۆرج ئـەنتۆنیۆس) فەرمانبـەری بالۆیزیخانـە کتێبێکـی بـەناوی(هوشیاری عـەرەب = یقظـة العـرب)نووسـی و (یەعقوب صنوع)یش بەسەرپەرشتی کرۆمەر گۆڤاری(نیشتیمانی میسری) دەرکرد، نەوەیەکی غەرب زادە پەیدا بوو کە ووشەی نیشتیمانیان لەسەر زار بـوو، نەسرانیە عەرەبـەکانی وەکـو بـوتروس بووسـتانی و سلێمان یـازجی و ئەنتوان سەعادە و مشیل عەفلەق لە عەرەبەکانی ولاتی شام کەوتنە چاندنی تـۆی بـیری نەتەوایـەتی، ئەمـەش بەمەبەسـتی دابینکردنـی قەوارەیـەکی جێگـرەوە(بـدیل)ی ئیسـلام هـەتا لەئـەو قەوارەیـەدا بەپشـتیوانی رۆژاوا فەرمانڕەوایـەتیان دەسـت بکـەوێ، هـەر لـەو ماوەیـەدا چـەندین توێژینـەوە ئامـادەکرا لەسـەر بەگـەورەیی نیشـاندانی سـەردەمی نـەفامی لەسـوریا و بانگەشە بۆ هـۆزی سووری و نەتـەوەیی سووری لـەناو نیشـتمانی عـەرەب، هـەروەها ئاراستەی بـەرزڕاگرتنی فیرعـەونی و نەتەوایـەتی میسـری وجەخت کردنەوە لەسەر جیایی گەلی میسر لەگەلانی ئیسلامی، تەها حوسێن نەوەی ئەو قۆناغەی مێژووی میسرە لەکتێبەکەیدا بـەناوی(ئاینـدەی رۆشنبیری لـە میسـر) لـە سـەلماندنی پەیوەنـدی میسـر بـووە بەئـەوروپا لەگـەڵ دابڕانـی لـەجیهانی ئیسـلامی. دەڵـێ پێویسـتە میسـریەکان بەلایـەنی خراپیشـەوە شارستانیەتی ڕۆژاوا قبوڵ بکـەن چونکە ئەمـە ووزە بەخشـە بـۆ پێشـکەوتن، سـاتح حوسـەری لـە دەمـارگیرترین نەتـەوەخوازانی عەرەبیـە دەڵـێ هـەتا کۆدەتـای دەسـتووری ١٩٠٩ز بەسـەر سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم نەتەوایـەتی لـەلای گـەلانی عوسمـانی شـتێکی نەناسـراو و نـامۆ بـووە، سەڵتەنەی عوسمانی لەناو کراوەیەکی ئاینی پتەو گەشـەی کـردو بەئاشکرا بەئاڕستەی ئاینی دەڕۆیشت، پڕ بەمانای دەوڵەتێکی ئیسلامی بووەو دوور بوو لەهەستی نەتەوایەتی تورکی)[٢].

عوسمانیەکان لە بەرامبەر وشەی نەتەوایەتی وشەی (میللەت) یان بەکارهێناوە، هەندێ جار وتبوویان ئاین ومیللەت دوو ڕووی یەك شتن، بیرخەرەوەو تۆمارەکانی عوسمانی ڕەعیەتان دابەش کردووە بۆموسڵمان و ناموسڵمان، لە بنەڕەتەوە نووسینی زاراوەی (تورك)و(کورد)و(عەرەب)بیان بۆ مەبەستی زۆر سنووردار نەبێت بەکارنەهێناوە، وەکو بۆ ناساندنی ناوچەیەك لەڕووی ئەتنۆگرافیەوە . لەڕاستیدا وشەی (تورکی) لە کۆبوونەوە ڕەسمیو ئەدەبیەکاندا ووشەیەکی گران و سەنگین نەبووە، هەروەکو ووشەی (الاعراب)ی ناو عەرەب ئاماژە بووە بۆ خەڵکی سادەو ناکامڵ، هەرلە دامەزراندنیەوە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ئیدارەی عوسمانی بەدەستی ئەفسەرو بەڕێوەبەرە ئەوروپیەکانەوە بوو لەوانەی مسوڵمان دەبوون و دەگیران بەسەرباز بۆخزمەتی سوپاو ئیدارە پێیان دەوترا(ئینکشاری). لەناو سوڵتانەکانی عوسمانی و میللەتانی تری عوسمانی بەشەرمیان نەزانیووە کورد بکەنە سەرۆکی رووحی خۆیان کە ئەو کات پێیان دەوت(شەیخولئیسلام)، ئەم پایە بەرزە بەزۆری لەبن دەستی خانەوادەکانی بەدلیسیو ئامێدیو حەیدەری دابووە لەگەڵ پێشەوایەتی تەریقەتی سۆفیگەری قادریو نەقشبەندی کە هەر هی کوردان بووە.

کاریگەری نەتەوایەتی وەکو بزوتنەوەیەکی فیکری لەسەر نوخبەییەکی ناو دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی تەنزیمات واتە ماوەی چاکسازی (١٨٣٦. ١٨٧٦ز) هاتە ئاراوە، (برناد لویس)ی ڕۆژهەڵاتناسی گەورە دەڵێ بەر لەگەیشتنی بیری ڕۆژاوایی بۆ ڕۆژهەڵات فیکری نەتەوایەتی نەبووە بەڵکو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم تورك و عەرەب هەستیان نەدەکرد بەیەکتری نامۆن، بەهۆی ئایینی هاوبەشەوە عەرەب رازیبوون بەشێك بن لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی و تورکەکانیش شانازیان بەعەرەبەوە دەکردو

رۆشـنبیری‌و زمـانی عـەرەبیان بەنیشـانەی بـەرزی‌و پێشـکەتن دەزانـی، هـەروەها لـۆیس دەڵـێ: ئارتـەر لـۆملی دیڤیـد بەیەکـەم پێشـەنگی فیکـری نەتەوایـەتی تـورکی دەژمێردرێـت، لەسـەر تورکیـا کوڕاسـەیەکی دانـابوو بەناونیشانی لێکۆڵینـەوەی سـەرەتایی(دراسـات تمهیدیـه)، لـەوێدا هـەوڵی دابـوو سـەربەخۆیی رەچـەڵەکی تـورك‌و گـەورەیی ئـەوان بەسـەر عەرەبـەوە بسـەلمێنێ، فوئـاد پاشـا‌و جـەودەت پاشـا(پیـاوانی پێشـەنگی سـەردەمی تەنزیمات) کتێبەکەی(دیڤید)یـان وەرگێڕابوو بۆسەر زمـانی تورکی‌و لـویس دەڵێ: بەم شێوەیە (تورکـەکان لەڕێگـەی رۆژاواییەکانـەوە فێری نەتەوایـەتی بوون)[٣].

سـەرەڕای ئەمانـە دەبیـنین زۆربـەی دەمڕاسـتانی فیکـری تـۆرانی تـورك نـەبوون، ئەحمــەد رەزای سـەرۆکی بزوتنـەوەی ئیحـاد‌و تـەرەقی نیــوە چەرکەسـی‌و نیـوە مەجەڕیـە، ئـەنوەر پاشـا یـەکێك بـووە لـەناودارترین سـەرکردەکانی ئیحادوتـەرەقی پۆڵـۆنی بـووە‌و بۆتـە مسـوڵمان‌و داتـر هەڵگەڕاوەتەوە، جاوید پاشا‌و عەمانۆیل قەرەسۆ لەناودارانی ئیحادوتەرەقی چەندین پلەوپایەی گرنگی دەڵەتیان دیووە، لەوانە پۆستی وەزارەتی دارایی کەلەبنەڕەتـدا لــەگروپی جولەکــەکانی دەوڵــەتی عوسمــانین کــە بە(دۆنمـە)ناسـراون، تەلعـەت پاشـای وەزیـری نـاوخۆ‌و جـەنگی دەوڵـەتی عوسمانی یەکێك بووە لەکۆڵەکەکانی دیکتاتۆریەت بولغاری‌یەو لەڕەچەڵەکدا قـەرەج بـووە، زیـا کـۆك ئـەلپ کـوردی بـەتورککراو، بـەڕووناکبیری بـیری نەتەوایــەتی نـادینی دەژمـیردرێ‌و لەژێرکاریگـەری بـیری سۆشـیالزمی دیموکراتی‌و فەلسەفەی دورکهایم دابووە، عیسمەت ئینینۆی دەستەڕاسـتی مستەفا کـەمالی پێشـەنگی بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی تورکیـا‌و سەرسـەخترین دژە ئیسلام ئـەویش کورد بـووە، وورووژانـدنی دەمارگیری نەتەوایەتی لـەلای

تورك بۆ ڕقەبەرایەتی عەرەب و کورد دروستکرابوو بۆ بەدەست هێنانی سیاسەتی(پەرت بکەو زاڵ بە)، بۆ نەهێشتنی خەلافەتی عوسمانی و چاندنی رق وقین لەناو گەلانی ئیسلامی، ئەمەش مانای وانیە هەموو قۆناغەکانی سەڵتەنەتی عوسمانی بۆخەلافەت دابنێن ، لادانی ئەوانە لەبنەماکانی ئیسلامەتی هەر لەشوراو دادگەری و بەفیڕۆدانی سامانی ئومەتی ئیسلامی بۆ تێرکردنی سوڵتانەکان لەبیر ناکرێ، بەلاّم رۆژاوا ئیسلام و توانا شاراوەکەی دەناسن لە هوشیارکردنەوەی گەلانی مسولمان، بۆیە سووربوون لەسەر دەستبەسەراگرتنی دەوڵەتی عوسمانی چونکە سەرەڕای ئەو نەخۆشیانە ترسیان هەبوو ببێتە چوارچێوەیەك و چاك بێت و سەرلەنوێ ببێتەوە رەمزی یەکیەتی گەلانی مسوڵمان، بۆیە ناڕاستەوخۆ دەست بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا گیرا، بەچاندنی بیری ناسیونالستی و لابردنی ئەو کۆڵەکانەی دەوڵەتی عوسمانی راگرتبوو، ئەم بیرەش لەبزووتنەوەی ئیتحادوتەرەقیەوە بەرجەستە ببوو کەدەیویست رژێمی مەرکەزی بەسەر گەلانی عوسمانیدا فەرز بکات و هەموویان لەئومەتی توورکیدا بتاوێنێتەوە.

## هێڵە گشتیەکانی سیاسەتی ئیتحادو تەرەقی لەکوردستان

بەکورتیش بێت قسەکردن لەسەر سیاسەتی ئیحادیەکان لەکوردستان پێویستی بەخستنەڕوویەکی فیکری و سیاسی ئیتحادیەکان(١٩٠٨-١٩١٨) هەیە، لەساڵی ١٩٠٨ز کومەڵێك لەئەفسەرانی عوسمانی لە(سالۆنیك) لەمەقدۆنیا خۆیان سازدا بوو بۆهەڵگەڕانەوەیەکی سەربازی دواتر تیپێکی بولغاری پەیوەندی پێوەکردن و بەرەو ئەستەنبوڵ کەوتنەڕێ بۆئەوەی سوڵتان عەبدولحەمید ناچار بکەن کار بەو دەستووره بکات کە کاتی خۆی مەدحەد پاشای سەرۆك وەزیران و هاوڕێکانی و دەوڵەتە ئەوروپیەکان ئامادەیان کردبوو، لەدوای دوو ساڵ سوڵتان عەبدولحەمید لەساڵی ١٨٧٨ز وەستاندی چونکە پێی وابوو بەرنامەیەکی ئەورووپیەو بۆ دەوڵەتی عوسمانی کە بونیادی لەسەر کەلەپوورو شارستانی ئیسلامەتیە باش نیە(*).

خەلفیەتی فیکری ئیحادو تەرەقی دەگەڕێتەوە بۆ نووسراوە لیبرالیەکانی تورك لەسەردەمی تەنزیمات وەکو نووسینەکانی نامیق کەمال (کەلەژێرکاریگەری فەیلەسوفی فەڕەنسی مۆنتیسکۆ دابووە) و شوناسی ئەفەندی و زیا پاشا، ئەم بیرۆکەیە لەسەرەتاوە لەژێرکاریگەری ڕۆژاوا لەگۆڤاری (تصوير الافكار)دا بەدیارکەوت و دوایی پەڕیەوە بۆ ئیتحادو تەرەقی کەلەساڵی ١٨٩٣ز عەبدوڵلا جەودەت و ئیسحاق سکوتی کوردی و ئیبراهیم تەمۆی چەرکەسی دایان مەزراند، ڕۆژنامەیەکیان بەناوی(عوسمانی) دەرکرد، ئینجا ئەم بیرۆکەیە هەموو ئەندامانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی گرتەوە. زۆربەی لایەنگرانی تورکیای لاو ئەوانە بوون

کەزمان و ئەدەبی ئەورووپی یان خویندبوو یان لەژێرکاریگەری بزووتنەوەی وەرگێڕانی ئەورووپی دابوون، هەندێ لەوانە لەکەناڵی دیبلۆماسی کاریان کردبوو یان دەرچووی کۆلیژە تازەکانی سەربازی و پزیشکی و ئەندازیاری بوون لەئەستەنبوڵ کەبەرنامەو زۆربەی مامۆستاکانیان ئەورووپی بوون(٤).
لایەنگرانی توورکیای لاو لەژێرکاریگەری گشتی بیری رۆژاوایی و بەتایبەتیش بیری شۆڕشی فەرەنسی دابوون وەکو یەکسانی و ئازادی و برایەتی، ئەندامانی تورکیای لاو عەلمانی بوون و دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی کە پشتبەستوو بوو بەشەریعەت و خەلافەت بگۆڕن بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی و مەلەکی(سەڵتەنەت)و دەستووری و مەرکەزی وەکو وڵاتانی ئەورووپی . ئەحمەد رەزا مەجەری بەتورککراو یەکەم سەرۆکی ئیتحادوتەرەقی لەپاریس و بیار لاسی فیاتی شاگردی(ئۆگۆست کۆنت)ی فەیلەسوفی شۆڕشی فەرەنسی رۆژنامەی(مەشروتیەت)یان بڵاوکردەوە کەلەناو دەوڵەتی عوسمانی بڕەوی بەبیری شۆڕشی فەرەنسی دەدا(٥)، هەر لەناو ئیحادو تەرەقی رەوتێکی تر هەبوو بەسەرۆکایەتی میر سەباحەدین کوڕی داماد مەحمود جەلالەدین لەدایکیەوە عوسمانی و یەکەم ماسۆنی بوو بەد رەوشت و ماڵی خەڵکی دەدزی، بەربەرەکانی ئەحمەد رەزایان دەکرد، سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانی دادگایی کردنی داو ئەویش لەگەڵ خێزانەکەی هەڵات بۆ پاریس، لەوێ پەیوەندی کرد بە بەرهەڵستکاران، سەباحەدین لەوێ کۆمەڵەیەکی بەناوی (رێکخراوی دەستپێشخەری فەردی و لامەرکەزی) پێك هێنا، خواستی ئەو کۆمەڵەیە بڵاوکردنەوەی بیری نووسەری فەرەنسی ئادەم سمیت بوو، بانگەشەی بۆ رۆشنبیری ئەنگلۆ - سەکسۆنی دەکرد بەوەی دەوڵەتی تازە چۆن دەگەنە ئاستی پەرەسەندنی ئابوری و سیاسی ئەو کاتەی بەریتانیا، هەروەها میر سباحەدین بانگەشەی

بۆ دەستێوەردانی ئەوروپی و فەرزکردنی چاکسازی دەکرد بەسەر دەوڵەتی عوسمانی، بەمەش ئەرمەن لێی نزیک بوونەوەو لەدەرەوە پشتیوانی پڕۆژەکەیان دەکرد(٦)، بەر لەساڵی١٩٠٩ز بانگەوازی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بانگەوازێکی ناسیونالستی توورکی نەبووە، بەڵکو گوتاری میللەتی عوسمانی بووە لەگەڵ داوای دەستوورو مەرکەزیەت و ئاکاری لیبرالی بۆ هەموو عوسمانیەکان، بۆ نموونە عەبدوڵلا جەودەت لەژمارە سێی ڕۆژنامەی عوسمانی ووتارێکی نووسیوەو دەڵی :- (نەمان ویستووە بەرهەڵستی هیچ زمانێکی نەتەوەکانی عوسمانی بکەین، بەلام ئێمە دڵنیابووین ئەگەر کار بەدەستوور بکەین ئەوە دەسەلاتی عوسمانی دەبێتە هی هەموو لایەك و یەکسان دەبن و زمان و نەتەوەکانی مافی خۆیان وەردەگرن و پەرەپێدان و گەشەسەندن دێتەدی و بەبێ کەس بواردن دەوڵەتی عوسمانی دەبێتە هاوەڵی هەموو لایەك .(٧)

بەسەرۆکایەتی میر سەباحەدین کۆمەڵەی تورکیای لاو لەساڵی ١٩٠٩ز بەئامادەبوونی ژمارەیەکی بەرچاو لەنوینەران و نمایندەی ئەرمەن و نوینەری عەرەب و کوردو ئەلبانی و بەپیرۆزبایی دەوڵەتە ئەوروپیەکان و پێگەی ماسۆنی لەسۆلانیك و پاریس کۆنگرەی خۆی بەست، هەر ئەوانیش لەگەڵ ئەرمەن خەرجی کۆنگرەکەیان گرتە ئەستۆ، لەپێش ساڵی ١٩٠٧ز کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی لەدەستووری خۆیدا بڕیاری مسۆگەرکردنی مافی گەلانی دابوو لە خوێندنی قۆناغی سەرەتایی بەزمانی ناوچەیی خۆیان(٨).

لەدوای کۆدەتای ١٩٠٨ز کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی وەکو پارتە نازیی و مارکسیەکانی ئەورووپا گۆڕا بۆ پارتێکی گشتگیر، لەلایەك داوای هێشتنەوەی سوڵتان عەبدولحەمیدیان دەکرد وەکو خەلیفە لەلایەکی ترەوە لەهەموو دەسەلاتێکی هەقیقی دایاندەماڵی لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجومەنی

نوێنەران کرایەوەو ئەنجومەنی پیاوماقولان پێك هێنرا هەتا بۆ مسوڵمانان ببێتە دەرفەتێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئازادی، بەڵام ئیتحادیەکان کەوتنە دەستێوەردانی ئاکامەکانی هەڵبژاردن‌و سەرکەوتنیان بۆ لایەنگانی خۆیان مسۆگەر کرد، هەروەها زۆربەی ئەرکە سەربازی‌و سیاسی‌و رۆشنبیریەکانیان سپارد بە لایەنگرە تازەو ناکامڵەکانی خۆیان، لەئەستەنبوڵ بەئاشکرا رۆژنامە هەبوون هێرشیان دەکردە سەر شەریعەت‌و بڕەویان بەسنوور بەزاندن‌و بیری ماسۆنیەت دەدا بەتایبەت رۆژنامەی (تونەین)ی رەسمی کە(حوسێن جاهید) دەری‌دەکرد(٩)، لەسایەی عەسکەرتاریەت مزگەوت دەکرا بەقاوەخانەو ماڵی تایبەت بەلەشفرۆشی بڵاوببۆوە، دەوڵەتی عوسمانی لە چەند لاوە تووشی داڕووخان‌و تێکشکان هات، بەهۆی پەیوەندی پتەوی نێوان بزووتنەوەی زایونی، سەرکردەکانی ئیتحادو تەرەقی بەتایبەت تەلعەت بەگی وەزیری ناوخۆو جاوید بەگی جولەکەو نوێنەری سالۆنیك لەئەنجومەنی نوینەران‌و وەزیری دارایی‌و قەرەسۆو داود کۆهین هەردوو جولەکەی ماسۆنی‌و سەرکردە ناودارەکانی‌تری ئیتحاد کۆچی جولەکە بۆ فەلەستین زیادی کرد(١٠).

خراپەکاری ئیحادیەکان جەماوەری بێزارو ناچار کرد لەدەوری بەیداخی کۆمەڵی سەربەخۆی وەکو (یەکیەتی برایەتی موحەمەدی= اتحاد جمعیتی محمدی) کۆببنەوە کە حافیز دەرویش وەحدەتی سەرۆکی بوو، رۆژنامەیەکی بەناوی(بورکان)ەوە دەرکرد، ئامانجی ئەو کۆمەڵەیە پاراستنی دەستوورو ئازادی‌و پێکەوە گونجانی نێوان چاکسازی‌و ئیسلام‌و سنووردانان بوە بۆ دیکتاتۆری‌و دڵڕەقی دەسەڵاتی ئیتحادیەکان. لەنیسانی ١٩٠٩ز هەندێ لەیەکە سەربازیەکانی ناو ئەستەنبوڵ شەپقە ئەوروپیەکانی سەری خۆیان فڕێ‌داو کەوتنە خۆپیشاندان بەبژی سوڵتان‌و شەریعەت

دەبێت ئیحادیە بێدینەکان لەبەرپرسیاریەتی سوپاو ئیدارەو رۆژنامە دووربخرێنەوە، ئەم راپەرینە لەلایەن زۆربەی خەڵکیو زانایانەوە پێشوازی لێکرا، بەڵام ئیحادیەکان بەهۆی باڵادەستی بەسەر سوپاو رۆژنامەکانەوە، بەپشتیوانی یەکە سەربازیەکانی سالۆنیكو بەفەرماندەی ئەفسەری عەرەبی مەحمود شەوکەت هێرشیان بردە سەر ئەستەنبوڵو راپەرینەکەیان سەرکوت کرد، ئیتحادیەکان ئەو راپەرینەیان بە(بزووتنەوەی کۆنەپەرستی) ناوبرد، سوڵتان عەبدولحەمیدیش بەوە تاوانبارکرا کە بۆ مەبەستی لەکارخستنی دەستوورو ئازادی گشتی لە پشت راپەرینەکەوە بووە، بۆیە لە شوێنی خۆی لایان بردو موحەمەد رەشادی نەخۆشیان بەناوی موحەمەدی پێنجەمەوە لەشوێنی دانا(١١).

نوشستی ساڵی١٩٠٩ز قۆناغێکی نوێیە لەدیکتاتۆریەتی ئیتحادیەکان، هەتا هەندی لەسەرکردە پلەبەرزی ئیتحادیەکانی بەڕەچەڵەك ئەورووپیو بەتورککراو لەجولەکەکانی دۆنمەو مەجەڕیو ئەلبانی کەوتنە بانگەشەی زیاتری مەرکەزیەتو زاڵبوون بەسەر دامەزراوە ئیسلامیەکان، نازم بەگی گەورە ئیتحادی ئەو سەردەمە دەڵێ:(ئێمەی عوسمانی ئایین فرێ نەدەین بۆپشت خۆمانو زاناکان لەقالب نەدەینو هەنگاو بەهەنگاو لەدوای فەرەنساوە نەڕۆین پێش ناکەوین)(١٢). لێرەوە بەراشکاوی بانگەوازی بەتوورککردنی دەوڵەتو دوورخستنەوەی سەرکردە ناتورکەکانی پێشووی ناو ئیتحادیەکان بەدیارکەت، چەندین سەرکردەی نەوەکانی کوردو عەرەبی ناو ئیتحادیەکان وەلانران، هەموو قوتابخانەو کۆمەڵەو رۆژنامەکانی گەلانی ناتورك داخران، حوسێن جاهیدی جولەکەو هەڵگری پەیامی تورکیزم لەرۆژنامەی (تونـین)دا دەیوت: تورك خاسیەتی رزگاریکاریان هەیە،

خاوەنی ئیمتیازاتی بەرزن، بۆیە نابێت مافیان لەگەڵ گەلانی‌تر یەکسان بێت، دەستووری عوسمانیش لەکۆتایی هەر دەستووری تورکیا دەبێت(١٣).

بیرۆکەی تۆرانیەت زاڵ بوو بەسەر ئایدۆلۆژیەتی دەوڵەتو زیا کۆك ئەلپ و یوسف ئاکچرا وەك ناودارترین بانگەوازکارانی ئەو بیرۆکەیە دەرکەوتن، دامەزراوی تورك ئۆجاغی (یانەی نەتەوەیی تورکی)یش کەوتە گەشەپێدانی بنەماو خاسیەتەکانی بیری نەتەوایەتی، هاوپەیمانیەتی پتەوی ئیتحادیەکان بۆ وەرگرتنی ئەم دەمارگیریە وەکو بەدیاردەکەوێ ئەڵمان بووە، ولیەم (ئیمپراتوری ئەڵمانی) لەووتارێکی بۆ ئیتحادیەکان وتبووی: ئێوە پێویستان بەگەلانی ئەوروپی نیە دەتوانن دەوڵەتێك دروست بکەن پێك بێت لەگەلانی تورکیاو ئێرانو بوخاراو تورکستانو قەوقاز، ئەو دەوڵەتە تۆرانیە دەبێتە زیاتر لە١٨٠ ملیون تورکی(١٤).

## رۆڵی کورد لەبزووتنەوەی دەستووری

کردەوەکانی ئیحادو تەرەقی کاری لەنمایندەی گەلانی ناتورك کرد لەسایەی پارتی ئازادیو ئیئتلاف بەسەرۆکایەتی میر سەباحەدینو پارتو کۆمەڵە بەرهەڵستکارەکانی‌تر کۆببنەوە، پارتی ئازادی داوای لیبرالی دەکرد لەگەڵ ماف خویندن بۆ گەلانی عوسمانی بەزمانی خۆیان و هەروەها لامەرکەزیەت بۆ عەرەبو کوردو ئەرمەن، ئیتحادیەکان بەوپەڕی توانا کەوتنە لێدانی ئەو پارتە، ئەوانیش ناچار لەتەمووزی ساڵی١٩١٢ز کۆدەتایەکی سەربازیان ئەنجامدا، بەڵام ئیتحادیەکان لەساڵی دواتر کۆدەتای سێیەمیان کردەوەو هاتنەوە سەر حوکم(١٥) کۆدەتا سەربازیەکانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقیو سیاسەتی کوشتنو دەرپەڕاندنو لەناوبردنی

خەڵکی ناتورك هاوتای دەسەلاتی خوێناوی(جاکۆبین)ە لەفەڕەنسا، ئەوەی لەماوەی تەمەنی دوو ساڵی دەسەلاتی ئیتحادیەکان کرا سوڵتان عەبدولحەمید لە٤٠ساڵی دەسەلاتی خۆیدا نەیکردوە، لەکاتێکدا سوڵتان ناحەزەکانی خۆی دوور دەخستنەوەو نەیدە کوشتن، کەچی راگەیاندنی رۆژاوا ناوی نابوو سوڵتانی سوور چونکە کەنیسەی ئەوروپی بەپاڵپشتی ئەرمەن و قونسوڵیەکانی وڵاتانی ئەوروپی لەناو دەوڵەتی عوسمانی و رۆژاوا وێنەی سوڵتانیان وەکو جەلادی ئەرمەنان نیشان دابوو، دوای کۆدەتاکەی ١٩١٣ز سەردەمی سێگوچکەی دیکتاتۆریەت، ئەنوەر پاشا و تەلعەت پاشاو جەمال پاشا زۆربەی پایە ئیداریە گەورەکانی دەوڵەتی عوسمانیان وەکو وەزارەتی دارایی و دەرەوەو ناوخۆیان دەستبەسەراگرت، وای لێهات زۆربەی کاربەدەست و ئەفسەرە بچوکەکان لەپێناو گەیشتن بەدەسەلات پەیوەندیان بە سێگوچکەی دیکتاتۆریەت و پێگە ماسۆنیەکانەوە کرد، ئەم دیاردەیە گەیشتە هەرێمەکانیش(١٦)، هەتا کارگەیشتە بوونە ماسۆنیەت لەلای نەوەی چینی خانەدانان و رۆشتبیران لەهەریەك لەبەغداو دیمشق و قاهیرەو قودس شتێکی ئاسایی بێت.

کورد لەسەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی رۆڵی قیادی بینی لەبوارەکانی فیکری و سیاسی بەلام هەر زوو تۆرانیەکانی تورك (ووردتر بەتورککراو)دەستیان بەسەردا گرت و کەوتنە چەوساندنەوەی ئەو هاوڕێ کوردانەی خۆیان کەپێیان دەوترا(کوردستانی لاو)، عەبدوڵلا جەودەت و ئیسحاق سکۆتی لەدامەزرێنەرانی ئیتحادی عوسمانی بوون کەدواتر گۆڕا بۆ ئیتحادو تەرەقی، عەبدوڵلا جەودەت روناکبیری بنەڕەتی و سەرنووسەری چەند رۆژنامەیەك بوو کەپڕوپاگەنەیان بۆ فیکری ئیتحادیەکان دەکرد، بەتایبەتی رۆژنامەی (عوسمانی)و گۆڤاری (ئیجتیهاد)

کەهەردووکیان لەئەورووپا و دواتر لەقاهیرە بەمتمانەی ئیدارەی بەریتانی و بەپاڵپشتی دارایی و سیاسی ئەوان دەردەچوو، بانگەوازیان بۆ لەسەرکار لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید دەکرد، ئەم دوو رۆژنامەیە بەهاوکاری لەگەڵ رۆژنامەی کوردستان کە لەجنێڤ و قاهیرە لەلایەن مەدحەت و عەبدورەحمان بەدرخان دەردەچوو، هەرسێ بڵاوکراوە بۆ پوچەڵکردنەوەی هاوکاری نێوان سەرۆك کوردەکانی ناو سوارەی حەمیدیە و سوڵتان عەبدولحەمید جەختیان دەکردە سەر برایەتی کورد و ئەرمەن(١٧).

سەرەڕای پەیوەندی پتەوی نێوان عەبدوڕەحمان بەدرخان و ئیتحادیەکان ناوبراو چەندین ووتاری لەڕۆژنامەی عوسمانی زمانحاڵی ئیتحادیەکان نووسیووە، هەروەها ژەنەراڵ شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشای خەڵکی سلەیمانی و وەزیری پێشووی دەرەوەی عوسمانی لەسەرەتای دامەزراندنی ئیتحاد و تەرەقی لەسوید و پاریس لەڕووی دارایی و رێخستنەوە رۆڵی گرنگی گێڕا لەڕووی، شەریف پاشا بەردی بناغەی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ئیتحادیەکان و ئەڵمانیای داڕشت کەدواتر لەشەڕی یەکەمی جیهانی گەشەی کرد و بووە هاوپەیمانی دووقۆڵی. سەید عەبدولقادری شەمزینی لەساڵی ١٨٩٦ز پەیوەندی کرد بەلقی ئەستەنبوڵی ئیتحاد و تەرەقی و رۆڵی قیادی گێڕا و کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر رێکخستنی زانایانی ئاینی بۆ ئەو کۆمەڵەیە، لەسەرەتای ساڵی ١٩٠٠ز سوڵتان عەبدولحەمید پیلانێکی داڕێژاوی تیرۆرکردنی خۆی ئاشکرا کرد بۆی دەرکەت شەمزینی و خزمەکانی چوونەتە ناو ئەو تیپەی بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکرابوو، بۆیە ئەویشی دوور خستنەوە بۆ مەدینە، هەروەها کورد رۆڵی کاریگەری هەبووە لە لقی میسری ئیتحاد و تەرەقی ، کوڕانی بەدرخان ئەو لقەیان بەڕێوە دەبرد(١٨) حیکمەت بابان و عەبدوڕەحمان بەدرخان لەکۆنگرەی یەکەمی

ئیتحادو تەرەقی ساڵی١٩٠٢ز وەکو نوێنەری کورد ڕۆڵی بەرچاویان بینی و لەکۆنگرەی دووەمیش عەبدوڕەحمان بەدرخان لەساڵی ١٩٠٧ز بەشداری کرد، بەڵام عەبدوڵڵا جەودەت بۆ ئەو کۆنگرەیە بانگ نەکرابوو بەخیانەتکار تاوانبار کرابوو چونکە لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمید لەیەکگەیشتبوون و کرابوە باڵوێزی عوسمانی لەڤیەننا(١٩)، سولتان پەیوەندیەکی تایبەتی هەبووە لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخانیەکان و هەندیکیان لەنزیکەوە لەگەڵ سوڵتان دابوون و لەخۆی نزیك کردبوونەوەو پلەی گرنگی پێدابوون، بەڵام لەساڵی ١٩٠٦ز ڕیزوان پاشای پاسەوانی تایبەتی سوڵتان عەبدولحەمید تیرۆرکرا، شامیل بەگ بەدرخان و عەبدورەزاق بەدرخان بەو کارە باوانبار کران، لێرەوە نەگبەتی بەدرخانیەکان دەستی پێکرد، سوڵتان لەبارودۆخێکی زۆر نارحەتدا ١٠٠ پیاوی لەخانەوادەی بەدرخانیەکان دوور خستەوە بۆ تەرابلوس و فەززان لەلیبیا، بەمەش کورد بوونە بەشێکی کاریگەری بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری ناوخۆ(٢٠)، لێرەوە تێدەگەین سوڵتان لەژیانی خۆی زۆر مەترسی لەسەر بووە، زۆرترین جێ‌متمانەکانی لەغەیری تورك بەتایبەت عەرەب و کورد بووە، کوتلای لەسەر زاری سوڵتان عەبدولحەمیدەوە دەگێڕێتەوەو دەڵی : لەسەر پشتبەستنی من بەکوردان بەتایبەت بەکوڕانی بەدرخان لەئیدارەی ئەستەنبوڵ ڕەخنەم زۆر لێدەگیرێ بەڵام من قەتاعەتم بەو سیاسەتە هەیە(٢١). ئەمە بەڵگەیە لەسەر نارەزایی دەورووبەری سوڵتان لەو هەموو کوردانەی دەستیان بەسەر ئیدارەی حکومەت داگرتوە بەتایبەت (بەڕیوەبەرایەتی مابین)و (بەڕێوەبەرایەتی دیوان)و (تەشریفات)، ئەم بەڕیوەبەرایەتیە گرنگانە پڕبوون لەنەوەی بابانی و بەدرخانیەکان، خەڵکی ئیرەیی و دڵڕەق کەوتبوونە خۆ بۆ بەدەستهێنانی دەرفەتێك هەتا کاریان لەسوڵتان کرد بەو دڵڕەقیە مامەڵە

لەگـەڵ بەدرخانیـەکان بکـات، لـەو بارەیـەوە لازاریـف دەڵـی: قەناعـەتیان بەسوڵتان کرد مەترسی کوردی لەسەرە، ئەمەش بووە هۆی وازهێنانی لە پشتبەسـتن بـەکوردو داخسـتنی قوتابخانـەی عەشـیرەت مەکتەبلـەری (کەتایبەت بووە بەنەوەی هۆزو شێخەکانی عەرەب و کورد لە ئەستەنبوڵ و شـارە کوردیـەکان) دەرچـوانی ئـەو قوتابخانانـە وەکـو ئەفسـەرو ئیـداری لەناوچەکانی خۆیـان دادەمەزران(٢٢). لەساڵی ١٩٠٨ بـەدواوە وورده وورده ئیتحادو تەرەقی گۆڕا بۆ رێکخراوێکی تۆرانیەت و نوخبەی کوردیش وای لێهات بەدوو ئاراستە کاربکات. یەکەمیان: پێکهێنانی رێکخراوی کوردی و دووەمیان: لەناو رێکخراوەکانی بەرهەڵستکاری ئیتحادو تەرەقی کاربکات. لێـرەدا کـورد هەنـدێ جـار رۆڵـی سـەرەکی و سـەرکردایەتی بزووتنـەوەی بەهەرڵسـتکاری بینیـوە، لـەناودارترین ئـەو کەسـانە مـەولانا زادە رەفعـەت، ژەنـەراڵ شـەریف پاشـا، زەینەلعابـدین فـانیزادە رەوانـدزی، عەبـدوڵڵا جەودەت، لوتفی فیکری، روحات خاوەنی کتێبی ژیانی شەریف پاشا پێی وایە شەریف پاشا لەبەهێزترین و هاندەرترین بەرهەڵستکاری ساڵانی ١٩٠٩- ١٩١٨ز سێگوچکەی دیکتاتۆریـەتی ئیتحـادو تـەرەقی بوون لـەتورکیا، بۆیـە لەلایـەن ئیتحادیەکانـەوە چەندین جار هـەوڵی تیرۆر کردنی دراوە، شەریف پاشـا لـەداماڵینی رووی راسـتەقینەی ئیتحادیـەکان درێغـی نـەکردو ببـووە دڕکی چاویان، لەبواری مادی و مەعنەوی لەهەوڵ دابوو بۆ داماڵینی رووی راسـتەقینەی دیکتاتۆریـەتی ئـەوان، شـەریف پاشـا لەسـاڵی ١٩٠٩ز وازی لەئەندامیـەتی ئیتحـادو تـەرەقی هێنـا، توێـژەرەوان هۆکـاری جیـا بـۆ ئـەم وازهینانـە دەهێننـەوە، لەوانـە:- ١-لەئیتحادیـەکان نیگـەران بـووەو وازی هێنـاوە چونکە نـەیانکردوە بـەباڵوێزی حکومـەتی تـازە لەپاریس لەلەنـدەن. ٢-گوایـە ئەحمـەد رەزای سـەرۆکی ئیتحادیـەکان گومـانی لێی هـەبووەو

هەوڵی تیرۆر کردنی داوە بەڵام بەخوێندنەوەی یاداشتەکانی شەریف پاشا بەڕوونی هۆی ئەو وازهێنانەمان بۆ بەدیار دەکەوێ کەدەیگەڕێتەوە بۆ ئەو ناکۆکیە سیاسیە جەوهەریانەی هەبووە لەنێوان بۆچوونی جیای ئەوو ئیتحادیەکان لەسەر چۆنیەتی دەسەڵات، لەو بارەیەوە دەنووسێ:-

پێویستە بەتەواوی سوپا لەسیاسەت و دەست تێوەردانی کاروباری ئیداری جیا بکرێتەوە، ئەنجومەنی بە ئازادی هەڵبژێردراو لەجیاتی سەرکردایەتی ئیتحادو تەرەقی بکرێتە سەرچاوەی دەسەڵات لەئیدارەو حوکم، پێویستە دان بنێین بەخاسیەتە تایبەتەکانی هەموو لایەك و ئەو فرەلایەنیەی لەکۆمەڵگای عوسمانی‌دا هەیە قبوڵ بکرێت، مافی هەموو لایەك بدرێت، سوپا هی‌هەموانەو نابێت بەتەنها لەژێر دەسەڵاتی یەك حیزب دابێت(٢٣).

لازاریف ئەوەمان بیر دەخاتەوە (حیزبی موجەدید) کە لوتفی فیکری دایمەزراندبوو، لوتفی کورد بووەو ئەندامی ئەنجومەنی پیاوماقوڵان و پیاوێکی نادینی بووە، بانگەشەی بۆ جیاکردنەوەی ئایین لەدەوڵەت و هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت کردووەو زۆربەی ئەندامانی حیزبەکەی لەئەستەنبوڵ نوخبەی کوردی بوون(٢٤).

شەریف پاشا لەوازهێنانیەوە هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی سەرکردایەتی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری دەکرد دژی ئیتحادیەکان، لەساڵی ١٩٠٩ز لەپاریس تیپی چاکسازی بنەڕەتی دامەزراند، ژمارەیەکی زۆری روناکبیرانی تورکیای لاو لەو تیپ (پارت)ە کۆبوونەوە، وەکو عەلی کەمال، مەولانا زادە رەفعەت، بیرتف تۆفیق، رەفیق نەوزاد، کەمال عەونی بەگ. بەماوەیەکی کەم ئەم تیپە لەناوەوەش توانی خۆی رێك بخات کە پێیان دەوت(کۆمەڵەی نهێنی). رەزا نوور یەکێك بووە لەسەرکردەکانی

بزوتنــەوەی ســەربەخۆیو بزوتنــەوەی کــەمالی ئەنــدامیو نهــێنی ئــەو کۆمەڵەیەش بووە، کە لەساڵی ١٩١٠ز ئاشکرا بوو گیرا، تیپی چاکسازی عوسمانی لەساڵی١٩١١ز چوونە پاڵ تیپی ئیئتلافو ئازادی بەرهەڵستکار لەئەستەنبوڵ، شەریف پاشاش بووە سەرۆکی فیعلی ئەو پارتەو پاڵپشتی دارایــی لــەدەرەوە. ئــەو پارتــە تازەیــە دەبێتــە مینبــەری بانگــەوازکارانی دیموکراتی لەتورکیاو پاڵپشتی ئەساسی بۆ ماف نەتەوەیی گەلانی ناتورك، کەسایەتیە کوردیەکانی بەرهەڵستکاری ئیتحادیەکان رۆڵی بەرچاویان گێڕا لەدامەزرانــدنی ئــەو پارتــە، ســەید عەبــدولقادری نــەهری یــەکێك بــووە لەدامەزرێنــەرانی تیپــی ئــازادی، شــەریف پاشــاش رۆژنامــەی(مەشــروتیە)ی زمانحاڵی پارتەکەی دەردەکرد(٢٥). زانای گەورە سەعیدی کوردی(دواتر بەسەعیدی نەورەسی ناسرا) بەر لەهاتنی حوکمی ئیتحادیەکانو دوای هاتنیان رۆڵی گەورەی گێڕا لەپوچەڵ کردنەوەی بیری رەگەزپەرستی ئەوان، لەبەرانبــەردا بیرۆکــەی جامیعــەی ئیســلامی پێشــنیار دەکــرد هــەتا ببێتــە چوارچــێوەیەکی فیکــری عوســمــانی، ســەعید دەیــوت بابــەتی بــیری ناسیونالستیو رەچەڵەكو خوێنی پاکی ئیتحادیەکان پێچەوانەی یاسای زانستیەو روون بۆتەوە ئەسڵی نیەو ئەفسانەیە، سەعید ووتارەکانی گۆڤاری (بورکان) مینبەری بەرهەڵستکاری ئیتحادیەکان بڵاودەکردەوە(٢٦)

ووتاوەکــەی زیــا کــۆك ئــەلپ لەدیاربــەکر کــەگۆڤاری(پیمــان)ی ســەر بەئیتحادیەکان بۆی تۆمارکردووین پوختەی بۆچوونی ئیتحادیەکان بەدیار دەخات کوردستان لە بابەت دەسەڵاتەوە:-

(سەربازی کردن ئەرکێکی ئاینی پیرۆزەو ناونیشانی جیهادەو بۆکەس نیە ئەمەی قبوڵ نەبێت، دەیەكو باجی مەڕانە شەرعین، لەئێستاوە کورد گۆڤارو رۆژنامەی بەزمانی خۆی دەبێتو بەزمانی خۆیان لەقوتابخانە

دەخوێنن. بڕیارو یاسا جیبەجیٚ دەکرێتو بکوژ دەکوژرێتەوەو هەڵاتووی سەربازی سزا دەدرێت، مەرجە نازناوی ئاغاو شێخو عەشیرەت هەڵبوەشێتەوەو عەشیرەتی هەمووماں ئێستا﴿عوسمانیە﴾)(٢٧).

## کۆمەڵەو یانە کوردیەکان

### ـ کوردستانی لاو

هەندیٚ لەتوێژەرەوانی نوخبەی کوردی درکیان بەوە کرد کەتۆرانیەکان وەکو سەری رم بۆلابردنی سوڵتان عەبدولحەمید بەکاریان دەهێنن، ئەمە لەکاتێکدا سوڵتان ئەندازەیەك لەئیدارەی خۆیی دابوونیٚو بەمەستی دەستبەسەراگرتنی ناسنامەی نەتەوەییو شاڵاوی مەبەستدارو رێکخراوی نەبووە بۆسەر ئەرمەن. ئیتحادیەکان سیاسەتی ئاگرو ئاسنیان گرتبووە بەر بۆ تواندنەوەی هەستی نەتەوەیی. مامۆستا موحەمەد زەکی بەگ هاوزەمانی ئەو رۆژگارە بووەو لەپێشەکی کتێبەکەی(خولاسەی تاریخی کوردو کوردستان)دا دەڵیٚ: (دەرهەق بەئەسڵو تاریخی کوردان هیچم نەدەزانی ... چونکە تا ئەو وەقتە نەلەمەکتەبدا فکرێکی وامان درابویە نەلە دوایش .... کلیمەی جامیعەی (عوسمانی) ئەعصابی هەموومانی تا ئەندازەیەك خاو کردبۆوە..). جەمیل قەدری پاشاش لەهەمان سەردەم ژیاوەو لەسەر نەتەوەکانی دیو سیاسەتی بەتوورکردنی ئیتحادیەکان جەخت لەسەر هەمان بۆچوون دەکاتەوەو دەنووسیٚ:- ( خەڵکە ئیسلامیەکەی غەیری تورك ناچارکران بیر لەخۆیان بکەنەوە، لەئاکامی ئەو چەوسانەوەو تەنگ پیٚهەڵچنینەی لەبەرانبەر کوردوعەرەبو ئەلباندا کرا بەناچاری رێکخراوی تایبەت بەخۆیان دامەزراند)(٢٨).

زۆربەی نووسەان ئامارژە بۆ کۆمەڵەی (وردی بەهێز بۆ چاکسازی کوردستان= العزم القوی للاصلاح کردستان) دەکەن وەکو یەکەم کۆمەڵەی کوردی لەقاهیرە دامەزرابێت لەلایەن فیکری دیاربەکری، بەڵام زانیاری باشمان لەسەر سروشتو ئامانجی ئەو کۆمەڵەیە لەبەردەستدا نیە، لەدوای کۆدیتای ئیتحادیەکان لەئەیلولی ١٩٠٨رووناکبیرانی کورد لەئەستەنبوڵ ئەمین عالی بەدرخان، شەریف پاشا، شێخ عەبدولقادری نەهری، کۆمەڵەی هاریکاریو پێشکەوتنی کورد= کرد تعاون و ترقی جمعیتی)یان دامەزراند. لەدەستووری کۆمەڵەدا هاتووە بلاوکردنەوەو گەشەپێدانی مەعریفەت (نشرو تطویر المعارف) گۆڤارێکیان بەناوی (کورد) دەردەکرد، کە بەبەفراوانی لەکوردستان بلاودەبوەوە، هەر لەو ماوەیەدا لەئەستەنبوڵ رێکخراوێکی رۆشنبیری بەناوی کۆمەڵەی بلاوکرنەوەی مەعاریفی کورد (کرد نشری معارف جمعیتی) کرایەوە، ئەو کۆمەڵەیە لەگەڕەکی (وتاشنبرلی)ی ئەستەنبوڵ قوتابخانەیەکی بەڕێوەدەبرد بۆ فێربوونی زمانی کوردی(٢٩).

سولەیمانی مەلا خدرو دکتۆر نوری (کۆمەڵەی دۆستانی کوردستان)یان دامەزراند، هەر لەهەمان ساڵ (کۆمەڵەی رێنومایی) لەئەرزرۆم دامەزرا، (کوتلی)یش ناوی کۆمەڵێك دەبات لەدیاربەکر بەناوی (کۆمەڵەی بەرگری لەهەژاران)(٣٠)، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیش لەدیاربەکر ناوی کۆمەڵەیەکیتر دێنێ بەناوی(اجیلر= برسیەکان) ی، قونسوڵیە دەڵێ ئەشراف دیاربەکر کەلە دەسەلاتی ئیتحادیەکان بێزاربوون بۆ ئاژاوەنانەوە ئەو کۆمەڵەیان دامەزراندووە(٣١)، دەگونجێ هەردوو رێکخراوی دۆستانی هەژارانو برسیەکان رێکخراوبن. مامۆستا (ملیمسانین) ناوی کۆمەڵەیەکیتر

دەهێنێ لەئەستەنبوڵ بەناوی (کۆمەڵەی دۆستایەتی کوردی) کەهۆزانڤان و وێژەوانی نەتەوە کەمال فەوزی بەدلیسی سکرتێری ئەو کۆمەڵەیە بووە(٣٢).

یەکەم کاری یانەی کوردی ناردنی یاداشت بووە بۆ کامیل پاشای سەرۆك وەزیرانی نوێ کەداوای چاکسازی دەکرد بۆ کوردستان لەسەر ئەو شێوازە چاکسازیەی وەکو بەڵێن لەرێکەوتننامەی بەرلینی ساڵی ١٨٧٨ دراوە بەئەرمەن. یانەی کوردی توانیبووی لەبەدلیس و دیاربەکرو موسڵ لق بکاتەوە، یانەی بەدلیس لەهەموان بەهێزتر بوو، ژمارەی ئەندامانی یانەی ئەرمەنی لەبەدلیس ٥٠ ئەندام و هی یانەی ئیتحادو تەرەقی ٩٠ ئەندام بەڵام ئەندامانی یانەی کوردی ٦٨٠ئەندام بووە(٣٣)، بەپێی راپۆرتی قونسوڵی رووسی بەر لەداخستنی یانەی کوردی ژمارەی ئەندامانی دەگەیشتە هەزاران ئەندام(٣٤).

لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٠٩ بەڕەسمی یەکگرتنی یانەی کوردی و یانەی ئیتحادو تەرەقی تورکی راگەیەنرا، بەڵام ئەم راگەیاندنە ململانێیەکی تاڵی نێوان ئیتحادیەکان و کوردی لەژێر سەرا بوو، ئیتحادیەکان بەداخستنی یانەکە نەوەستان بەڵکو ئەو قوتابخانە کوردیانەشیان داخست کە ببووە دوانگەی رووناکبیرانی کورد لەئەستەنبوڵ، یانەی کوردی نیەتی هەبوو قوتابخانەی لەو جۆرە بۆ فێربوونی زانستی نوێ و زمانی کوردی لەشارە کوردیەکان بکاتەوە، هەروەها ئیتحادیەکان بەکارهێنانی وشەی کوردستانیان قەدەغە کردو لەجێی ئەوە(ولایەتی خۆرهەڵات)یان کردە رەسمی بۆ ناوچە کوردیەکان. راپۆرتێکی درێژ هەیە لەسەر ناکۆکی نیوان یانەی کوردی و ئیتحادیەکان کە یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەدیاربەکر نووسیویەتی و دەڵێ:-

یانـەی کـوردی لەدیاربـەکر ئاهـەنگێکی گـەورەی گێڕاو چـەندین بڕگـەی تێدابوو، هـەموو دەروێشـەکانی شار ئامادەی ئاهەنگەکە بوون، هـەر ئەوان گەیشـتنە مزگـەوت و سـوێندی گوێڕایـەڵیان بـۆ سـوڵتان عەبدولحەمیـد و شـەریعەت خـوارد، والـی وتـارێکی کـورتی‌داو تیپـی مۆسـیقای عەسـکەری پارچـە مۆسـیقایەکی هەڵبـژاردەی لێدا، دوایـی لەلایـەن ۳۰۰۰کـەس لـە ئامادەبوانـەوە بەڵگەنامـەی گوێڕایـەڵی بۆ سوڵتان و شـەریعەت ئیمزاکرا. بۆ ئـەوەی بەڵگەنامەکـە راسـتگۆیی و جدیـەت بـەحۆووە بگـرێ یانـەی کـوردی هـەموو ئاغا و شـێخەکانی ئـەو ولایەتـەی بـانگ کردبووە ئـەو کۆبوونەوەیـە، ژمارەی ئامادەبووان لە۱۰هەزار کەس تێ‌دەپەڕی، ئەمەش رەنگدانەوەیەکی رۆشـنی هـەبووەو سـەلماندی یانـەی کـوردی زۆر لـەلقی ئیتحادیـەکان بەهێزترە، هەرلەو کۆبوونەوەیە لەدیاربەکر زۆربەی ئەندامانی وازیان لێ‌هێنا. بەبۆچـوونی دارغومـان (وەرگێـڕی رەسمـی لەقونسـوڵیە) گەشـەکردنی ئـەم دواییـەی بزوتنـەوەی کوردایـەتی دەگەڕێتـەوە بـۆ گەرموگوڕنـەبوونی کـورد لەگەڵ رژێمی تازە. ئەمەش بەهۆی سەپاندنی یاسای مەدەنی، چونکە هێچ گومـانی تیـا نیـە زۆربـەی جـەماوەری نـەفامی کـورد بایـەخ بەشـەریعەت دەدەن(۳۵).

لازاریف لەسەر ئەو کۆبوونەوەیە دەنووسێت: (یانەی کوردی لەدوای ئەو کۆبوونەوەیـە رێککـەوتن لەسـەر رێکخسـتنی بـەرگری چـەکداری لەشـارو ناوچەکانی دەورووبەر لەپێناو گەڕاندنەوەی سوڵتان عەبدولحەمید)(۳٦).

(دگردسشـیان) لەدیاربـەکر لەشـوێنی یاریـدەدەری قونسـوڵی بـەریتانی کاری دەکرد، لەسەر هەمان بابەت دەڵێ (وای لێهات دوژمنکاری و تێکگیران لەنێوان هەردوو یانەی کوردی و ئیتحادوتەرەقی بووە بەسەلەیەکی ئاشکراو هەریـەك بەیاننامـەی لەسـەر ئـەوەی‌تر دەردەکـرد) لەکاتێکـدا ئیتحادیـەکان

لەچەندین لاوە کوردیان تاوانبار دەکرد، یانەی کوردیش بەم دوایە بەیانێکی دەرکردبوو بەرگری لەسەروەریەتی خۆی دەکردو دەیوت کاری ئێمە وەکو کۆمەڵە بابەتێکەو دەستووری تورکیا دانیپێدا ناوە، هەروەها بەرگری لەبەژەوەندی کورد شتێکەو لەدەستووری تورکیا دا هاتووە، یانە داوای لەمەسیحیەکانی ولایەتەکەی کردبوو بۆ بەرگری لەبەرانبەر دوژمنکاری چاوەڕێکراوەی ئیتحادیەکان لەگەڵ کورد یەکبگرن(٣٧)، بزوتنەوەی (پشتیوانانی موحەمەدی) لەنیسانی ساڵی١٩٠٩دەیانویست ئیتحادیەکان دەربکەنو دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید بگەڕێنەوە، ئیتحادیەکان دەستیان بەسەرداگرتنو یانە کوردیەکانیان داخستو بەبەشداری کردن لەو بزوتنەوەیە تاوانباریان کردن(٣٨)، ئەگەر ناوەرۆکی راپۆرتەکانی قونسوڵی بەجدی وەربگرین بەتایبەتی ئەو بەڵگەنامانەی سەرەوە بەدووری نازانین یانەی کوردی رۆڵی هەبێت لەبزوتنەوەی گێڕانەوەی دەسەڵاتی سوڵتان، وەکو هێژا (دیکسۆن)ی . یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەوان دەربارەی هەڵوێستی کورد لەبەرانبەر بزوتنەوەی دەستووری دەڵێ:- (بەشێوەیەکی گشتی کوردەکان هەستی خۆیان ناشارنەوە لەبەرانبەر رژێمی تازە، زۆر بەڕوونی شەریعەتیان دەوێ نەك یەکسانیو برایەتیو ئازادی ئیتحادیەکان، یانەیەکی سەر بەئیتحادیەکان لێرە هەیەو زۆر لاوازە)(٣٩).

زۆربەی ئەندامانی ئیتحادو تەرەقی لەدیاربەکر لەو کاربەدەستە تازانەی توورکن کە بەفەسادی ئیداریو بەرتیل خۆری ناسرابوونو لای خەڵکی دیاربەکر خۆشەویست نەبوون. زیا کۆك ئەلپ کوڕی تۆفیق ئەفەندی (یەکێك بوو لەکوردە ناسراوەکانی شار) بەبێدینو بانگەشەکاری تۆرانیەت ناسرابوو، ئەمە سەرۆکی لقی ئیتحادو تەرەقی بووە(٤٠).

بەهەڵویستەیەکی کورت لەناوەرۆکی ئەو دوو بەڵگەنامە بەریتانیەی لەسەرەوە ئاماژەمان پیّدا روون دەبێتەوە، یانەی کوردی لەدیاربەکر دوو هێڵی تەریبی پیادە کردووە:- هێڵی بەرگری لەبەرژەوەندی کوردو بەرەنگاربوونەوەی تۆرانیەت، لەگەڵ هێڵی بەرگری لەشەریعەتو سوڵتان عەبدولحەمید. هەروەها راپۆرتەکانی بەریتانی لەناو جەماوەری کورد لەشارەکانی بەدلیس، وان، سەعرەت، جەزیرە، ناوچەی بادینان، سلێمانی، خوی، ماکۆ، سەلماس، موکریان لەسەر هەمان تێروانین قسە دەکەن. زانایانی ئاینیو شێخەکانی تەریقەت دەستیان بەسەر ئەو بزوتنەوە بەربلاّوەدا گرتبوو، هێژا بیرترام دیکسۆن سەردانی ناوچە کوردیەکانی لەولایەتی وانو موسڵ کردووەو دەڵێ ( کورد یەکدەنگن لەسەر پێویستی پیادەکردنی شەریعەتو پێیان وایە رژێمی تازەو سەرکردەکانی بیّدینن) ئەم بزوتنەوەیەش مەلا سەلیمی بەدلیسی، رەشید ئاغای سلێڤانی، عەبدورەحمان شەرناخی، شێخ نووری بریفکانی، شێخ عەبدوسەلامی بارزانی، سەرکردایەتی دەکەن(٤١).

# بەڵگەنامەکان

FO 195\2317

٣١. حوزەیران . ١٩٠٩، وان

هێژا گیرارد لۆتر، باڵوێزی حکومەتی بەریتانیای گەورە

شەرەفێکی گەورەیە بۆ من لەسەر ئەو بابەتانەی لەکاتی گەشتەکەمدا بینیومن هەندێ سەرنج بدەمە بەڕێزتان، گەشتەکەم بۆ وان، سلێمانی، موسڵو ناوچە سنووریەکانی تورکیا. ئێران تاڕادەیەکی درێژ بوو، لەکاتێکدا گۆڕانکاری زۆرو خێرا هەیە لەناوچەکەدا، وادەبینم هەندێ لەو ڕووداوانەی لەڕاپۆرتەکەمدا باسم کردووە بەهۆی ڕووداوی تازەتر بایەخی نەمابێت.

ئاسان نیە لێرەدا بەدرێژی باسی ئەو گەشتەمتان بۆ بکەم کەخەڵکم لەزۆربەی توێژە جیاجیاکان بینیووە، بەڵام ئەوەی لەگەشتەکەم تێبینیم کرد ڕاستیەکی ئاشکرایە کورد هەموو پێکەوە بەخەڵکی دۆڵە بەرزەکانو ناوچە نزماییەکان، بەکۆچەرو مەڕدارو گوندنشینو خەڵکی شار هەموو ناڕازین لەدەسەڵاتی ئیتحادو تەرەقی، هەندێکیان بەئاشکرا دەریان دەبڕی دەیانەوێ شەریعەت پیادەبکرێو نایانەوێو باوەڕیان بەپێشنیارەکانی ڕژێمی لەیەکسانیو برایەتی نیە. لەولایەتی موسڵ کێشەیەك نیە بەناوی (مەسیحیەکان)، ژمارەیەکی کەم کلدان لەناوچە سنووریەکانی نێوان موسڵو ئێران هەن، لەبنەڕەتدا خەڵکی ولایەتی وان بوونو بەم دواییە هاتوونەتە

ناوچەکە، بەرژەوندی بازرگانیو قەرزدانی بەسوو نەبێت هیچ شتێك لای ئەوان بایەخی نیەو ئەوانە بەم حالەتەی ئێستا شادمانن.

بەکورتی کوردستان ئامادەی شۆڕشی دەستووری نیە هۆیەکەشی حکومەت خۆیەتی، بەڕێوەبردنی کودستان ئەستەم نیە بەمەرجێك کاربەدەستی کارامەو پاكو دڵسۆزی هەبێت، بەداخەوە نەدڵسۆزیو نەپاکی لەناو بەرپرسانو فەرمانبەرانی ئێرەدا نیە. ئەگەر خەڵکی پسپۆڕو کارامەو دڵسۆز لەجیاتی کاربەدەستە ناکارامەو گەندەڵەکان دابنرێ باری ئیداری لەهەموو ناوچەکوردیەکان یەکگرتووو توندو تۆڵ دەبێت، بەجۆری سنوورێك بۆ رێگری شێخەکان دابنرێو ئیدارەی ناوچەکە جیَی رەزامەندی بێت، ئیدارەی توندوتۆڵ پێویستی بەهێزێکی سوارە هەیە لەدەرەوەی کوردستان هێنرابێتو ئامادەبێت بەبێ دوودڵی ئیدارەی دەوڵەت لەناوچەکە بسەپێنێ، ئەگەر ئەم مەرجانە هەبن دەتوانرێ ناوچەکە لەزەویەکی وشكو برینگەوە بکرێتە بەهەشتێکی سەوزو ئاوەدان کەتوانای هەبێت ئاکاری لیبرالی تێدا بڵاوبێتەوە، بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش پێویستی بەبنیاتنانی نەوەیەکی نوێ هەیە، لەم بارودۆخەدا منداڵێکی زۆری ناوچەکە نەخوێندەوارن، ئەوانە دەبێت رەوانەی شوێنی تایبەت بکرێن هەتا فێربن یان بۆشوێنی چاککردن هەتا باش ئامادەبکرێن، ئەم ژمارە زۆرە لەلاوانی نەخوێندەوار تاوانی خۆیان نیە بەڵکو بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆی بەرپرسان لەدامەزراوەی پەروەردەیی.

ئەو شێوازەی ئێستا پیادە دەکرێ لەسزادانی ئەو کاربەدەستانەی هەڵە دەکەن لەدەوڵەتی تورکیا دەگوازرێنەوە بۆ کوردستانو لەوێ بەرپرسیاریەتیان پیَدەدرێ، ئەمە کاریگەری خراپی هەیە لەسەر ئیدارەی ولایەتەکە، لەجیاتی ئەوەی حکومەتی تورکیا یەکە سەربازیەکانی ئێرە

هانبـدات بـۆ داگیرکردنـی خـاکی ئێرانـی لەسـەلماس و خـوی بـۆبڕەودان بەدەسـتوور لـەو شـوێنانە، واباشـترە ئـەو هێـزەی بـۆ چارەسـەرکردنی کاروباری ولایەت لێرە بهێڵێتەوە.

داگیرکردنی تـەوریز لەلایەن رووسەکانەوە بۆتە فاکتـەری ئەو هەڵچوونە تووندەی تورك و داگیرکردنی خـوی و سەلماس لـەناو خاکی ئێـران، ئـەوەش لەمامەڵەی سەربازە تورکەکان لەو دوو شـارە هەستی پێدەکرێ. بـەرەو ئـەو قەناعەتـە دەچـم نـاکرێ رووبەڕووبوونـەوەی چـاوەڕوانکراو هـەر روودەدات لەنێوان هێزەکانی تورکیا و هێزەکانی ئێرانی لەناوچە سنوورییەکان.

شـادمان دەبم ئەگـەر بـەرێزتان ئـەو راپۆرتـە بنێـرن بـۆ بەڕێوەبەرایـەتی هەواڵگری

لـەوەزارەتی جـەنگ، لەئاینـدەش ئـەو نەخشانەشـتان بـۆ دەنێـرم کەلـە گەشتەکەمدا ئامادەم کردووە

دڵسۆزتان یاریدەدەری قونسوڵی برتردام

FO 195\ 3217

## پاشکۆی راپۆرتی هێژا هێرد، ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٠٩.

یانەی کوردی لەمزگەوتی گەورە ئاهەنگێکی گێڕاو چەندین بڕگەی تێدابوو، هەموو دەروێشەکانی شار ئامادەی بوون، کەدەرێشەکان لەگەڵ گەیشتنە مزگەوت سوێندی گوێڕایەڵیان بۆ سوڵتان‌و شەریعەت خوارد، والی وتارێکی کورتی‌داو تیپی مۆسیقای عەسکەری پارچە مۆسیقایەکی هەڵبژاردەی لێدا، دوایی لەلایەن ٣٠٠کەسەوە لەئامادەبووان بەڵگەنامەی گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان‌و شەریعەت ئیمزا کرا. بۆ ئەوەی ئەو بەڵگەنامەیە جدیەت‌و راستگۆیی بەخۆوە بگرێ یانەی کوردی هەموو ئاغاو شێخەکانی ئەو ولایەتەی بانگ کردبووە ئەو کۆبوونەوەیە، ژمارەی ئامادەبوان لە ١٠هەزار کەس تێدەپەڕی، ئەو کۆبوونەوەیە رەنگدانەوەی رۆشنی هەبوو، سەلماندی یانەی کوردی زۆر لەلقی ئیتحادو تەرەقی بەهێزترە کەلەدیاربەکر زۆربەیان وازیان لێهێنا بوو، لە٢٥ی ئەو مانگە حاجی مەقسود بەرەو مەکە رۆیشت، بەپێی زانیاری (رۆجیسیدتشیان) لەوێ کۆنگرەی پیاوماقولانی دەوڵەتی عوسمانی دەبەسترێ بۆ وتووێژ لەسەر بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی، بەبۆچوونی دارغۆمان (وەرگێڕی رەسمی قونسوڵیە) ئەو گەشەکردنە گەورەیەی بزووتنەوەی کوردایەتی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی هاوسۆزی کورد لەگەڵ رژێمی تازە، ئەمەش بەهۆی سەپاندنی یاسای مەدەنیەت بەسەریاندا، گومانی تیا نیە زۆربەی جەماوەری نەفامی کورد بایەخ بەشەریعەت دەدەن.

لێرە ئەندامانی یانەی کوردی دەیانوت رێنومایمان لەلقی سەرەکی سەرکردایەتی لەئەستەنبوڵەوە وەرگرتووە پەیوندی باش لەگەڵ مەسیحیەکان دابمەزرێنین بەڵام ئاراستەی ئیسلامی موحافیزکار لەیانە یارمەتی دامەزراندنی پەیوەندی لەو جۆرە نادەن .

هەتا ئێستا دەفتەری وێرانشار لێرە گەنمو خواردەمەنی بەسەر زیان لێکەوتووە برسیەکاندا دابەش نەکردووە، وەرگێڕی قونسوڵیە بەوالی وتووە چاو بەو بەڵێنەدا بخشێنێتەوە کە فەرمان هاتووە بۆ دەفتەردار ئەو پێتاکە بەسەر نەداران دابەش بکات، بەر لەوەی ئەوێ بەجێ بهێڵم والی دڵنیای کردمەوە بەوەی زانیاری روونو خێرای بۆ دەفتەردار ناردووەو داوای لەمن کردووە لەو بارەوە ئاگاداری بکەمەوە. هەروەها بەڕێز والی بەتوندی سکاڵای هەبووە لەمامەڵەی ئەو بەرپرسە حکومیەی هیچ ئەخلاقێکی نیە، بەڕێز والی ئاخی هەڵدەکێشا بەوەی هیچ دەسەڵاتێکی نیە بەسەر حالەتێکی لەو جۆرە هەتا بیداتە دادگا ئەگینا بەڵگەی لەسەر دەفتەردار زۆرە. چیبکات دەسەڵاتی مەکەزی لەئەستەنبوڵ دایناوە، ئەگەری ئەوەش هەیە هەتا ئەو دەفتەردارە بمێنێ کۆسپ دەخرێتە بەردەم دابەشکردنی خۆراك. وەرزی چاندنی گەنم بەسەرچووەو بەمەش زۆربەی زەویە کشتوکاڵیەکانی وێرانشار بەدانەچێنراوی دەمێننەوە، ئەرکی لیژنەی فریاگوزاریو یارمەتیدان بۆساڵی ئاییندە قورستر دەکات، باشە ئەگەر حکومەت بەکردەوەش یارمەتی خەڵك بدات خۆ سامانی ئاژەڵی لەزستاندا بەشێکی دەمرێو بەشەکەیتر تووشی تاڵانیو زەوتکردن دەبێت.

هێژا رۆجسیدتشیان دانەیەکی لەو راپۆرتە لەوەزیری جەنگەوە بۆ فەریق(مشیر) یاریدەدەری فەرماندەی سەربازی لەولایەتەکەو یاریدەدەری والی هاتوو بەمێژووی ١٢ی کانوونی دووەمی ١٩٠٨ کەلەوێ حکومەت

بەڵێنی هەزار لیرەی داوە بەهەرکەسێك ئیبراهیم پاشای میللی بگرێ.
هەروەها لەو بروسکەیەدا لیبووردنی گشتی هەیە بۆ ئەو لایەنگرانەی ئیبراهیم پاشا کەبەچەکەوە خۆیان دەدەنە دەست حکومەت. دیارە جیاوازی روونیش نەکراوە لەنێوان ئەو هۆزانەی پشتیوانی هەڵگەڕانەوە بوون یان پشتیوان نەبوون. لەراستیدا هۆزە بەشدارنەبووەکان ئازاری زۆریان چەشتبوو، چونکە چەکیان نەبووە بەشداری بکەن. هێژا رۆجسیدتشیان باسی دانەیەکی ئەو راپۆرتە دەکاتو دەڵێ لەوەپێش نەمدیووە لەگەڵ ئەوەشدا ناوی ئەو راپۆرتانەی بیستووە، لەو بارەیەوە دەڵێ (چەند بەڵگەیەك لەوبارەیەوە هەیە بەڵام تا ئیستا نەمدیووەو دەگونجێ دزرابێت یان وون بووبێت).عەبدولکەریم بەگی سەرۆکی هۆزی میرانو سەرۆکی کەرتێکی هێزی حەمیدیە تا ئێستا دەست بەسەرەو لەسەربازگەیەك گیراوە، ئەمە لەکاتێکدا عەبدولکەریم دوژمنی زۆرەو دوستی کەمە،
دەگونجێت لەتۆڵەی تاوانە زۆرەکانی گەورەترین سزای بدەن.

دڵسۆزتان ب، هێرد

## خاسیەتی حوکمی ئیتحادیەکان لەکوردستان

ئیتحادیـــەکان سیاســـەتە نەرمەکـــەی ســـوڵتان عەبدولحەمیـــدیان هەڵوەشـاندەوە لەبەرانبـەر کورد، بۆنمونـە سـوارەی حەمیدیـەیان نەهێشـت، لـەرۆژانی سـوڵتان عەبدولحەمیـد ژەنـەراڵ زەکـی پاشـای نزیکـی سـوڵتان کرابـووە پەیوەسـتی نێـوان کـوردو حکومـەت، بەقسـەی قونسـوڵیەکانی بـەریتانی لەکوردسـتان زەکـی پاشـا جێگـەی متمانـەی کـورد بـووە چـونکە هەمیشە بەرگری لەبەرژەوندیەکانیان دەکردو بەڕووی ئەو ئامرازە ئیداریە گەندەڵە دەوەستا کە لەهەوڵی ئیستغلالکردنی کورد دابوون(٤٢). زەکی پاشا بەبێ بەرهەڵستی ئەرمەن و ئاشووری و بەپاڵپشتی قونسوڵیە ئەوروپیەکان دەسـەڵاتی بەسەرناوچـەکەدا هـەبووە، ئیتحادیـەکان هاتنـە سـەر حـوکم و ئەرمـەن بەپاڵپشـتی حکومـەتی بـەریتانی و رووسـی و فەرەنسـی کەوتنـە داواکاری چاکسازی ئیداری لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، دوای ئەوە لیستیان بۆ سـەدان سـەرۆك هـۆزی کـورد ئامـادە کـرد بـەوەی تاوانبـاری جـەنگن دژی ئەرمـەن، سـەدان گونـدو کێڵگـەی کشتوکاڵی بـەو حیسـابەی خـاکی ئەرمـەن بـووە درایـە ئـەوان(٤٣)، دوایـی ئەندازەیـەك لەدەسـەڵاتی کـارگێڕی و نوێنەرایـەتی ناوچـەکە درا بەئەرمـەن بـەجۆرێ لەگـەڵ رێـژەی دانیشـتوانیان تێـك نەکاتـەوە، بۆقـەرەبوو کردنـەوەی رابـردوو نەهێشـتنی چەوسـانەوە، بەفشاری حکومەتی بەریتانی و دامەزراوە ئیتحادیەکان بەشێك لەداواکاری ئەرمـەنیان بـەجیٚهێنا و کوردسـتانیش بـەئاگرو ئاسـن حـوکم دەکـرا، دەیـان سەرۆکی کورد درانە دادگای رووکەشانەو دەست بەسەر سامانیان داگیرا، رێگە بەو چەتە ئەرمەنیانـە درابوو کەلەرووسیا مەشقیان کردبوو بکەونـەوە تۆقانـدن و تۆڵەسـەندنەوە لـەکورد. لـەراپۆرتێکی قونسـوڵی بـەریتانی لـەوان زانیـاری وورد هەیـە لەسـەر چۆنیەتی مامەڵـەی لیژنـەی ئیتحـادو تـەرەقی

لەسەرخستنی فرامیان بابازیان سەرۆکی دەستەیەکی چەتە ئەرمەنیەکان لەولایەتی وان لەسەر حیسابی پالێوراوێکی کورد(٤٤).

حکومەت باجی زیادەو نەگونجاوی سەپاندبوو بەسەر داهاتی کشتوکاڵو مەڕو ماڵاتی ناوچە کوردیەکان. حکومەت دەقادەقی یاسای باجی مەدحەت پاشای ساڵی ١٨٥٨ز لەدەوڵەتی عوسمانی جێبەجێ دەکرد. لەکاتێکدا یاسای ناوبراو کاتی خۆی لە ولایەتە ئەوروپیەکانی دەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو بەڵام ئێستا بۆ ولایەتەکانی ئاسیا بەتایبەتی بۆ کوردستان ناگونجێت، لەئاکامە خراپەکانی رایەڵەی پەیوەندیە کلاسیکیەکانی هۆزی تێکدا، هەموو ئەندامانی گوندەکانی دوێنێی بەیەکسانی کردە کۆیلەی سەرۆك هۆزو سەرۆك هۆزیشی گۆڕی بۆ خاوەنداریکی ئیستیغلاکەر یان دەرەبەگێکی دیکتاتۆر، خراپی ئەو سیستەمە گەیشتە رادەیەك حکومەت لەبەرانبەر دەرەبەگەکان بەهێز نەبوو نەیدەتوانی نەهێڵێ ئەوانیش باج بسەپێنن، بەمەش گوندنشینەکان دوو باجیان دەدا، ئەمە دووبارەکردنەوەی شێوازە هەڵەکەی سەردەمی عەباسی بووە کە بە ساختەیی ئیللتیزام ناسراوە، جوتیار بۆ ئەوەی باج نەدا ناچار دەکرا گوندەکەی بەجێ بهێڵێ بەناوی یەك لەدەرەبەگەکان تۆماری بکات، بۆ خۆی لەلای دەرەبەگەکە بەکرێ کار بکات، هەتا باج نەداتو ئەمنیەتی زیاتر پارێزراو بێت، لێرەوە دەرەبەگەکان بوونە گەورەترین خاوەن زەوی، هەروەها ئیتحادیەکان باجی زیادەیان بەسەر داهاتی کشتوکاڵو مەڕومالات دا سەپاند، رێژەکە لەزەوی خاوەنداریەتی دەیەكو لەزەوی خەراجی (زەوی دەوڵەت) کە بەپێی تاپۆ بەناوی جوتیارانەوە تۆمارکرابوو لەسێیەکی تێدەپەڕی. بۆ نمونە ئیتحادیەکان لەولایەتی دیاربەکر رێژەی باجی کۆدە (باجێکە لەسەر مەڕومالات دادەنری)ی بەرز کردەوە بۆ پێنج پیاستەر (دراوێکی عوسمانیەو لەلیرە کەمترە) ئەمەش رێژەیەکی گەلێك بەرزە بۆیە جوتیاری کوردی ناچارکرد مەڕوماڵاتی بفرۆشێو زەویە کشتوکاڵیەکەی

بەجێبهێڵێ، حکومەت بەمەشەوە نەوەستا بەڵکو بەزۆر سەرانەی زیاتری سەپاند بەبیانووی ئەوەی ئیدارەی حەمیدیە نەیتوانیووە ئەندازەی پێویست باج کۆبکاتەوە یان باجێکی شیاوو پێویست کەدەبێت یەکسەر بیدەن.

ئیلتیزام بەو پرۆسەیە دەڵێن حکومەت دێت کۆکردنەوەی باجی ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو دەداتە کەسێکی بەتوانا وەکو بەڵێندەر، گوندنشینەکان پێیان دەووت (مولتەزیم)، ئەو مولتەزیمە دێت لەماوەیەکی دیاریکراو هەتا دەکرێ باجی قورس دەسەپێنێ بەسەر جوتیارانی ناوچەیەكو بەشی حکومەت کۆدەکاتەوە لەگەڵ بەشەکەی خۆی، بەمە باج بەخێرایی کۆدەکرێتەوەو جوتیارانیش دەخرێنە ژێر باری قورسەوە(٤٥)، ئەو سیاسەتەش هەندێ جار پشت بەخەملاندنی پێش وەخت دەبەستێ، بەجۆرێ هەندێ جار خەملاندنەکە نابابەتی دەبێتو دەرناچێو زیادڕۆیی تیا دەکرێ، بەر لەهەڵگرتنی مولتەزیم لەگەڵ کۆمەڵێك پۆلیس دێنو ئەو باجە داوا دەکەن کەپێشتر خەملاندویانە، ئەگەر جوتیارەکە نەیدات ئەوە تووشی لێدانو ئازار دەبێتو سامانەکەی دەستی بەسەردا دەگیرێ(٤٦)، مەبەستی بەتورککردنو بەرەو عەلمانی بردنی ناوچە کوردیەکان کاربەدەستانی تورك لەبەڕێوەبەرایەتیە حکومیەکانو ئیدارەو پۆلیسو سەربازی(جەندرمە)و زەبتکەری خراپ دادەنێنو ئەوانەش قسەی سووك بەجوتیاران دەڵێن، وەکو حەیوانی کێوی بەمەستی ترساندنیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، لەو دوو ساڵەی دوایی ئیتحادیەکان موچەیان زۆر کەمو هەندێ جار بەچەند مانگێك مووچەیان نەدەدا، حاڵی فەرمانبەرەکان لەجەندرمەو حەیتەکان باشتر نەبوو بەڵام فەرمانبەرە گەورەکان وەکو والی، دەفتەردار(بەرپرسی خەزێنە لەولایەت)، بەڕێوەبەری تاپۆ، بەڕێوەبەری دارایی، تابوور ئاغاسی(بەڕێوەبەری پۆلیس) ئەمانە زۆربەیان ناکارامەو

گەندەڵ بوون. بەرتیل و بەخشش لەناویاندا بڵاوببۆوە، ئەو پایەی وەریان گرتبوو یان بەهۆی لایەنگری ئیتحادو تەرەقی یان لەفرۆشتنی موزایەدەی ئاشکرای پایە حکومیەکان دەستیان کەوتووە کەبەرژێمی تازەی ئیلتیزام ناسراوە، فەرمانبەر بەپێی ئەو پرۆسەیە پایەیەکی ئیداری بەبڕێك پارە دەکڕێ، ئەمەش بەزۆری لەیەکێك لەبازرگانەکانی ئەستەنبوڵ، کرێکار(مولتەزیم) بەزۆری لەماوەی کارەکەیدا (زیاتر ماوەی ساڵێك یان چەند مانگێك دەبێت) هەوڵ دەدات زۆرترین باج بسەپێنێ بەسەر خەڵکی پیشەکارو جوتیارو بازرگان هەتا بتوانێ بەشێکی لێبدات بەحکومەت و بەشێکی‌تر بۆ ئەو بازرگانەی لێی کڕیوەو بەشێکی بۆ گیرفانی خۆی، چونکە مەرج نیە بۆ ماوەیەکی زۆر لەو پایە بمێنێتەوە.(٤٧).

ئەو سیاسەتە کارگێڕیە زاڵمانەیە قورسایی خستبوە سەر شانی جوتیاران و بەزۆری ناچاری کردبوون کێڵگەکانیان بەجێبهێڵن و وێرانی و برسیەتی بڵاوبێتەوەو حالەتی ئابووری خراپ بێت. هەروەها گەرەلاوژەی ئیداری و نەمانی ئاسایش و ئارامی لەزۆربەی ناوچەکە دروست ببێت و شەپۆلێك نارەزایی لێبکەوێتەوە. وای لێهات لەبەر بارودۆخی سەختی ئەوکاتە کوردستان شێخی تەریقەت وەکو سەرکردەو ئسلام و سۆفی سادەو ساکار وەکو ئایدولۆژیا بوونە تاکە پەناگەی زۆرینەی خەڵك شتێکی سروشتی و چاوەڕێ کراوە خەڵکی سۆزی بۆ سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید ببزوێ سەیر نیە کورد لەدەوری راپەڕینەکانی دژ بەئیتحادیەکان کۆبێتەوە.

یاخی بوون لەو واقیعەی کوردستان دەرهاویشتەی ئەوحالەتە سیاسی و ئابووری و ئیداریە هەڵەو گەندەڵەی کوردستان بووە. بەکورتی ئەو پرۆسە

هەڵیە زەمینەی خۆش کرد بۆ لەدایك بوونی کوردایەتیەکی بەناوەڕۆك ئیسلامی.

نوخبەی کوردی لەدەرەوەو ناوەوەی کوردستان بۆچوونێکی تریان هەبووە بۆ چاکسازی، بۆچوونی ئەمانە نائاینیو لیبرالی بووەو لەفیکر وەکو دژەکەی خۆی لەئیتحادو تەرەقی لەژێرکارگەری بیری ڕۆژاوادا بوون.

لەساڵی ١٩١٠ خوێندکارانی کورد لەئەستەنبوڵ ڕێخراوێکی نەتەوایەتیان بەناوی (هیوا) پێك هێنا، یەکەم جار گۆڤاری (ڕۆژی کورد) و دوایی (هەتاوی کورد)یان دەرکرد. گۆڤارەکەو ڕێکخراوەکە ببووە بڵندگۆی کوردان بەتەمەنو پیشەی جیاجیاوە، لەناودارترین ئەندامانی ڕێکخراوەکە خەلیل خەیاڵی، جەمیل قەدری پاشا، مەمدوح سەلیم، عەبدوڵڵا جەودەت بوون. ڕۆژی کورد لەسەرووتارەکەیدا نووسیبووی (پێویستە دان بەوەدا بنێین کورد ماوەیەکی زۆرە لەشارستانیەت دابڕاوەو تائێستاش دوورن لەزانستو ڕۆشنبیریو بێبەشن لەزانیاریو مەعریفەت). گۆڤارەکە فیکرو شارستانیەتی ئەورووپی بڵاودەکردەوەو کاری دەکرد بۆ ژیانەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی کورد)(٤٨). لەوتارێکی گۆڤارەکەدا خەلیل خەیاڵی دەنووسێ (لەسەردەمی پێش ئیسلامدا کورد ئەدەبێکی دەوڵەمەندی هەبووە بەڵام دوای مسوڵمان بوونی بەتایبەتی ماوەی دەسەڵاتی سوڵتانەکانی عوسمانی ئاکامی پابەندی توندی بەئیسلامو خۆیەکلایی کردنەوەی بۆ خەلافەت زۆر لەتایبەتمەندیەکانی خۆی لەبیر کرد) لەوتارێکیتردا عەبدوڵڵا جەودەت داوای بەکارهێنانی ئەلفبای لاتینی دەکات بۆ نووسینی زمانی کوردی ، هەروەکو دەڵێ دەنگەکانی پیتی عەرەبی نەگونجاوە. لەژمارە سێی گۆڤارەکە ئیسماعیل بابانزادە وەڵامی دەداتەوەو بانگەوازی گۆڕینی ئەلفو بێی عەرەبی بۆ ئەلفوبێی لاتینی بەپێویست نازانێت، چونکە بەچەند

گۆڕینێکی سادە لەبزوێن و نیشانەکانی دەتوانرێ هەروەکو خزمەتی زمانی فارسی پێکراوە خزمەتی زمانی کوردیشی پێ‌دەکرێ، ئەمە کورد دادەبڕێ لەشارستانیەتی ئیسلامی کەموڵکی هەموو لایەکە نەك وەکو تاوان سەیری بکەین و دژی شەرع بێت(٤٩).

لەوتارێکی تردا بەناونیشانی (زەمانی باپیرانمان و زەمانی ئێمەو زەمانی تۆ) نووسەر بەڕاشکاوی داوا دەکات واز لەئیسلام بهێنن، بەڕای ئەو بۆتە دابەشکردنی کورد (لەکاتی هاتنی مەسیح کوردو مەسیحیەکان یەك گەل بوون، بەڵام لەدوای بەدیارکەوتنی ئاینی ﴿موحەمەد صلی الله علیه وسلم﴾ هەندێ لەئاشووریەکان قەناعەتیان پێ‌هێناو چوونە چیاو زمانێکیان بەناوی کرمانجی پێکهێنا، بەڵام ئەوانەی لەدەشتەکان مانەوە پێیان دەوترا مەسیحیەکان)(٥٠).

لەساڵی ١٩١٢ رۆژی کورد وەستاو لەژێر ناوی (هەتاوی کورد) بەردەوام بوو بەڵام هەمان ناوەرۆکی (رۆژی کورد)ی هەبوو.

عەبدوڕەزاق بەدرخان ئەدەبی فەرەنسی خوێندبوو، بە بیری شۆڕشی فەڕەنسی و چاکسازیەکانی رووسیای سەدەی نۆزدەهەم کەبووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٩٠٥ گۆش کرابوو. قەناعەتی وابووە کورد دەتوانێ ئەو چاکسازیانە وەربگرێ و لەسەر واقیعی کوردستانی جێبەجێ‌ی بکات، بۆیە لەساڵی ١٩١٣ لەشاری خوی کۆمەڵێکی کوردی بەناوی (جیهانزانی) دامەزراند، بەراشکاوی وتبوووی ئامانجی کۆمەڵە ناردنی لاوی کوردە بۆ رووسیا بۆ فێربوون و بڵاوکردنەوەی زمانی کوردی بەپیتی لاتینی (هەتا کورد ئاگاداری رۆشنبیری رووسی پێشەنگ بێت) میسۆ کاریت بەمسیۆنەرو رۆژهەڵاتناسی ناسراوی فەڕەنسی پەیوەندی بەو قوتابخانەیە کردبوو کە عەبدوڕەزاق دایمەزراند بوو، دەبوایە فێرخوازەکانی ئەو قوتابخانەیە فێری

ئەبجەدیـەتی سـریالی رووسـی بکـرێن و بـەرگی ئـەورووپایی (الفـرنج) بپۆشـن(٥١)، لەسـەرەتاوە سمکـۆ یارمـەتی دارایـی و مەعنـەوی دەداو زانـا کوردەکـانیش کۆمـەکی زەکاتیـان بـۆ کۆمەڵـەو قوتابخانەکـە کـۆدەکردەوە، لەکاتێکدا عەبدوڕەزاق لـەو ماوەیـەداو پێشتر لـەکاتی شۆڕشـی دەسـتووری ئێرانـی لەسـاڵی١٩٠٧ کەرووسـیا ئازەربێجـانی کوردسـتانی داگیرکردبـوو لەگەڵ رووسەکان کاری دەکرد، ئەو هیوای هەبوو حکومەتێکی کوردی لەژێر چاودێری رووسی بۆ دابمەزرێنن، عەبدوڕەزاق چاك دەیزانـی رووس چاوی بڕیوەتە لکاندی ئازەربێجان و کوردستان بەرووسیاوە بۆیە بەرۆژاوایکردن و سەپاندنی رۆشنبیری رووسـی بەباشترین رێگە دەزانـی، رووسـەکان بـەپارە یارمـەتی هەوڵـەکانی عەبـدەرەزاقیان دەداو داوایـان لـەهۆزە کوردەکـانی دۆستی خۆیان کردبوو هاوکاری بکەن، ئەو دەیویست بەدرێـژایی سنووری دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ رووس و ئێران قوتابخانەی لەو جۆرەی خوی تیا دابمەزرێنێت، بەڵام زانا کوردە مسوڵمانەکان پێیان زانی و ئەو هەنگاوەیان بە بـەدیان کـردن و بڵاوکردنـەوەی بـیری بـێ‌دینی دانـا لەناوچـەکەدا، بۆیـە بـەرووی‌دا راپـەڕین و عەبـدوڕەزاق ناچـار بـوو ناوچـەکە جـێ بهێڵـێ(٥٢)، مامۆستا موحەمەد رەسوڵ هاوار خاوەن ژیاننامـەی سمکۆ دەڵـێ داخسـتنی قوتابخانی خوی بەهۆی ناکۆی نێوان سمکـۆو عەبدوڕەزاقەوە بووە چونکە ئـەمیان ویسـتوویەتی پـارەی کۆمەڵـە لەئەسڵدا بـۆ قوتابخانـە کۆکرابـۆوەو پـارەی زەکـات بـووە خـەرج بکـرێ بـۆ کـڕینی چـەك بـۆ شـەڕی دەوڵـەتی عوسمانی، سمکۆ رازی نەبووە وتوویەتی زەکات ئەمانەتە دەبێت بەتەنها بۆ قوتابخانـە خـەرج بکـرێ(٥٣)، ئـەوەی تائێسـتا دەرکـەوتووە هەنـدێ نـاکۆکی لـەنێوان سمکـۆو عەبـدوڕەزاق هـەبووە لەسـەر سروشـتی پەیوەنـدی لەگـەڵ رووس.

بەچاوخشاندنێکی خێرا بەناوەرۆکی هەردوو گۆڤاری رۆژی کوردو هەتاوی کورد کە بەقەڵەمی پێشەنگی رووناکبیرانی نەتەوەخوازانی کورد نووسراوە چەند راستییەکمان بۆ روون دەبێتەوە. یەکەم: نەتەوەخوازانی کورد وەکو هەموو نەتەوەکانی ژێردەسەڵاتی رۆژاواو وەکو نمونە سەیری ئەورووپاو شارتانیەتی ئەورووپی دەکردو خۆیان وەکو قەزەم دەهاتە پێش چاوو بەدواکەوتوو لەخۆیان دەڕوانیو ئەورووپاش بەژیاری بنەڕەتی. ئەمەش هەڵوەشاندنەوەی ئەو هەموو بەرهەمەی شاعیرانو نووسەرانی کوردە کە بەگشتی هاوبەشیان کردووە لەشارستانیەتی ئیسلامی بەتایبەتی لەبەرانبەر مێژووو کەلەپووری کوردی. دووەم: هەروەکو لەفیکری ناسیونالستی عەرەبیو تورکیدا هەیە دەبینین فیکری ناسیونالستی کوردیش هاوسۆزی هەیە بۆ زیندووکردنەوەی هەموو شتێکی نەگونجاوی نەفامیو فەزڵکردنی بەسەر هەموو شتێکی ئیسلامی، بانگەشە بۆ نەگونجانی ئەلفبای عەرەبی بۆنووسینی کوردی بابەتێکەو هەتا لەناو پسپۆڕانی زمانو لەناو رەوتی عەلمانیش جێی مشتو مڕە. ئەمە شتێکە لەلایەن غەیری ئەوانیش وەکو رۆژهەڵاتناسانو رۆژهەڵاتناسانی جولەکەو ناسیونالستی تورکیو نووسەرە نادینینیەکانو مستەفا کەمالو رەزا شا وروژاند بوویان ، هەروەها بانگەوازکارانی نادینی لەدەوڵەتانی تریش ئەمەیان کردووە وەکو لەسۆماڵ لەئەفریقیاو ئەفغانستا لەلایەن ئەمانەڵڵای دۆستی ئینگلیز لەئاسیا. ئەمە بابەتێکی سیاسیو ژیاریەو ئامانجی بێئاگایی کردنی گەلانی مسوڵمانە بەمێژووو شارستانیو کەسایەتی خۆی، لێرەدا خوێنو گۆشت دەبێتە لاشەیەکی بێهۆشو بێمێژوو بێناسنامەو بەمە گۆڕینو بەئەملاولا بردنی ئاسان دەبێت.

# بزاڤە کوردیەکانی دژ بەئیتحادیەکان

## ئیبرهیم پاشای میللی     شیخ سەعیدی حەفید
## شێخ عەبدوسەلامی بارزانی     مەلا سەلیمی خێزانی
## سمکۆ و عەبدوڕەزاق

---

کوردستان لەسالانی ١٩٠٥ــ ١٩١٤ز توندترین رووبەرووبوونەوەی خوێناوی نێوان کوردو ئیتحادیەکانی بەخۆوە بینی، بەڵام ناتوانین لەخواستو نوشستی بزاڤەکانی ئەوکات حاڵی بین ئەگەر هاڤپەیڤین نەخەینە چوارچێوەی پەیوەنیەکانی عوسمانی- ئێرانیو ململانێی رووسی- بەریتانی. ئەڵمانی لەگەڵ خوسەپاندنی ئەوان بۆ نفوزداری لەناو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی. شوێنی کوردستان لەرووی جوگرافیەوە وایکردووە کارتێکراوو کارتێکەر بێت لەئەو ململانێیانەی هەبووە. لازاریف لەکتێبی(کێشەی کورد) بەتیروتەسەلی لەئەو بابەتە دواوە، پێمان چاکە بەکورتی هەندی لەڕێڕەوی ئەو کارلێکەرە دەولیە بۆ خوێنەران باس بکەین.

رژێمی جیهانی لەسەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی لەسەر هەمبەری نێوان زلهێزەکانی ئەوروپا وەستابوو. ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاش رۆڵی راگرتنی ئەو رژێمەی دەبینیو نەی دەهێشت هێزێکیتر لەجیهان رکەبەری ئەو بکات، لەسەدەی نۆزدەهەمەوە ئیمپراتۆریەتی

رووسـی دەیویسـت یەکـەم لـەبولقان و دووەم لەئـەنادۆڵ لەسـەر حیسـابی دەوڵەتی عوسمانی خۆی فراوان بکات، چونکە ئارەزووی رووس بۆ گەیشتن بـەئاوە گەرمـەکانی کەنـداوی فارسـی پێویسـتی بـەداگیرکردنی ئێـران و ئەرمینیا و کوردستان هەبوو، بەریتانیاش پـێی وابوو ئەم فراوانخوازیـەی رووسیا هەڕەشەیە بۆ سەر ئیمپراتۆریـەتی هیندی بەریتانی. هەروەها پێـی وابووە فراوانبوونی نفووزی رووسی لـەئێران و دەوڵـەتی عوسمـانی تێکدانی هاوسەنگی هێزە لەئەوروپا. ئەڵمانیاش لەسـەرەتای سەدەی بیستەم وەکو هێزێکـی ڕکەبـەری رووس و ئینگلیـز لەخۆرهـەڵاتی ناوەراست هاتـە سـەر شـانۆی ئـەوروپی، ئەمـە رووسـیا و بـەریتانیای لەسـاڵی ١٩٠٥ز لەهاوپەیمانیەتیـەکی دووقـۆڵی بەیـەك گەیانـد. ئەوهاوپەیمانیەتیـە زۆر کێشەی دەولی چارەسەر کردو هەردوولا نفوزی خۆیـان لەناو ئێران دیاری کرد. هەروەها هـەردووکیان رێککەوتن لەسەر تێك نـەدانی یەکیـەتی خاکی عوسمـانی، فەڕەنسـا لەسـاڵی١٩٠٩ز پەیوەنـدی کـرد بەهاوپەیمانیـەتی دووقـۆڵی، هەرسێ هێزی ئەوروپی فەرەنسا و بەریتانیا و رووسیا کەوتنە هاریکاری یەکتری بۆ دابەشکردی نفوزی خۆیان لەناو دەوڵـەتی عوسمانی و لـەململانێی یـەکتری دوورکەوتنـەوە. سـوڵتان عەبدولحەمیـد لەبەرنامـەو قۆناغبەنـدی نەخشـەی رووس و ئینگلیـز تێگەیشت بۆ دابەشـکردی خـاکی عوسمانی، بەریتانیا میسرو قوبرسی داگیرکردو رووسیاش کەوتـە هاندانی جوداخـوازی ولایەتـەکانی عوسمـانی لەرۆژهـەڵاتی ئـەوروپا، فەڕەنسـاش بەشێك لەباکوری ئەفریقای داگیرکـرد، بۆیـە سوڵتان بۆ بەربـەرەکانی نفوزی ئـەوان ئـەڵمانیای هێنایـە نـاوەوە، بـەو حیسابەی ئـەڵمانیا تـەماعی لـەخاکی عوسمانی‌دا نیە. هەوڵـەکانی سوڵتان عەبدولحەمید چـەندین رێکەوتننامـەی نێوان دەوڵـەتی عوسمانی و ئـەڵمانیای لێکەوتـەوە، ئیمتیـازی هێڵـی بەغدا .

بەرلین لەگرنگترین نیشانی ئەندازەی لێك نزیكی ئەڵمانیایە لەدەوڵەتی عوسمانی(٥٤). حكومەتی بەریتانی بەو پەڕی نیگەرانیەوە دەیڕوانیە هاوپەیمانیەتی عوسمانی ـ ئەڵمانی، چونكە ئەم فراوانخوازیەی نفوزی ئەڵمانیا لەئەنادۆڵی رۆژهەلات و عێراق مەترسیە بۆ بەرژەوەندیە ئەمنی و ئابووریەكانی لەعێراق و كەنداو، ئەمە لەكاتێكدا كانە نەوتیەكانی باشووری ئێران بایەخی خۆی بۆ ئیمپراتۆریەتی بەریتانی سەلماندبوو، هەروەها داهاتی هێڵی بازرگانی بەغدا ـ خانەقین ساڵانە ٣٢٥٠٠٠٠ پاوەندی ئیستەرلینی بووە، لۆرد كیرزۆنی بەرپرسی ناوداری بەریتانی و بانگەوازكاری فراوانخوازی بۆ سەپاندنی نفوزی بەریتانی لەموستەعمەراتەكان لەساڵی ١٩٠٣ز لەلێدوانێكی بۆ ئەنجومەنی لۆردات وتبووی ٩٠/٠ی ئەو بازرگانیەی دەچێت بۆ بەغدا بازرگانی بەریتانیە یان لەئیدارەی بەریتانیاوە لە هیندو بەغداوە دێت، ئێمە زیاتر لە ١٠٠ ساڵە موقیمی بازرگانیمان هەیەو لەكەس قبوڵ ناكەین هەڕەشە لەبەرژەوەندیەكانمان بكات(٥٥).

رووسیاش لەلای خۆیەوە ئەم لێك نزیكبوونەوی عوسمانی ـ ئەڵمانی بەمەترسی دادەنا بۆسەر بەرژەوەندیەكانی، سوڵتان عەبدولحەمید لەساڵی ١٩٠٥ز وە بەپشتیوانی ئەڵمانیا و بەناوی جامیعەی ئیسلامی لەئازەربێجان و كوردستان هەوڵی فراوانخوازی دەدا، رووسیاش هەر فراوانخوازیەكی لەئێران و ئازەربێجان و ئەرمینیا بەهەنگاوی سوڵتان عەبدولحەمید دەزانی بۆ بەدەستهێنانی خەونی سوڵتان لەوروژاندنی گەلانی ئیسلامی لەئاسیا بەناوی جامیعەی ئیسلامی لەدژی رووسیا. بۆیە رووسیاش بەهەموو توانای خۆی دەیویست لەبەرانبەر فراوانخوازی عوسمانی بوەستێ ئێران(٥٦)، ئەم سیاسەتەی عوسمانی دەسەلاتدارانی رووسیای لەقەوقازیا

راسپارد کەچاودێری چالاکیەکانی عوسمانی بکەن لەسنووری ئێرانی - تورکی، هێزەکانی عوسمانی لەساڵی ١٩٠٥ز زۆربەی خاکی ئێرانی و بەشەکانی ئازەربێجانیان داگیر کرد، کەئیتحادیەکانیش هاتنە سەر حوکم بەردەوام بوون لەسەر سیاسەتی فراوانخوازی لەناو ئێران(٥٧).

لەماوەی ساڵانی ١٩٠٧- ١٩١١ز بەهۆی شۆڕشی دەستووری پەشێوی کەوتە ناو دەسەڵاتداریەتی هەموو ئێران بەتایبەت لەئازەربێجان و کوردستان، ئیتحادیەکان بۆ زیاتر فراوانخوازی لەناو خاکی ئێران ئەمەیان بەدەرفەت زانی، لەئاسانکاری گرێدانی کوردستان بەدەوڵەتی عوسمانی ئەفسەرە ئەڵمانەکانیش ڕۆڵی گرنگیان گێڕا، لەساڵی ١٩٠٦ز دەوڵەتی عوسمانی بۆ لابردنی شاو سەپاندنی حکومەتێکی ئێرانی دۆستی ئەڵمان لەتاران کەوتە پشتیوانی سالار دەولە(وەلی عەهدی ئێرانی و دوژمن بەشا کەئەو کات نفوزی لەناو هۆزە کوردەکان هەبووە). هیچ کام لەرووس و ئینگلیز رازی نەبوون بەئەو فراوانخوازیەی عوسمانی لەئێران و ئەمەیان بە بەرژەوەندی ئەڵمان دەزانی، بۆیە هەردوو دەوڵەت کەوتنە هەوڵی پاراستنی ئاسایش و ئارامی کوردستان بەو حیسابەی ناوچەیەکی سنووری گرنگە بۆ ئەمەش کەوتنە هاندانی هەریەك لەئێران و تورکیا بە ئەوەی ریگە نەدەن بەکورد گرفت بۆ بەرانبەرەکەی دروست بکات، رووسیاش بەزەبری هێز ئازەربێجانی داگیرکرد و ڕۆڵی کارای لەناوچە سنووریەکان پەیدا کرد(٥٨)، سەرەڕای مۆرکردنی ڕێکوتنامەی دووقۆڵی لەنێوان رووسیا و بەریتانیا لەسەر پاراستنی ئارامی سنووری عوسمانی بەڵام بێ‌متمانەیی و ناکۆکی شاراوە هەر مابوو، بەتایبەتی لەنێوان بەرپرسان و قونسوڵیە چالاکەکانی ناوچە سنووریەکانی کوردستان، هەردوولا خەریکی سەرنج راکێشانی سەرۆکە کوردەکان و بەکارهێنانیان دابوون وەکو ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی

دەسـکەوتی سیاسـی و نفـوزی خۆیـان لەناوچـەکە، لاواریـف لەسـەر زاری قونسـوڵی فەرەنسـیەوە بۆمـان دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ ئەگەر قونسـوڵی رووسـی لەناوچـە سـنووریەکانی ئێرانـی ـ عوسمـانی سـەردانی ئاغایـەکی کـوردی بکردایـە ئـەوە قونسـوڵی بـەریتانیش سـەردانی هـەمان ئاغـای دەکـرد)(٥٩).

هۆزە کوردیـەکان و سـەرۆکەکانیان پشـگیریان لـەملمـلانێ کـردووە، بۆ نمونـە سمکۆ چەندین جار لەنێوان ئێران و عوسمانی و رووسـی دۆستایەتی خـۆی گۆڕیـوە. پەیوەنـدی رووسـی . کـوردی بەگشـتی بێمتمانـەیی بـووە بەیـەکتر ئەمـەش بـەهۆی سیاسـەتی چـەند سـاڵەی تەقلیـدی رووس لەبێمتمانـەیی بـــەکوردو پشتبەســـتن بەئەرمـــەن و ئاشـــووری لەبەدەســـتهێنانی بەرژەوەندیەکانی روس لەناوچەکەدا، ئـەو سیاسـەتەش هـەتا سـاڵی ١٩٧٠ز گۆڕانی بەسەردا نەهات(٦٠).

## .١٠

# بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشای میللی

ئیبراهیم پاشا نمونەیەکە لەسەر بەدیارکەتنی دەسەلاتداریەتی خانەوادەکانی کورد، ئەوانەی بەهۆی رووداوە ئیقلیمیو دەولیەکانەوە گەیشتنە دەسەلات، هەروەها نمونەیەکە لەهێزو توانای کورد لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدو کارەساتی رۆژگاری ئیتحادیەکان، ئیبراهیم نەوەی ئەیوب پاشای میللی سەرۆکی هۆزی گەورەی میللییە، زێدی دێرینی ئەوان لای باشووری دیاربەکر بەئاراستەی سنووری سوریاو تورکیایە، شاری ویرانشار لەباشووری دیاربەکر مەڵبەندی هۆزی میللییە، ئەوێ لەسەدەی هەژدە شوێنی میرنشینێکی گەورە بووەو تەیمورخان سەرۆکایەتی دەکردن، چەندان هۆزی کوردو عەرەبی کۆچەر لەولایەتی وانو دیاربەکر و جەزیرەو حەلەب گوێڕایەڵیان دەکرد، هەتا دەسەلاتدارانی عوسمانی لەساڵی ١٧٩١ز بەفەرماندەی سلێمان پاشای(والی بەغدا هێرشێکیان کردە سەری، تەیمور پاشا ماوەیەك لەقەلایەکەی بەرگری کردو دوایی کەوتە شەڕی پارتیزانی هەتا لەساڵی ١٨٠٠ز سوڵتانی عوسمانی لەگەڵیدا چاك بۆوەو کردیە والی ئورفەو دوایی کردیە هی سیواس. لەکاتی شالاوەکەی ئیبراهیم پاشای کوڕی موحەمەد پاشا بۆ سوریا لەساڵی١٨٣٣ز تیماوی پاشای نەوەی ئەیوب پاشا لەگەڵیاندا رێککەوتو ماردینی گرتو بەشێك لەشکۆی میرنشینی میللی گەڕاندەوە. لەدوای کشانەوەی هێزەکەی میسر عومەر پاشای والی دیاربەکر هێرشی هێنایە سەر ماردینو مەحمود بەگی باوکی ئیبراهیم پاشای گرت، ئەویش هەلات بۆ لای خدێوی ئیسماعیل والی میسر

لەئەستەنبوڵ، هەتا داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات لەلای سوڵتان عەبدولعەزیز(١٩٦١ـ ١٩٧٦ن)و ئازادی بکات، لەکاتی ئەو هەوڵەدا عومەر پاشا تەمەنی ١٧ ساڵان بووە خۆزگەکانی پێش مەحمود بەگی خستبوو، ئیبراهیم پاشا کە هێشتا لاو بوو خێزانەکەی کچی سەرۆکی هۆزی(تەی) بوو، دەبێتە سەرۆکی هۆزی میللیو وەکو سەرۆکێکی بەتواناو بەماوەیەکی کەم بەهۆی دەوڵەمەندیەکەیەوە توانی شکۆی هوزی میللی بگێڕێتەوە(٦١).

دکتۆر عوسمان ئەبوبەکر لەسەر زاری مارك سایکس کەماوەیەك میوانی ئیبراهیم پاشا بووە، ئەوها باسی دەکات: (پیاوێکی باڵابەرزو ناوقەد باریكو روو کوردانە، دووچاوی کاریگەرو وریاو درەوشاوە، چەناگە بەرزو زار فراوان، لەکاتی قسەکردنیدا تێگەیشتم پاشا بەووردی ئاگاداری کاروبارو رووداوەکانی ئەوروپا هەیە، لەوانە پەیوەندی ئینگلتەرەو ئێرلەندەو شتیتر، دیارە لەچەندین سەرچاوەوە زانیاری پێدەگات. سەرەڕای ئەمە ژمارەیەکی زۆری رۆژنامەکانی تورکیای لەلابوو. ئەو خەڵکانەش کە لەدەوری بوون لەڕەگەزو مەزهەبەکانی تورکیا بوون. ئیبراهیم پاشا بەڕاستی کەسایەتیەکی سەرسوڕهێنەر بوو، فەرماندەیەکی ئاساییو پیاوێکی زۆر بەتوانا بوو بەسەر خۆیدا، ئەمەش بەسیفاتی ئەو پیاوانە دەچوو کە زۆر لەلایەنە قورسو دژوارەکانی ژیانیان تاقیکردبێتەوە، بە خاسیەتە زیندووەکانی ئەلوەرویکی ئینگلیزی (بارون)مان پێوە دەبینی، لەو کەسانە بووە شوێنێکی نزیکیان بۆخۆیان هەتا لەتورکیاش دەست نەکەوتووە. بارونی دەرەبەگو دیکتاتۆری رۆژهەڵاتیو سەرۆکی کۆچەرانم لەو پیاوەدا بەدی کرد، لەنێو خێوەتگای ناو سەربازگەکەیدا هەندێ لایەنی ژیانی سەربازگەکانی تەیمورو ئەتیلامان دەبینی، لەبەرزبوونەوەی بۆ سەرۆکایەتی

هەندێ رووخساری عوسمانیەکانی بەرایی پێوە دیار بوو، لەهێزو لاوازی هەندێ خاسیەتی بەمیرداد دەچوو[٦٢].

ئەستێرەی ئیبراهیم پاشا لەدوای شەڕی عوسمانی ـ رووسی بەدرەوشاوەیی بەدیارکەوت، لەهەوڵدان بۆ بنیاتنانی میرنشینەکەی پشتی بەسێ کۆڵەکە بەستبوو، ئەوانیش:ـ راستگۆیی لەگەڵ بەهێز، رازیکردنی لاواز ، ترساندنی زۆر لاواز هەتا رادەی مل پێکەچ کردن. بۆنمونە بەهاوپەیمانیەتی چەرکەسەکانی(سەرووکانی _راس العین) سەدان کەس لەباشترین چەکداری رۆژهەلاتی بۆ ئەو هێزە حەمیدیە زیاد کرد کەلەژێر فەرمانی دابوون. دوایی کەوتە پیادەکردنی سیاسەتی گۆچان و لاواندنەوە لەگەڵ هۆزە کوردو عەرەبەکانی نێوان دیاربەکرو ئۆرفە، بەلام کەوتە کوشتن و دەرکردنی کۆچەرو هۆزە عەرەبیە کۆچەریەکانی وەکو عەترەو شەمەڕ، بەلام کچی شێخی (تەی) ئازای خواست و بەمەش پرۆژەی ئەو هۆزە کوردی و عەرەبیانەی لەباریەك برد کە بەربەرەکانیان دەکرد بەتایبەت هۆزی بەرازی، هەروەها رێگەی لەپیاو ماقولانی دیاربەکرو ئورفەو حەلەبی ناحەزی گرت کەبۆی لەسەنگەردابوون و باجیان نەدەداو باجیان سەپاندبوو بەسەر کاروانەکانی سەرەڕێ. بەپێی راپۆرتی قونسولیەکانی رووس و ئینگلیز ئیبراهیم پاشا لەناوچەکە تاکە دەسەلاتداری ولایەتەکانی دیاربەکرو ئورفەو حەلەب و ماردین بووە. فەرماندە ئیداریەکان بەرەزامەندی ئەو دادەنران و کەس غیرەتی نەدەکرد لەگوێڕایەلی ئەو دەرچێت[٦٣].
لەکۆی(٧)لیوای حەمیدیە سەرکردایەتی(٥)لیوای دەکرد، ئەمەش هێزێکی گەورە بووە، هەر لیوایەکی حەمیدیەش لە ١٠٠٠تا ١٢٠٠چەکدار پێك هاتبوو، بۆیە سولتان عەبدولحەمید نازناوی میری میرانی لێنابوو، پەیوەندی تایبەتی هەبووە بەکۆشکی یەڵدز(بارەگای سولتان) و بەرێوەبەرایەتی مابینی

بەبایەخ[٦٤] سەرەڕای ئەمانە لەدوای سوڵتان دووەم دەوڵەمەندی عوسمانی بووە، بۆیە خواستی سیاسیو سەربازیو ئابووری بەهێزی هەبووە بۆ بنیاتنانی میرنشینەکەی[٦٥]. بەپێچەوانەی ئەو قسانەی لەسەر دەمارگیری ئیبراهیم پاشا دەکرێ ئەرمەنو یەزیدیو عەلی ئیلاهیەکانی دەرسیم هەموو لێی نزیك دەبوونەوەو هانی دەدان لەویرانشارو گوندەکانی دەوروبەری نیشتەجێ بن کە گەشەسەندنێکی گەورەی پێوەدیار بووە، ئیبراهیم پاشا ٤٠٠ گوندی ئاوەدانی لەدەوروبەری ویراشار رازاندبۆوە، نفوزی لەهەندێ لەگوندەکانی ئازربێجانیش نزیك کرد بۆوە، بەپێچەوانەی ئەوەی دەوترێ لەسەر ڕێگریو تاڵانیو سەپاندنی باج بەسەر کاروانەکاندا ئەم زۆر سوور بووە لەسەر ئارامیو ئاسایشی ناوچەکە، لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان خەڵکی زۆر هەبووە یان لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتی خۆی نیشتەجێی کردوونوکارو کاسبی بۆ دۆزیونەتەوە یان ئامۆژگاریان لێوەرگرتووە. دکتۆر ئەحمەد عوسمان لە(بەهجەت ئەسەری)یەوە دەگێڕێتەوە، لەو کاتەی هەواڵی دادگەری گەیشتە مەدائنو رەها(ئورفە)و داربەکر رۆڵەی مەسیحیو مسوڵمان پۆل پۆل بەمنداڵەوە بەرەو وێرانشاری ناوەندی گردبوونەوە دەڕۆیشتنو لەوێ نسشتەجێ دەبوونو دڵنیا لەسەوەتو سامانەکانیان بازرگانیان دەکرد[٦٦].

پەیوەندی نێوان ئیبراهیم پاشاو سوڵتان عەبدولحەمید زۆر بەهێز بووە، بەئەندازەیەك پەیوەندی راستەوخۆ هەبووە لەنێوانیاندا، سوڵتان ئیبراهیم پاشای بەنزیکترین کەس لەخۆی زانیوە و پێی وتووە (ئیبراهیم پاشای کوڕم). کاربەدەستانی تورکو پیاوماقوڵانی دیاربەکر سەرسەختترین دوژمنی ئەو بوون، فڕوفێڵیان بۆ دانابوو بەلای خۆیانی رابکێشن بەڵام بێئاکام بوو. بۆنمونە خەڵکیان هاندەدا بۆ خۆپیشاندان لەدژی ئەو، لەساڵی

١٩٠٧ نوسینگەی والی‌یان داگیر کرد لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پۆستە، داوایان لەحکومەت دەکرد سنورێك دابنێ بۆئەو شالآوی تالآن و فڕاندنەی تووشی کاروانە بازرگانیەکانی نێوان حەلەت و دیاربەکر هاتووە لەسەر دەستی سوارەکانی حەمیدیەی سەر بەئیبراهیم پاشا. سوڵتان لیژنەیەکی بۆ لێکۆڵینەوە ناردو دەرکەوت لایەنگرانی ئیبراهیم پاشا بێتاوانن ، لەبەرانبەر ئەمەدا سولتان ڕێزی لێنا و دیاری و نازناوی پێدا، دوایی دەرکەوت ئەندامانی ئیتحادو تەرەقی بەسەرۆکایەتی زیا کوك ئەلپ بەنهێنی خەڵکیان لەدژی ئیبراهیم پاشا هانداوە، چونکە پەیوەندی بەهێزی هەبووە لەگەڵ سوڵتان[٦٧] قونسوڵی بەریتانی دەڵێ دوای ئەوەی ئیتحادیەکان سوڵتان عەبدولحەمیدیان لابرد لەئەولەویاتیان بووە زاڵ بن بەسەر ئیبراهیم پاشا[٦٨].

هەندێ پێیان وابووە ئیبراهیم پاشا ئامرازێك نەبووە بەدەست سوڵتان بۆ ترساندنی ئەرمەن و ناحەزەکانی سوڵتان بەڵکو لەهەوڵی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیدابووە بەسەرۆکایەتی خۆی و گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان. بۆنمونە لەساڵی ١٩٠٨ز لەو کاتەی مارك سایکس پسپۆڕی بەریتانی سەردانی ناوچەکە دەکات و ئیبراهیم پاشا پێی دەڵێ: پشتیوانیتان لەشێخی کوێت کرد بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بۆچی پشتیوانی لەمنیش ناکەن خۆ هەمان هەڵوێستم دەبێت، ئێمەی کورد ئامادەین لەگەڵتان کاربکەین و من ئامادەم لەگەڵتان بێم بۆ بەریتانیا هەتا هەڵوێستی خۆمان بۆ پاشای بەریتانیا روون بکەینەوە[٦٩]. ئیبراهیم پاشا رازی نەبوو هێزی حەمیدیەی خۆی بنێرێ بۆ یەمەن و هەڕەشەی هەڵگەڕانەوەی کردبوو ئەگەر ئەو فەرمانەی بەسەردا بسەپێندرێت. بەپێی راپۆرتەکانی قونسوڵی رووسی لەدیاربەکر کورد بەگشتی ڕێزو خۆشەویستیان بۆ ئیبراهیم پاشا زیاتر هەیە لە سوڵتان[٧٠].

لەكاتی هاتنی ئیتحادیەكان و راگەیاندنی دەستوورو سنووردانان بۆ سوڵتان، ئیبراهیم پاشا بەڕێوەبوو بۆ دیمەشق بۆسەركۆنەكردنی ئەو هۆزانەی گرفتیان دروست دەكردن بۆ هێڵی ئاسنی سوریا - حیجاز. لەو كاتە هەستی بەبەرپرسیاریەتی كرد بەرانبەر شەریعەت و سوڵتان و شۆڕشی دژ بەئیتحادیەكان راگەیاند. ئەو دەیویست سوریا بكاتە بنكەی چالاكیەكانی دژ بەئیتحادیەكان (٥)هەزار سوارەی حەمیدیەی لەدەوری خۆی كۆكردەوە، لەتەواو كردنی سەفەرەكەی دابوو لەحەلەب بۆ دیمەشق، خەڵكی شار بەو پەڕی رێزەوە پێشوازیان لێدەكرد. بەچەند رۆژێك ناوچەكانی نێوان ئازەربێجان و دێرئەلزوور كەوتنە بن دەستی ئیبراهیم پاشا. بەڵام حكومەت كەوتە هاندانی هۆزە عەرەبەكان و هێزێكی گەورەی حەمیدیە هێرشیان بردە سەر وێرانشار، ئەویش بڕیاری گەڕانەوەیداو هەواڵی بۆ كوڕەكانی نارد بەهێزێكی حەمیدیەوە لە دەرەوەی وێرانشار پەیوەندی پێوە بكەن. شەرێكی گەورەیان لەنزیك وێراشار تووش بوو، هێزەكانی حكومەت شكان و (٣٠٠)كوژراو بریندااریان بەجێهێشت. دوای گەیشتنی هێزی پشتیوان لەچەند لاوە بۆ هێزە دۆڕاوەكە، ئیبراهیم پاشاش ناچار بوو بەئاراستەی چیاكانی دەروروبەری ژەنگار بكشێتەوەو لەوێ سەنگەر بگرێ، ئەو چاوەڕوانی پشتیوانی بوو لەیەزیدیە هاوپەیمانەكانی بەڵام ئەوان خیانەتیان پێكرد، ناچار بەئاڕاستەی ئورفە گەڕایەوەو لەوێ لەناوچەیەك بەناوی عەبدولعەزیز لەگەڵ هێزەكانی حكومەت تێك گران و ئیبراهیم پاشا لەوێ مرد، هەیە دەڵێ دڵی وەستاوەو گێڕانەوەیتر هەیە دەڵێ تووشی(دیزانێری) بووە، هەیە دەڵێ لەشەڕەكەدا كوژراوە، یان لەبارێكی لێڵدا دەرمانخواردوو كراوە، لەدوای مردنی ٥٠٠٠ هەزار كەس لەسوارەكانی تەسلیم بوونەوە[٧١]. لێرەدا لەگەڵ داوای لێبووردن لەخوێنەر

ئەگەر لەدەستنووسەکەی رەحمەتی(بەهجەت ئەسەری) هەندێ بڕگەی درێژ بهێنینەوە کەدکتۆر ئەحمەد عوسمان هێناویەتەوە.

(ئیبراهیم پاشای خوا لێخۆش بوو لەدوای سەڵتان دووەم پیاوی دەوڵەمەندی خۆرهەلات بووە، باڵی کێشا بوو بەسەر هەموو هۆزەکانی عەرەب و کوردەکانی میللی لە میزۆپۆتامیا و کوردستان، هەموو ساڵێك دیاری بەنرخی وەکو رۆن و توتن و زێرکەبەهاکەی دوو هەزار جونەهی بووە دەنارده کۆشکی یەڵدزی سوڵتان، بەڵام چاوچنۆکان ئارەزوویان بووە لەدەرفەتێکدا دەست بەسەر خەزێنەی خوا لێخۆشبوودا بگرن و لەنێوان خۆیاندا دابەشی بگەن، سکیان لە ئاڵتوونی ناسك پڕ بکەن، بەڵام خۆشەویستی سوڵتان عەبدولحەمید بۆ ئەو پیاوە بەجۆرێ بووە لەبۆنە رەسمی و شوێنە تایبەتیەکاندا بەکوڕی خۆی ناودەبرد، ئەمە بەس بووە بۆ بەرپەچدانەوەی ئەو چاوچنۆکانە، کەچی ئیتحادیەکان دوای دانانی میزانیەی حکومەت بەشی ئارەزووی خۆیان دیاری کردو کەوتنە دزی لەدارایی دەوڵەت، ئیبراهیم پاشا بەفەرمانی سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ هەشت سەد لەسوارەکانی دەچووە پاراستنی هێڵی حەمیدی حیجازی، بەرێزیان پسپۆڕ بوو لەسیاسەت و دڵنیا نەبوو لەشەڕی حکومەت، لەگەڵ خۆیدا بەپێنج هەزار سوارەی تیر بەدەست هەموو خاکی وێرانشارو شاری رەها و تەرابلسی بڕی کە چووە ناو شاری حەلەب لەلایەن والی و خەڵك و پیاوماقولانی هەرێمەکەوە پێشوازی گەرم کران..... لەوێ دڵی خەبەری دابوو کەشتێك روو دەدات، پێنج رۆژی پێنەچوو دوو نامەی لەنەزارەتی جەنگ و ناوخۆوە پێگەیشت، داوای لێکرابوو بەخێرایی بەرەو دیمەشق بڕوات، لەوێ بەهۆی گەیشتنیەوە ئاهەنگی بۆ رێکخراوە.....بەڵام هەردوو باڵوێزخانەی دەوڵەتی گەورەی ئینگلتەراو فەڕەنسا لەئاستانە لەفێڵی

کۆمەڵەی ئیئتیلافی ناوبراو ئاگاداربوون و بەجوفرەی تەلەگراف قونسوڵیەتی خۆیان لەشام ئاگادارکردەوە کە لەنهێنی ئەم کارە ئیبراهیم پاشا ئاگادار بکەنەوە...بۆ رۆژی دووەم ئیبراهیم پاشا چووە خانەی هەردوو قونسوڵیە، لەوێ نیەتی خراپی کۆمەڵەی بەرانبەر خۆی بۆدەرکەوت...بیری کردەوە چۆن خەتی گەڕانەوە بۆنیشتمان و ناو هۆزەکەی دیاری بکات و خۆی ئامادە بکات بۆشەڕو بەرگری بەرانبەر هێزەی ئامادەکراوی ئیتحادیەکان. بەشێك لەسوارەکانی ناردەوە بۆ وێرانشار، رای سپاردن خەبەری مەبەستی ئیتحادیەکان بدەنە منداڵەکانی و خۆیان بۆ دەربازبوون لەشەڕی ئیتحادیەکان ئامادە بکەن، لەکاتێکدا لەوێرانشار کۆگایەکی پڕ لەچەك و جبەخانەی شەڕی هەبوو، خۆیی و ئیسماعیل بەگی کوڕی لەشام بیست و چوار رۆژ مانەوە.... هەتا حکومەت دڵنیا بێت لەسەر فەرمانی خۆیەتی و لەدوای چەکدارکردنی چوار سەد لەسوارە کوردەکانی بەتفەنگی(ماوزەڕ) رەوانەی حیجازی کردن...لەنیوەی شەودا ئەو دوو قونسوڵیەی ئاماژەمان پێدا هەواڵیان دایە کە والی ناوبراو بەیانی لە بارەگای حکومەت لەخزمەت خۆیی و کوڕەکەی دایە بۆقاوە خواردنەوە، بەلاّم کاتێك بەرەو شوێنی دیاریکراو دەچێت دەبینێ سەربازەکانی کۆمەڵە چەکدارن و بەسواری ئەسپەوە لەوێن...خۆی و کوڕەکەی و سوارەکانی کەژمارەیان چوار هەزارو پێنج سەد سوارە دەبوو گەڕانەوەو شامیان بڕی ...کاتێك گەیشتنە گوندێکی رۆژهەلاّتی حەلەب تووشیان بوو بەتووشی بەدرخان بەگ و ژمارەیەکی کەم لەسەربازەکانی، ئەو سوێندی بۆ خوارد کەباشترین یارمەتیدەری دەبێت لای حکومەت بەو مەرجەی چەکەکانی تەسلیم بکات، گوێی بەقسەکانی نەداو رێگەی بڕی و گەیشتە مەسکەنە، لەفوڕات پەڕیەوەو بە رەها تێپەڕی، لەڕێگا تووشی بەتووشی هۆزی بەرازی و

سوپاوە بوو، شەڕ لەنێوانیان روویدا... لەجەزیرەوە گەیشتە منداڵەکانی لەخێوەگایەکی دەرەوەی وێرانشار تووشی چوار هەزار سەربازی توورك هات، دووهەزار لەدیاربەکرو دوو هەزار لەسیواس ، ئەوانە بەدوای بەگەکانی عەبدولحەمیدەوە بوون موعەمۆو خەلیل عەبدورەحمان کوڕانی پاشا بۆدیارخستنی ئەو زێڕەی لەناو سندوق دانراوە ..شەڕی گەرم لەنێوان هەردوولا هەڵگیرسا، پێکدادانی دوورو درێژ پێنج رۆژو شەوی خایاند ناچاری چەك تەسلیم کردن بوونو لەناوچەکە دەرچوون... بەنووشستیو تێکشکاوی چوار سەد کوژراویان دا، نامەیەکی بۆ والی دیاربەکر ناردو ئاکامی شەڕەکەی بۆباس کردبوو، والی هەواڵیدا بەکۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی کەبەڕێگەی بروسکە فەرمانیدا بەفەرماندە سەربازیەکان بەسیوپێنج هەزار سەربازەوە بۆی بچن کە ئەوانیش سیو پێنج تفەنگیان پێبوو..... کاتێ کەوتنە هێرش بردن کوڕانی پاشا شەش سەد جەنگاوەریان لەگەڵ بوو، لەلای رووباری جەرجیب لەنێوان وێراشارو نەبی ئەیوب بەیەك گەیشتن رووی چەکەکانیان کردە یەکترو تەواوی ئەو رۆژە شەڕ بوو، کوشتاری زۆرلەهەردوولا بوو. سوارەکان دوو رۆژی تەواو بەرەو رۆژهەلات رۆیشتنو سەربازەکان بەدوایانەوە هەتا گەیشتنە رووباری زورکان لەنێوان قەسری حوسەینو گردە رەشەی سەر ڕێگەی ژەنگار... هەروەها لەرێگە لەگەڵ شێخی شەمەری یاخی بەرەنگاربۆوە، لەدوای شەڕو تێکشکانی ئەمان دوو رۆژیتر بەڕێوە بوو هەتا گەیشتە رووباری سەیفیەی نێوان گردە رەشەو حەسەکە لەوێ ئیبراهیم پاشا دەمرێ.... سوپایەکەی پاشا بەڕێوە بەرەو گردە رەشەو خاتوونیە خۆیان سازدابوو بگەنە چیای ژەنگار بەلام هۆزی یەزیدیەکان بەرەنگاریان بوونەوەو کوشتاریان کردن هەتا بەرەو باکور رۆیشتنو گەیشتنە ئەوێ.... سەربازەکان بەچەکەوە

گەیشتن و دەورەیان دان و ناچارکران خۆبەدەستەوە بدەن[٧٢].

گریمان ئەو دەستنووسە راستە بەڵام کۆمەڵێك پرسیار دێتە پێشەوە. بۆچی ئیبراهیم پاشا سوریای نەکردە بنکەیەکی گرنگی جولانەوەکەی؟ بۆچی هەردوو قونسوڵی بەریتانی و فەرەنسی هەواڵی پیلانی ئیتحادیەکان بەگرتن دەدەنە ئیبراهیم پاشایەك کەناسراوە بەملکەچی بۆ سوڵتان؟. لەدوای مردنی ئیبراهیم پاشا هۆزی میللی تووشی ئەوپەڕی وێرانی بوون، هێزی ئیتحادیەکان ئەو هەموو زێڕو پارە هەڵگیراوەی ئیبراهیم پاشایان زەوت کرد کەلەناو سندوق لەژێر زەوی شاردبوویەوە، هەروەها لەگەڵ زیاتر لە ١٥٠٠ سەر مەڕو سەدان ئێسترو قەڵا دەستی بەسەرا گیرا. خزم و کەسی ئەویان لەتەراوگەش لەشارەکانی موناستەرو سولانیك و ئەستەنبوڵ دەرپەڕاند. هەروەها دادگایی رووکەشانەیان دانا بۆ کوڕەکانی ئیبراهیم پاشا و زۆربەیان هاویشتنە گرتووخانە، عەبدولحەمیدی کوڕیان لەگرتووخانە دەرمان خواردوو کرد، گەورەو بازرگانەکانی دیاربەکرو حەلەب و ئورفەو ماردین کەلەسیاسەتی ئیبراهیم پاشا زەرەرمەندبوون ئەمەیان بەدەرفەت زانی کەوتنە تۆمارکردنی سکاڵا لەسەر کوڕەکانی ئیبراهیم پاشا. بەئیشارەتی ئیتحادیەکان لەشاڵی ١٩٠٩ز هۆزە کوردیەکانی وەکو بەرازی و کراکاجی و هۆزە عەرەبیەکانی وەکو سایەو شەمەڕو عەترەو جەیس هێزێکی ١٠٠٠٠ کەسیان پێك هێنا و هێرشیان کردە سەر هۆزی میللی و گوندەکانیان تالان کردن، جارێکی تریش کوڕەکانی برانەوە گرتووخانەو لەبەرانبەر دادگای عورفی دادگایی کران. دیارە قونسوڵی بەریتانی لەدیاربەکر ئەوپەڕی ناڕزایی لەو کارە دەربڕیوەو داوای لەبەرپرسان کردووە سنوورێك بۆ ئەو دەشتدرێژیانە دابنێن. هەروەها داوای کردوە یارمەتی بەسەر زیان لێکەوتوانی وێرانشاردا دابەش بکرێ. خەنسە

خانمی خێزانی ئیبراهیم پاشا لەدوای مێردەکەی سەرکردایەتی پاشماوەی هۆزەکەی دەکردو داواکاری دەنووسی بۆ بەڕێوەبەرایەتیە رەسمیو قونسوڵیەکانی ئەورووپیو داوای بەردانی کوڕەکانی دەکرد(٧٣). لەساڵی ١٩١٢ز کوڕە گەورەکەی ئیبراهیم پاشا لەبێرچك بەسەرۆکایەتی ٤٠٠٠ سوارەی حەمیدیەوە وەکو فەرماندەیەکی کوردو بەرهەڵستکاری ئیتحادیەکان بەدیار کەوت. لەحەلەب هێژا ڤۆنتای قونسوڵی بەریتانی باس لەکوڕەکەی ئیبراهیم پاشا دەکاتو زۆر لەباوکی بەرۆشنبیرترو کارزانو بەتواناتری داناوە بۆ سەرکردایەتی کورد(٧٤). لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی مەحمود پاشای ئیبراهیم پاشا یەکێك بووە لەگرنگترین پاڵێوراوەکانی بەریتانیا بۆ سەرکردایەتی کردنی دەوڵەتی کوردی ئەگەر پێکبهێنری(٧٥). یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەداربەکر لەو قەناعەتە بووە کەوتنو مردنی بزووتنەوی ئیبراهیم پاشا پشتیوانی مەعنەوی گەورە بووە بۆ دەسەڵاتی ئیتحادیەکان لەکوردستانو فەوتانی کۆسپێکی گەورەی بەردەم رژێمی تازە بووە لەتورکیا(٧٦).

بەڵگەنامەی سێیەم بایشان ئۆغلو لەکتێبی مێژووی دیاربەکر بڵاوی کردۆتەوەو عارف بەرزنجیزادەی نوێنەری ئیتحادیەکان لەدیاربەکرو ئەندامی ئەنجومەنی ئەو شارە ئاماژەی پیداوە، پێشتر لەگەڵ هێزەکانی حکومەت لەهێرش بۆسەر ئیبراهیم پاشا لەوێرانشار بەشداری کردبوو، ئەمەش لەزۆر لەلایەکەوە جەختە چ لەسەر راستگۆیی دەستنووسەکەی ئەسەری، بەڵام لەچارەنووسی سامانەکەی ئیبراهیم پاشا جیاوازی هەیە. عارف ئەفەندی ئیدعای ئەوە دەکات هێزەکانی عوسمانی لەوێرانشار لەگەڵ ئیبراهیم پاشا بینیویانە بەڵگەنامەکانیش دڵنیامان دەکەنەوە کە لەهەڵگەڕانەوەکەیدا دژی حکومەت دەستی لەگەڵ ئینگلیزو ئیتاڵیو

فەڕەنسی تێکەڵ کردووە. ئایا ئەمە پشتگیری نیە بۆ قسەکانی ئەسەری کە ئەو دوو قونسولّیەی باسمان کردوون پشتیوانیان لەئیبراهیم پاشا کردووە بەلاّم دەسەلاّتی حکومەتی مەرکەزی ئەو بەڵگەنامانەی لە بەرپرسانی وێراشار ویستووەو سلێمان پاشا لەمە کەمتەرخەم بووەو خوی لەناردنی ئەو بەڵگەنامانە بۆ ئەستەنبوڵ گێل کردووە[٧٧]. تاوانبار کردنی ئیبراهیم پاشا بەپیلانگێران لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپی دژی ئیتحادیەکان لەمێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی‌شتێکی تازە نیە. ئەمە لەکاتێکدا عارف ئەفەندی ئەم شاهیدیەی لەو کاتەدا بۆ ئەنجومەنی نوینەران داوە کەدەوڵەتە ئەورووپیەکان دوورگەی کریتیان داگیرکردووەو یارمەتی گەلانی بەلقانیان داوە بۆ جیابوونەوە لەدەوڵەتی عوسمانی. لەو کاتەدا دەوڵەتی عوسمانی نیگەرانی زۆری هەبووە لە دەوڵەتانی ئەورووپی و عارف ئەفەندی ئەمەی بۆ دژایەتی دژەکانی بەکار هێناوە کە تاوانباریان دەکات بەدزینی سامانێکی زۆری وێراشار. بەقسەی عارف ئەفەندی دوو ملیۆن لیرەی زێڕو بەهای ملیۆنێك لیرە لەزێڕو گەوهەر لەخەزێنەی وێرانشار دابووەو خەنسەخانم و کوڕەکانی بەر لەگەیشتنی هێزەکانی حکومەت شاردبوویانەوە، هەزاران تەن گەنم و کەرەستەی خۆراکی ئەمبارکراو لە١٥٠ گوندی دەوروبەری وێرانشار هۆزە عەرەبەکان لەگەڵ هێزەکانی حکومەت لەکاتی هێرشەکەی سەر ئیبراهیم پاشا تالاّنیان کردوە[٧٨]. ئەسەری بەدڵنیاییەوە دەڵێ هەموو شتەکان تالاّن کران، بەلاّم بەهیچ شیوەیەك چاوەڕوانی ئەوە لەسلێمان پاشای دڵڕەق لەسەر ئیبراهیم پاشا ناکرێ ئەو بەڵگەنامانەی دوژمنەکەی ریسوا دەکەن بیانشارێتەوە. سەرەڕای ئەمە لەکاتی بزووتنەوەکەی ئیبراهیم پاشا پەیوەندی ئیتحادیەکان و بەریتانیا و فەرەنسا لەمانگی هەنگوینی دابووە، چاوەڕوانی ئەوە ناکرێ ئەو دەوڵەتانە پشتیوانی لەئیبراهیم پاشایەك بکەن کەلای ئەوان بەکوشتنی ئەرمەن تاوانبارە. هەموو ئەو سەرچاوانەی باسمان کردن لەناویاندا دەستنووس و بەڵگەنامەکانیش ژمارەی جیاجیا دەدەن

لەسەر ژمارەی جەنگاوەرو کوژراوو بریندارى هەردوولا. من هەموو نامەو بەڵگەنامەکانى بەریتانى پیوەندار بەئەو مەسەلەیەم تاوتویٚ کردو نەمتوانى سروشتى پەیوەندى بوونى نێوان ئینگلیزو ئیبراهیم پاشا دیارى بکەم.

ئەگەر ویستمان بزوتنەوەکەی ئیبراهیم پاشا هەڵبسەنگێنین دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کەبزووتنەوەیەك بووە گوزارشتى لەقبولٚ نەکردنى کورد کردووە لەبەرانبەر سەپاندنى ئاکارى عەلمانیەتى ئیتحادیەکان لەجیاتى شەریعەتو دەسەلاٚتى سولٚتان عەبدولحەمید لەکوردستان بەهۆی تیپەکانى حەمیدیەوە کورد توانیبووی نەهێلٚیٚ حکومەت مەرکەزیەتو تورکچیەتى بەسەر کوردستاندا بسەپێنن. بۆیە تیپەکانى حەمیدیە بەئاراستەی دژایەتى بزووتنەوەی کورد نەبووە بەڵکو ئامرازێکى گرنگ بووە بۆبەدەستهێنانى ئەندازەیەك لەحوکمى زاتى. بەقەناعەتى هەردوو مامۆستایان پرۆفیسۆر ئۆلٚسن‌و وان بۆنسن ئیبراهیم پاشاو زۆربەی سەرکردەکانى ئازادى (١٩٢٣ـ ١٩٢٥) لەو سوارەی حەمیدیەن ، لەگەڵ قەناعەتى هەردوو مامۆستایان پرۆفیسۆر ئۆلٚسن‌و ڤان بۆنسن کە لەشکرى حەمیدیەی ژمارەیەکى زۆرى سەرکردەی مێژوویى(سیاسى‌و سەربازى) هاوچەرخى داوە بەکورد(٧٩). هەروەها زۆر لایەنى وێکچوو هەیە لەنێوان بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشاو بزوتنەوەی مەلا سەلیم(١٩١٣)و شێخ عەبدوسەلامى بارزانى(١٩٠٨ـ ١٩١٤)و شێخ سەعیدى پیران(١٩٢٥)و مەلا خەلیلى مەنگوڕی بەوەی هەر هەموویان کۆك بوون لەسەر بەرگرى لەشەریعەتو مەزلٚومیەتى کورد، هەموو ئەوانە بەسەرکردایەتى زانایانى ئیسلامو شێخانى تەریقەتى سۆفى بەشێوەیەکى ئیرتیجالى بووە لەدەورى کەسایەتى سەرکردە کۆبوونەتەوەو بەنەمانى سەرکردەش بزووتنەوەکەیان کۆتایى پیٚهاتووە.

# بەڵگەنامەکان

## بەڵگەنامەی ژمارە(١) .........

عەریزەیەك بۆ/ غازی ئەدهەم پاشا سەرۆکی بەڕێوەبەری نووسین لەکۆشك (کۆشکی سوڵتان عەبدولحەمید). ====== لەکتێبی بێشان ئوغلو لاپەڕە٤٤٧ وەرگێڕاوە.

بەر لەدامەزراندنی سوپای نیزامی عوسمانی باب و باپیرانمان لەخزمەتی دەوڵەتی عوسمانی دابوون (خوا تەمەنی درێژ بکاتەوە) بەسیفەتی سوارە (سباهی: هێزی سوارەی عوسمانی = دانەر) لەو ماوەیەدا هۆزی میللی شوانکارەو بەکولەمەرگیٚ بەدوای بژێوی دابوون، بەڵام لەدوای راگەیاندنی سەربازی ئیلزامی هەمووماں وەکو سەرباز چووینە خزمەتکردن. ئێستاش هەندێکمان وەکو سەرباز خزمەت دەکەین و بەشێکیترمان وەکو خۆبەخش لەپلەوپایەی جیاجیای سوپاو هەندێکی ترمان وەکو سەربازی یەدەك لەخزمەت داین. نەوەکانیشمان بەسیفەتی جیاجیا لەهەموو سەربازگەکانی دەوڵەت خزمەت دەکەن. ئێستاش خۆمان و باپیرانمان هەر بەسەربازی دڵسۆزی دەوڵەت دەمێنینەوە، دڵسۆزی و فیداکاری لەپێناوی دەوڵەتی عوسمانی بەدەمارمان تیٚدەپەڕیٚ و خۆشەویستی نیشتمان لەگەڵ خوینمان تێکەڵ بووە، ئەم نیشتمانە بەم خوێنە نەبێت پێش ناکەوێت، هەرکاتێکیش پێویستی بەئێمە هەبێت وەکو سەربازی دڵسۆز لەخزمەتی داین. بەڵام ئێستا هوزی میللی وا ناسراوە کە بەتاڵان و زەوتکردنەوە خەریکەو لەسەر ئەو خزمەتەشەوە بوونەتە لەکەی شوورەیی بۆ لەشکری عوسمانی، ئەوانە لەسەر تاڵان و زەوتکردن دەژین و چەکی ئەمانەتی حکومەتی پاشایەتی لەدژی سەربازی نیزامی بەکاردەهێنن، ئەوانە گروپێکی یاخی و شایانی نازناوی سەربازی و شەرەف سەبازیەتی نین.

ئیبراهیم پاشا لای ئێوە وەکو سەربازێکی دڵسۆز خۆی نیشان دەدا کەشاهیدو پشتگیری راپەڕینی هۆزە یەزیدیەکانی رۆژهەڵاتە ئەو

یەزیدیانەی بەخوێنی مسوڵمانان تینوون و بکوژی ئەفسەر(یۆزباشی) و بیست کەسن لەفەسیلەی سوارەی سەر بەئۆرفەی ١٣٢١. هەروەها (حوسێن قونجو) لەهۆزی دینان (یەکێکە لەپشتیوانانی ئیبراهیم پاشای میللی) پێشتر حەوت کەسی لەسەربازانی نیزامی ماردین ١٣٢٨کوشتووە. هەموو ئەو تاوانانەی لەتۆمارەکانی بابی عالی تۆمارکراوە، هەروەها پێش دوو ڕۆژ دەستدرێژیان کردە سەر جەندرمەو مەفرەزەیەکی ئێمە، هەموو ئەو دەستدرێژیە چەپەڵانەش لای شەرەفداران قبوڵ نیە.

ئیبراهیم پاشا دوژمنی ئاسایشی گشتی و دوژمنی شێخ و سەیدو زانا و هەموو خەڵکە، لەشکرە تایبەتیەکەی پەیڕەوی نەریتی پلەو پایەی سەربازی ناکات و بەهیچ نیزامێکەوە پابەند نین، ئەمانە دزن و بێ‌دوودڵی چەك لەدژی خەڵك و سوپای نیزامی بەکار دەهێنن، لەبەر ئەم هۆیانەیە ئیبراهیم پاشا بەپاسەوانی جاهیلیەت دەژمێردرێت بەڵکو خراپترە لە ئەبوجەهل.

ئیبراهیم پاشا منداڵەکانی نەناردۆتە قوتابخانە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دواکەوتوویی فیکری و ڕێزی ئەو بۆ زانست و رۆشنبیری، زۆر جار کوڕەکانی بەر لەتەمەنی نۆ ساڵی دەکاتە فەرماندەی هێزێکی گەورە، ئەمەش بەلگەیەکی‌ترە لەسەر دواکەوتوویی.

زانا و پیاوچاك و شێخەکان زۆر نیگەرانن لەهەڵسوکەوتەکانی ئیبراهیم پاشا و بەهەڕەشەی دەزانن بۆ سەر ئاسایش و ئاشتی ولایەتەکانی ئورفەو دیاربەکرو ماردین. ئەو ڕێزە ناشایستەی لەئیبراهیم پاشا دەگیرێ جێی گاڵتەو ناڕەزایی هاولاتیە دڵسۆزەکانەوا لەئیبراهیم پاشا دەکات لەسەر کارە دوژمنکاریەکانی بەردەوام بێت.

بۆیە ئێمەی سەربازو نەوەی سەربازان و کەسانی روناکبیر وەکو فەرماندەی سوپا پیرۆزەکەمان داواتان لێ‌دەکەین بۆ نەجاتی کەسایەتی سوپا و شەرەفی ئومەت خۆ لەئیبراهیم پاشا و کوڕەکانی دەرباز بکەن.

بەئیمزای (٢٥)کەسایەتی خەڵکی دیاربەکر لەناویاندا زیا کۆك ئەلپ هەیە

ساڵی ١٩٠٧ز

## بەڵگەنامەی ژمارە (٢)

گوتاری عارف ئەفەندی بزرنجی‌زادە نمایندەی دیاربەکر لەئەنجومەنی نیشتمانی تورکی لەسەر بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشای میللی. ---- لەکتێبەکەی بیشان ئۆغلو وەرگیراوە .

یاخی‌بووی ناسراو ئیبراهیم پاشای میللی هەر یەك هەفتە دوای راگەیاندنی شۆڕشی دەستووری(٢٣ی تەممووزی ١٩٠٨ز دانەر) یاخی‌بوونی خۆی راگەیاند. لەکاتی راگەیاندنی دەستوور ئیبراهیم پاشا بەڕێوە بوو بچێت بۆ مەدینە بەڵام لەگەڵ بیستنی هەواڵ ئالای هەڵگەڕانەوەی بەرزکردەوەو گەڕایەوە وێرانشار، لەوێ کەوتە گەمارۆدان و هەوڵی دەستبەسەراگرتنی سوپای نیزامی عوسمانی. خەڵکی دیاربەکر بەم هەواڵە زۆر سەریان سوڕما، یەکسەر وەزیری جەنگی عوسمانی ئاگادارییەکی دەرکرد بۆسوپای یەدەك لەدیاربەکر، هەتا کات بەفیڕۆ نەچێت و چارەسەری نەبوونی پێویستییەکانی وەکو پارەو تەقەمەنی و پۆشاك بکات بۆ بەتەنگەوەچوونی هێزە گەمارۆدراوەکەی وێرانشار، لەوکاتە هێزی یەدەك زەرووری بوو. لەسەر ئارەزووی خەڵکی دیاربەکرو والیش هەر وای‌پێ‌چاك بووکە رێوشوێنی خێرا بگیرێتەبەر بۆ ئەو مەبەستە لەسەر داوای فەرماندەی سەربازی لەولایەت و لقی دیاربەکری کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی سەرپەرشتی ئامادەکردنی ئەو هێزە بۆ سەر ئیبراهیم پاشای یاخی بەمن سپێردرا. رێککەوتین ناحیەی دێرك کەهەشت سەعاتەڕێ لەوێراشارەوە دوورە بکرێتە مەڵبەندی ئەو هێزە حکومیانەی بەکاردەهێنرێن بۆسەر ئیبراهیم پاشا،ئەشراف و فەرمانبەرانی دیاربەکر بۆ بەجێ‌هێنانی ئەو ئەرکە یارمەتیان دام، بەماوەی دوو رۆژ توانیمان ئەو ئەرکە گرنگە بەئەنجام

بگەیەنین و هێزی چەكدارمان لەخۆبەختكەران و سوپایەك بەقەوارەی ۲۰۰۰ چەكدار كۆكردەوە. ناسنامەو مەزبەتە تایبەتیەكانی خۆبەختكارانمان ناردە بەڕێوەبەرایەتی تەجنید. ئەوەی من ئاگادارم نوسخەی ئەسڵی ئەو نوسراوانە لەدائیرەی ئەوراقە لەولایەت، لەدوای ئاگاداری بەرپرسان بڕیاری ناردنی هێزەكانی یەدەك و خۆبەختكاران و پۆلیس لەگەڵ چەك و تەقەمەنی پێویست دەرچوو بۆ دێرك.

لەدوای بڕیارەكانی وەزارەتی جەنگ نزیكەی ۳۵۰۰ سەربازی خۆبەختكارو یەدەك كۆبوونەوە بۆهێرش بكەنە سەر وێرانشار. ئەو هێزانە پێكهاتبوون لە ۸۰۰ سوارەی حەمیدیەی سەر بەكەتیبەی ٤٧ لەنەوەی هوزی(تەی) و ۲۰۰ خۆبەختكار لەسوارەی هۆزی(ئەزنناوەر) و ۲۵۰۰ سەرباز لەدیاربەكرو دێرك، هیچ پارەو گەنم لەئەمباری دێرك دانەبووەو نەفرۆشراوە، بۆیە بەخێرایی كەوتمە كڕینی گەنم، دەسەلاتدارانی حكومی پێیان وتین پارەتان لەماردینەوە بۆ دەنێرین، هەتا ئەو پارەیە دەگات داوایان لێكردم كارەكان رێك بخەم.

لەدیاربەكرەوە یەك ئۆقچەش نەگەیشت، ئەو هەموو سەربازەش كۆببۆوەو پیویستیان بەكەسێك هەبووە پارەیان بۆ دابین بكات، بڕیارم دا بەرەنگاری ئەو كێشەیە ببمەوەو بەعەزیمەت بووم هەتا بۆ ئەو مەبەستە هەندێ كۆمەكی خەڵك گەیشت.

دوو رۆژ دوای گەیشتنی سەرتیپ ئەمین پاشا بۆ دێرك و لەژێر فشاری هێزە نیزامیەكانی حكومەت ئیبراهیم پاشای یاخی ناچار كرا هەڵبێ و لەگوندی(قەسری حوسێن قۆنجۆ) كە چوار سەعاتەڕێ لەدێرك دوورە سەنگەر بگرێ، دوایی سەرتیپ ئەمین پاشا بەو هێزە نیزامیەی لەگەڵیدابوو هێرشی كردە سەر گوندی(دێشێ)ی نزیك گوندی(هیلالی). لەوێ نامەیەكی بۆ ئیبراهیم پاشا نووسی و داوای خۆبەدەستەوەدانی لێكرد لەگەڵ هەموو

ئەو چەکە حکومیانەی لەلایەتی، لەولاّمی نامەکەدا وتبووی (من ئامادەی دادگایی کردنم لەبەرانبەر ئەنجومەن (پەرلەمان)ی ئەستەنبوڵ بەلاّم ئامادە نیم چەکەکان بدەمەوە. دوای دوو سەعات لە وەرگرتنی ئەو ولاّمە ئیبراهیم پاشا لەگەڵ ۱۰۰۰لەچەکدارەکانی ویرانشاری بەجێهێشت و بەرەو ژەنگار چوو.

دوای دوو ڕۆژ هێزەکانمان گەیشتنە قەلاّی(حوسێن قۆنجو) ئەمین پاشا دوو فەسیلەی نارد بۆ پاسەوانی ۱۰۰ رەشماڵگەی ئەو یەزیدانەی دوو سەعاتەڕێ لەهیلالییەوە دوور بوون، بەلاّم بەفەرمانی وەزارەتی جەنگ هێزەکانی حەمیدیەی سەر بەفەسیلەی ٤٤ی سەر بەهۆزی قەرەقاج و هەزاران چەکداری عەرەب لەهۆزە چەکدارەکانی عەرەبی وەکو شەمەرو عەترە کەلوپەل و مەڕو ماڵاتی ویراشارو دەورووبەریان تالاّن کرد، بۆ ڕۆژی دوایی هێزەکانی یەدەك کەوتنە تالاّنکردنی ئەو رەشماڵە یەزیدیانەی لەسەرەوە باسمان کرد، کارێکیان بەسەر هێنان مەڕو ماڵاتیان لەبیر نەما.

ئەمین پاشا دەست بەجێ فەرماندەی ئەو یەکە سەربازیانەی کۆکردەوەو داوای لێکردن کەلوپەل و تالاّنیەکان بگەڕێننەوە، بەشێکی سامان و ئەسپە گرانبەهاکان درانەوە بەخاوەنەکانیان.

لەسندوقی ژیاندنەوەی تایبەتی (الاعاشە الخاصە) نان و یارمەتی و خۆراکم دا بەهێزە نیزامیەکان و وەسڵی تەسلیم کردنم لێوەرگرتن و گەڕامەوە دێرك، لەوێ کۆبوونەوەمان لەگەڵ (تیپی هێزی نیزامی و هێزی یەدەك و چوار تیپی سوارەی نیزامی کە لەویرانشار دەگەڕانەوە) ساز دا، سەربازەکان بەرپرسیاربوون لە قەدەغەکردن و گەڕانەوەی دەستکەوت و دەبوایە لەپێش هەموان لەشکرەکە لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرایە و من لەوەدا بەرپرسیار نەبووم.

بڕیارماندا دەستکەوتەکان بگەڕێنینەوە ئەمەش جێی داخ بوو، بەهۆی

بەرپرسیایەتیەکەمەوە لەسەر رووداوەکە نامەم بۆ قەڵەمی ولایەت نووسی و لەدوای ئەوەی نوێنەرێکم بۆ خۆم داناو گەڕامەوە بۆ دیاربەکر، ئەمەش ٢٠رۆژی خایاند . قەڵەمی ولایەت لە١٦ی ئەیلولی ١٩٠٨ نوسخەیەکی لەو وەرەقەیەو بەڵگەنامەکان بەلاسلکی نارد بۆ وەزارەتی ناوخۆ، بەفرمانی هەردوو وەزارەتی ناوخۆو جەنگ چەندین لیژنەیان نارد بۆ گەڕاندنەوەی (مەڕو مالاَت و سامان)ە تالاَنکراوەکان.

لەگەڵ ئەوەدا من رۆڵم هەبووە لە وەرگرتنی ئەو دەستکەوتانە بەلاَم بەجورئەت نەبووم لەخستنەڕووی سکالاَنامە لەدژی ئەو ئەفسەرو ئاغا کوردانەی هاوبەشیان کردبوو لەتالاَن و زەوتکردن.

لەدوای گەڕانەوەم لەدێرك هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران دەستی پیٚکرد. لەکۆی ٥٨ دەنگ ٤٢دەنگم هێنا، بەزۆرینەی دەنگ دەرچووم بۆ ئەنجومەن و بەرەو(دار السعادە) لەئەستەنبوڵ بەڕیٚکەوتم. لەدوای هەڵبژاردنم کۆمەڵێك سکالاَ لەدژی من تۆمارکرا. هەندیٚ لەو کەسانەی سکالاَیان تۆمارکردبوو لەو زیان لیٚکەوتوانە بوون لەکاتی بەرپرسیاریەتیم لەسەرۆکی شارەوانی دیاربەکر تا تەمووزی ساڵی رابردوو لێپرسینەوەم لەگەڵدا کردبوون، هەندێکیتر لەوانەی سکالاَیان نوسیبوو لەو هێرشەی کردمان بۆسەر ئیبراهیم پاشای یاخی بەشدار بوون لەگەڵمدا، بەلاَم دەنگی پێویستیان بۆ هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران نەهێنابوو. نەمویست وەلاَمیان بدەمەوە چونکە خۆم نەهێنایە ئاستی ئەوان و بۆ کاتی گونجاوم واز لیٚهێنا، شتێکی ئاساییە گەندەڵ و دەروون نەخۆشەکان بۆ تێکشکاندنی من یەك بگرن. سەبارەت بەقسەی من لەسەر میوانەکانی جەزیرەو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا کەپێشتر ئامارژەم پیٚدابوو ئەوانە چۆن هاتوونەتە دانیشتنی ئێمە بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێك بەڵگەنامە لەبارەگای ئیبراهیم پاشا لەوێرانشار کەئامارژە دەکات بەپەیوەندی نێوان ئیبراهیم پاشا و سەرانی

دیکتـــاتۆر(مەبەســـت لەلایـــەنگرانی ســـوڵتان عەبدولحەمیـــدە)و هێـــزە داگیرکەرەکانی دورگەی کریت(ئیتالیا و بەریتانیا و فەڕنسا)، هەر لەو کاتە مـن داوام لـەوالی کـرد کەمتەرخـەمی نـەکات و ئـەو بەڵگەنامانـە بنێـریٚ بـۆ ئەستەنبوڵ، بەڵام ئەو لەوڵامی داوایەکەی ئەنجومەنی نوێنەراندا وتبووی (هـیچ بەڵگـە نامەیـەکی لـەو جـۆرەی تیـا نیـە کـەعارف ئەفەنـدی ئامـاژەی پـیٚدەدا)، داوای لەئەنجومـەنی کـارگێڕی و خـەڵکی وێراشـار کردبـوو لـەو بارەیەوە مەزبەتە بنوسن بەڵام ئەوان دۆست و لایەنگری من بوون و وەڵامـی ئەو قسانەی ئەویان نەدایەوە کەلەبنەڕەتەوە پێچەوانەی راستیە گشتیەکان بوو.

وەکو دەڵێن قەدری پاشای قایمقامی وێرانشار ئەو بەڵگەنامانەی دەست کـەوتووە، بـەڵام نـازانم ئێسـتا ئـەو بەڵگەنامانـە لـەکوێن، هـەموو لایـەکیش شاهیدی پـاکی و بیٚتـاوانی مـنن. سـەرتیپ ئـەمین پاشـا و والـی نامـەیان بـۆ وەزارەتی جەنگ و نـاوخۆ نوسیووەو منیـان تاوانبـار کـردووە بـەڵام بیٚئاکام بووە، لەکاتێکدا وەزیری ناوخۆ هێژا (هەقی بەگی) کـردوە بـەوالی دیاربـەکر، ئێسـتا پیـاوێکی عەسـکەری و دیکتـاتۆرەو دانـانی ئـەو پیـاوە کـارێکی چاك نـەبوو کـە دەتـوانن راسـتی ئـەو مەسـەلەیە لەکۆبوونـەوەکانی ئەنجومـەنی پیاوماقوڵان ببیسـتن. تاسـەر ئـەو راسـتییە وون نابێـت و لای هـەموو کـەس ئاشـکرایە بەدرێـژایی چـالاکیە سـەربازیەکان نەچـووم بـۆ وێرانشـارو بەدرێـژایی مـاوەی چالاکیەکان لـە گونـد ماومەتـەوەو ئێسـتا ئـەم بوختانـە لیٚدەگـەڕێم بـۆ رای گشـتی. لەبـەر دەم دادگـا ئامـادەم بـەرەو رووی هـەموو ئەمانـە ببمـەوە. ئـەوەی شـایانی باسـە سلیمان پاشـای والـی دە رۆژ دوای جولانەوەی ئیبراهیم پاشا گەڕاوەتەوە، بەگوێرەی زانیـاری مومتـاز ئەفەنـدی لەبەرانبـەر لیژنـەی حکـومی وتوویـەتی ئیـبراهیم پاشـا بـەر لەبزووتنـەوە یاخیبوونەکـەی ملیونێـك لـیرەی زێـرو کەلوپـەلی بـەنرخی بـایی ملیونێـك

لیرەی هەبووە. لیژنەی حکومی لەپیاوانی قانونی و دارایی پێکهاتبوو سەردانی وێرانشاری کردو لەوێ (٥٠) رۆژ مانەوەو خەرجی رۆژانەیان ٥٠٠قرش بووە، بەڵام بەر لەگەیشتنی دەستەی لێکۆڵینەوە بۆ وێرانشار خەنسە خانم (خێزانی ئیبراهیم پاشای میللی)و هەر سێ کوڕەکەی توانیبوویان زێڕو زیوو کەلوپەلەکان بشارنەوە. ئەوەی جێی بەبیرهێنانەوەیە ١٥٠گوندی ئاوەدان لەدەورووبەری وێرانشار بەشداریان لەو هەڵگەڕانەوەیە کردبوو هەر گوندێك بەتەنها ٤٠هەزار کیلۆ گەنمو خواردەمەنی وشکی هەبووە لەگەڵ بەرهەمی چاوەڕوانکراوی ئەو ساڵە کە بە١٥٠تا ١٨٠کیلۆ تەخمین دەکرێ. سەرەڕای داوای موتەسەریف و قایمقام بۆدابینکردنی پاسەوان بۆ ئەو گوندانە والی ئەمەی جێبەجێ نەکرد. هۆزە عەرەبی و کوردیەکانیش هێرشیان کردە سەر ئەو گوندانەو هەموویان تاڵان کردن، هەتا لەناکاو ئەو گوندانە تووشی برسیەتی و نەبوونی بوونو کێڵگە کشتوکاڵیەکانیان لەداچاندن کەوت. هەرچەندە حکومەت بەشێك لەو بەرهەمە تاڵانکراوەی بۆ گەڕاندنەوە بەڵام هەتا ئێستاش ناوچەکە برسیەو لەقەیرانێکی سەختدا دەژی، بەداخەوە وێراشار هەر٢٠سەعاتەڕێ لەدیاربەکرەوە دوورە کەچی والی تا ئێستا سەردانی ناوچەکەی نەکردوە، ئەگەر والی سەردانی ناوچەکەی بکردایە حکومەت زۆر لەو سامانەی دەست دەکەوت، لێرەدا دەرفەتم نیە هەموو ئەو بوختانانەی دژی من کراوە بخەمەڕوو، بەهیوام سەدری ئەعزەم حەسەن حیلمی پاشا چاوێکی بەو قسانەی من دابخشاندایەوە.

زیا کۆك ئەلپ

-٢-

# شێخ سەعیدی حەفید

بەدیارکەوتنی شێخ سەعید وەکو ناوەندێکی هێز لەکوردستانی رۆژگاری سوڵتان عەبدولحەمید بەڵگەیەکی‌ترە لەسەر ئەو سیاسەتە لامەرکەزیەی سوڵتان عەبدولحەمید لەبەرانبەر کورد پەیڕەوی لێ‌دەکرد(*)، ئەمە پێچەوانەی ئەو سیاسەتە مەرکەزیە زیادە رۆییە بووە کەسەردەمی تەنزیمات بەر لەسوڵتان عەبدولحەمید پەیڕەو کراوەو هەروەها ئیتحادیەکانیش دەیانویست بەسەر کوردی‌دا بسەپێنن. لێرەدا نامانەوێ بەدریژی بچینە ناو بارودۆخی ئەو کاتەی خانەوادەی بەرزنجی(سادات)و چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو بارودۆخە لێڵەی شێخ سەعیدی تیا کوژرا، چونکە لێکۆڵینەوەکەی بەرێز موحەمەد رەسوڵ هاوار لەسەر شێخ مەحمود پشتبەستوو بەهەندێ دەستنووس‌و یاداشتنامەی هاوزەمان (بەتایبەتی یاداشتەکانی شێخ رەوف کوڕی شێخ سەعیدو کتێبی گەنجینەی مەردانی وەفایی) لەسەر شێخ سەعیدو شێخ مەحمودی کوڕی لێکۆلینەوەی گشتگیرو بابەتیانەن لەسەر ئەو باسە. بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێ تیشکی بخەینە سەر واقیعی رووداوەکانە لەگەڵ باسێکی کورت لەسەر ئەو هۆکارانەی ئیتحادیەکانی گەیاندە قەناعەتی دوورخستنەوەی شێخ بۆ موسڵ‌و دواتر کوشتنی، ئەمانە لەبەر رۆشنایی هەندێ بەڵگەنامەی بەریتانی‌و عوسمانی کەلەکوتایی ئەم وتارە بۆ خوێنەرانی خۆشەویستی بڵاو دەگەینەوە.

شێخ سەعید کوڕی کاک ئەحمەدی زاناو سەرۆکی تەریقەتی قادری‌یە، لەخانەوادەی سەیدەکانی بەرزنجەیە کە لەئەسڵدا دەچنەوە سەر دوو برا

عیسا و موسا، سەیدەکان پێیان وایە دەچنەوە سەر خانەوادەی ئەبو موسای کازم، شێخ سەعید چەند کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە لەوانە شێخ مەحمود کە رۆڵی بەرچاوی گێڕاوە لەبزوتنەوەی کوردایەتی (دواتر باسی دەکەین). وەکو شێخەکانی تری تەریقەت شێخ سەعید رۆڵی گرنگی گێڕاوە لەشەڕەکانی سوڵتان عەبدولحەمید دژی رووسیا بەتایبەتی شەڕەکانی ساڵانی١٨٧٦- ١٨٧٨ز لەسازدان و سەرکردایەتی کردنی کورد. سوڵتان رێزی لێگرت و چەند پارچە زەویەکی سونی(حکومی) لیوای سلێمانی دایە، بەهۆی ئەو ناکۆکیەی نێوان ئەوو تاڵەبانیەکان لەساڵی ١٨٨٩ز بانگی کردە ئەستەنبوڵ و لەوێ سوڵتان لەسەر نەرێتی خۆیی لەخۆیی و دەست و پەیوەندو شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی نزیک کردەوە، وا رێکەوت یەکێك کوڕەکانی سوڵتان نەخۆش بووە و شێخ سەعید دوعای بۆ کردووەو چاك بۆتەوە، هەروەها دوعای(تەلیسمان)ی بۆ سوڵتان خوێنێدووە کەلای خومان بەگوللەبەند ناسراوە، دەڵێن سوڵتان لەسەرەتای سەدەی بیستەم بەهۆی پیلانی چەتە ئەرمەنیەکانەوە لەمەترسی دابووەو بەهۆی دوعای شێخ سەعیدەوە لەمەترسی رزگاری بووە. پێشتریش شێخ خاڵی جوفرەی لەگەڵ سوڵتاندا هەبووەو لەکاتی قەیران و ناخۆشی داوای لەشێخ سەعید کردووە دوعای بۆ بکات(٨٠).

شێخ بەهۆی گەورەیەکەی نەك بەتەنها لەلای سەیدەکانی لیوای سلێمانی بەڵکو لەهەموو ولایەتی موسڵ ببوە خاوەنی نفووزێکی گەورە. بۆ نمونە لەو کاتەی لەئەستەنبوڵ بووە داوای لەسوڵتان کردووە نازناوی پاشا بداتە حاجی موحەمەدی سابونچی کەیەکێك بووە لەخانەدانەکان و ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شارەوانی موسڵ بووە. لەلیوای سلێمانیش راپۆرتی بەریتانی و عوسمانیەکان دەڵێن ( بەبێ مونافەسە بۆ ماوەیەکی زۆر

حاكمی فیعلی بووه) بەهۆی نفوزی سیاسی سەیدەکان خێرا هێزی ئابووریشیان زیادی کرد. چونکە سوڵتان بەبەردەوامی گوندەکانی دەوڵەتی پێ دەبەخشین.

سەرەڕای ئەمە سەیدەکان (وەکو شێخ و سەید و ئاغاکانی کوردستانی باشوور) سیستەمی تاپۆیان بەدەرفەت زانیبوو بۆتۆمارکردنی زەوی بەناوی خۆیان و کڕینەوەی زەوی لەجوتیاران، لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتان ساڵانە ئەندازەی ٤٠٠٠٠ لیرەی ئاڵتوونی تەرخان کردبوو بۆ مانگانەی شێخ سەعید و تەکیەی قادری، سامان و زەویەکانی ئەوان لەزۆر باج و میرانە بەخشرابوون، بۆیە وای لێهات خانەوادەی سەیدەکان سەرەڕای نفوزی گەورەی ئایینی ببوونە ئەرەستۆکراتی(٨١).

شێخ سەعید لەدوای هاتنی ئیتحادیەکان و لەکۆتایی ساڵی ١٩٠٨ز کەوتە بەر مەترسی. سیاسەتی ئیتحادیەکان وەکو هەنگاوێك بۆسەپاندنی مەکەزیەت لەکوردستان و کۆتایی هێنان بەنفوزی ئیسلام و شێخ و زانایانی ناو دەوڵەتی عوسمانی بووە، مانەوەی شێخ لەسلێمانی کۆسپ بووە لەبەردەم ئەو سیاسەتە، شێخ سەعید لەناو شاری سلێمانی و لەدەرەوەی شار دوژمنی زۆری هەبووە. بەرژەوەندی ئەوان و ئیتحادیەکان تێك دەگیرا، بۆیە بەدوژمنی خۆیان دەزانی، لەپێشەوە کاربەدەست و فەرماندە سەربازیەکانی توورك بەتایبەت لەناویاندا فەهمی ئەفەندی و دکتۆر زیا ئەم دوانە شێخ سەعیدیان بەکۆسپ دەزانی لەبەردەم سەپاندنی ویستی دەوڵەت، خراپەی زۆریان لەبەرانبەر ئەنجام داو دەیانویست بەدیلێکی دەسەڵاتی ئەو بدۆزنەوە بۆ ئاسانکاری فەرزکردنی سیاسەتی دەمارگیری لەبەرانبەر کورد، لەلایەکی ترەوە دەیانزانی شێخ پەیوەندی لەگەڵ سوڵتان هەیە و جورئەتیان نەدەکرد لەبەر سوڵتان قسە بکەن، بەڵام رق و قینیان

لێداگرتبوو، لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی کاربەدەستە بچوکەکانی دەوڵەت خۆیان لەشێخ سەعید نزیك دەکردەوە بەو هیوایەی لەزوڵم و زۆرداری خەڵکی بیانپارێزی، بۆیە هەر رووداوێکی کوشتن و تالانی رووی بدایە پەنایان دەبردە بەر پیاوانی شێخ (٨٢). بەپلەی سێیەم ئاغا کوردەکان رکەبەرایەتی شێخ سەعیدیان دەکرد، هەتا شێخ لەناو سەیدەکانیش دوژمنی هەبوو، زۆربەیان دەیانویست مرید و هۆزەکان بەلای خۆیاندا رابکێشن و دەست بەسەر سامانی تەریقەتی قادری دابگرن. لەو ململانێیەش پەنایان دەبردە بەر لێپرسراوانی حکومی هەتا لەبەرانبەر شێخ سەعید پشتیوانیان لێبکات، سەرەڕای ناکۆکی نیوان سەیدەکان و شێخەکانی تاڵەبانی لەسەر دەسەڵات، شێخ بەسەرۆکایەتی خۆی لەساڵی١٨٩٤ز هێرشێکی گەورەی کردە سەر گوندە تاڵەبانیەکان و سوتاندنی، ئەوانیش ناچاربوون لای سوڵتان شکات لەشێخ بکەن، سوڵتانیش بانگی کردە ئەستەنبوڵ و ماوەیەك لەوێ هێشتیەوە. لایەنگرانی شێخ هێرشیان کردە سەر گوندەکانی تاڵەبانی و هەندێکیان سوتاند و چەند کەسیان کوشت، حافیزی مەحمود باشای جاف لەسەرسەخترین دوژمنەکانی شێخ بووە، ناکۆکی نێوان ئەم دوانە لەسەر دوو خاڵی بنەڕەتی بووە:-

یەکەمیان: هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بەشی زۆری جاف کۆچەر بوون و لەکاتی تێپەڕبوونی کاروانی رەوندەکانی جاف بەشارەزووری نزیك سنووری ئێرانی ـــ عێراقی کێڵگە کشتووکاڵیەکانیان وێران دەکرد و جوتیارەکان دەستخەڕۆ دەبوون.

دووەم: مەحموود پاشا بەو حیسابەی سەرۆکی هۆزی جافە باجی زۆری بەسەردا سەپاندبوون، بەشێکی هۆزی جاف (بەتایبەت روغزایی) مریدی شێخ سەعید بوون و سکالایان دەبردە لای ئەو، شێخیش سکالای ئەوانی

دەناردە لای بەرپرسانی حکومی، مەحمود پاشا بەمە زۆر نیگەران بوو، بەسەیدەکانی وتبوو با ئەوان خەریکی نوێژی خۆیان بن و دەست لەکاروباری خەڵکی وەرنەدەن(٨٣). لەبروسکەیەکی مەحمود پاشادا هاتووە کەشکایەت لای بابی عالی دەکات و دەڵێ :-

... بەڵام شێخ سەعید و نەقیبی برای لەو ناکۆکی و ئاژاوەی نێوان خۆیان و شێخەکانی سلێمانی داوایان لەمن کردووە یارمەتیان بدەم، شێخ دەیەوێ من لای بابی عالی ناشیرن بکات و دوایی بڵێ یارمەتیم بدە هەتا لای سوڵتان داوای لێبووردنت بۆ بکەم، ئەگەر یارمەتی نەدەم خەریکی کۆکردنەوەی مەزبەتە دەبێت بۆ مابینی هەمایۆنی، ئەو هەڕەشەی لێکردووم کەلێرەم دوور دەخاتەوە و لەو بارەیەوە مەزمەبەتە لەخەڵکی وەردەگرێ، ئەو شێخانە لەکۆنەوە موحتاجی سۆزو لوتفی باب و باپیرانی من بوون. پەروەردەو چاکسازی ئەوانەی بەخۆیان و خزمەکانیان لەسەد خێزان زیاتر نین ئەگەر لەبەر خواستی سوونی ئێوە نەبێت هیچ باکمان پێیان نیە ...(٨٤).

ئیدارەی عوسمانی لەکوردستان لەرۆژانی سوڵتان عەبدولحەمید لەو ململانێیە پشتگیری شیخ سەعیدی دەکرد و مەحمود پاشا بەوە تاوانبارکرا کێشەو ئاژاوە دەنێتەوە بۆ بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی هۆزی جاف و هەوڵدەدات و دەیەوێ لەجێی برایەکەی ببێتە قایمقامی گوڵعەنبەر(٨٥).

بۆیە هەر کەئیتحادیەکان هاتن دەسەڵاتی عەبدولحەمیدیان سنووردارکرد، ناحەزەکانی شێخ سەعید لقێکی ئیتحادو تەرەقی یان لەسلێمانی کردەوە، مەحمود پاشای جاف بووە سەرۆکی لق و داوای لەشێخ سەعید کرد ببێتە ئەندامی لق، بەڵام شێخ ئیتحادیەکانی بە بێدین و دوژمن بەشەریعەت دەزانی و نەبووە ئەندام، ئەوانەی رقیان لەشێخ سەعید بوو بەهەموو توانا کەوتنە نەخشە داڕشتن بۆدوور خستنەوەی لەسلێمانی، بەر

لەمانگێك لەدوورخستنەوەی خۆیو هەردوو کوڕەکەی(شێخ ئەحمەدو شێخ مەحموودی) یان گرت بەبیانووی ئەوەی قەرزێکی زۆری حکومەتیان لەسەر کۆبۆتەوە. بەناوی خەڵکەوە چەندین مەزبەتە لەسلێمانی نووسراو شکایەتیان لەسەرەڕۆیی شێخ سەعید کردبوو بەوەی دژی خەڵکی سلێمانیو دوژمنی ئیتحادیەکانە، ناحەزەکانی شیخ سێ ڕۆژ پێش دوورخستنەوەی لەسەرا کۆبوونەوەو خەڵکیان ناچارکرد ئەو مەزبەتانە ئیمزا بکەن کەحکومەت دەیەوێ شێخ لەسلیمانی دوور بخاتەوە. لەسلێمانی سێ ڕۆژ ئاژاوە هەر بەردەوام بوو هەتا شێخ سەعیدیان دوورخستەوە بۆ شاری موسڵ، لەدوای ئەو قەسابخانەی بۆ سەیدەکان دانرا لەموسڵ دەرکەوت موتەسەریفی لیواو هەندێ لەبەرپرسانو ناحەزانی شێخ ١٥٠٠لیرەی عوسمانیان وەکو بەرتیل ناردووە بۆ بەرپرسانی موسڵ. بابی عالی بەو حیسابەی سلێمانی شوێنێکی ئارام نیە داوای کرد بیگوازنەوە بۆ موسڵ، داوا لەئیبراهیم ئەدهەم سەرۆکی هێزی سوارە لەسلێمانی کرا لەگەڵی بچێت بۆ موسڵ. لەدوای دوورخستنەوەی شێخ لەسلێمانی کەوتنە تەنگ پێهەڵچنینی سەیدەکانو دەست بەسەر سەروەتو سامانیان داگیرا. یەك لەو مەزبەتانە باس لەدوورخستنەوە دەکاتو دەڵێ: بەداخەوە بەشێوەیەکی گشتی بەرپرسانی ئێستای لیوای سلێمانی کەسانی ناشایستەو مەسلەحەتچینو بەدوای ئارەزووی گەندەڵی خۆیان دەکەون، لەهەر هەنگاوێکی دەیهاوێن مەبەستیانە موخالەفەی شەریعەتو ئاکاری ئیسلامیو نەریتی ئێرە بکەن، ئەوانە بەهەر ڕێگەیەکی بگونجێ خەریکی خۆش ڕابواردنن[٨٦].

لەمانگی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ز شێخ سەعیدو کوڕەکانی شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدو هەندێ لەخزمو خزمەتکارەکانیان گەیشتنە

موسڵ، لەوێ بوونە میوانی حکومەتو موحەمەد پاشا سابوونچی لەنزیك سەرایە بەدووری تەنها ٤ یاردماڵێکی بۆ تەرخان کردن، لەدوای چل رۆژ لەئاکامی ئاژاوەوکارەساتێکی لێڵدا شێخ سەعید دەکوژرێ. لێرەوە لەڕێگەی کتێبی (الضحایا الثلاث)و یاداشتەکانی زێوەرو کتێبەکەی محەمەد رەسوڵ هاوار لەسەر شێخ مەحمود لەگەڵ راپۆرتی قونسوڵی بەریتانی لەموسڵ دەچینە ناو درێژەی رووداوی کوشتنەکە، جیاوازیەکی کەم نەبێت هەموویان لەسەر چۆنیەتی کوژانی یەکدەنگن. هەر لێرەوە داوای لێبوودن لە خوێنەران دەکەم بەدرێژ کردنەوەی ئەم باسە.

لەوکاتەی هەریەك لەشێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدی برایو گەنجێکیتر بەناوی بەهائەدین عەبدوڵڵا هەر هەموویان گەنجو تازە لاو بوون، لە٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٩ز بەبۆنەی جەژنەوە لەماڵی مستەفا بەگ دانیشتبوون بەپیی گێڕانەوی کتێبی(الضحایا الثلاث) بەهائەدین دەچێتە بازاڕ(بەپێی گێڕانەوەی راپۆرتی قونسوڵیەی بەریتانی لەموسڵ بەهائەدین یەکێك لەسوارە کوردەکان دەنێری) ئەم پیاوە لەبازاڕ سەرخۆش دەبێتو لەگەڵ ئافرەتێکی موسڵاوی(دەڵێن رەوشتی باش نەبووە) دەبێتە دەمەقاڵیان، موسڵاویەکان لە تۆڵەی ئابڕۆی ئافرەتەکەیان کۆدەبنەوە. سوارە کوردەکەش(لەئەسڵدا خەڵکی کەکوك بووە) تەقە لەخۆپیشاندەران دەکەنو شەڕ دەکەوێتە نێوان سوارەی کوردو جەندرمە موسڵاویەکانو١٠جەندرمە دەکوژرێ، (راپۆرتی قونسوڵی بەریتانی دەڵێ ٣٠ تا ٥٠کەس دەکوژرێ). بۆ رۆژی دوایی زانایانی موسڵو موسڵاویەکان داوا دەکەن هەموو سوارەی کورد خۆبەدەستەوە بدەنو بدرێنە دادگا. لەدوای بەرگریەکی کەم هێزەکانی کەرکوکوك خۆیان تەسلیمی حکومەت کرد، والی نایەڵێ دادگایی بکرێن،

ئەو جەماوەرەی کوببونەوە داوای شێخ سەعیدو کورەکانی دەکەن‌و والی وەلامیان دەداتەوەو دەڵێ ئێوە دەزانن ئەوان لەکوێن بچن چی‌دەکەن بیکەن. کۆبوونەوە جەماوەریەکە لەژێر فەرماندەی پیاو خراپێك دابووە بەناوی (ئەبوجاسم)، کۆدەبنەوەو هێرش دەبەنە سەر بەڕێوەبەرایەتی زەبت‌و دۆسیەکانی حکومەت دەسوتێنن، بۆ رۆژی سێیەم ئەبوجاسم‌و جەماوەری هێرش بردوو ئەو ماڵە گەمارۆ دەدەن کەشێخ سەعیدی تیایە. شێخ نیگەرانی خۆی بۆ والی بەدیاردەخاو والیش لەرووی سەلامەتیەوە دڵنیای دەکاتەوە، لەوکاتە شێخ ئەحمەد (کوڕی شێخ سەعید)و یەکێك لەپاسەوانەکانی شێخ دەکوژرێ. شێخ ئەوکات تەمەن ٨٠ساڵ دەبوو لەماڵ دێتە دەرێ‌و قورئانێك بەدەستەوە دەگرێ‌و هەندێ سەربازی حکومی لەپشتەوەی بوون، ئەو مەبەستی بوو بگاتە بارەگای والی (هەندێ دەڵێن دائیرەی سەرا). تەنها ٤٠ مەترێك لەماڵی شێخەوە دوور بووە بەلام پاسەوانەکان دەرگای لێ‌ناکەنەوە، لەو کاتە بەردێکی گەورە بەسەری شێخ دادەدەن‌و دەمرێ، ئەبو جاسم‌و گروپەکەشی هێرش دەکەنە سەر لایەنگرانی شێخ‌و ١٧کەسیان لێ‌دەکوژن‌و ماڵی شێخ تالان دەکەن[(٨٧)].

هەتا ئێستاش ئەو بارودۆخەی شێخ سەعیدی تیا کوژا نادیارو لێڵە، کێ بەرپرس بوو لەکوشتنی؟ ئایا بەئیشارەتی ئەستەنبوڵ یان بەپیلانی لقی موسڵی ئیتحادو تەرەقی یان بەپیلانی بەرپرسانی ئەوێ کوژراوە؟ ئایا ئەبو جاسم‌و گروپەکەی لەبارێکی بێ‌سەرووبەرەو بێ‌رووخسەت خواستن کوشتیان؟ هاوار لەلێکۆڵینەوە تێروتەسەلەکەیدا هەوڵی داوە وەلامی ئەو خالانە بداتەوە، لەکۆتاییدا پێ‌ی وایە شێخ سەعید بەدەستی عەلی سەعیدی سەرۆکی ئەرکانی جەنگ لەموسڵ کوژراوەو ئەو ویستویەتی شێخ هانبدات لەماڵ بێتە دەرێ‌و بەرەو سەرا بچێ، لەوێش پاسەوانەکانی ئاگادار

کردۆتــەوە دەرگــای لێنەکەنــەوە هــەتا خــۆی و ئەنــدامانی خێزانەکــەی و دەورووبەرەکەی دەکوژرێن. هاوار ئەمەی لەیاداشتەکانی شێخ قادری حەفید وەرگرتــووەو ئــەویش دەڵــی عــەلی ســەعید بــەگ دانــی بــەو تاوانــەدا نــاوەو وتویەتی بەرێنومایی ئیتحادیەکان ئەمەم کردووە(٨٨).

بــەڵام هەریــەك لــەهاوارو شــێخ قــادر پشــتیان بــە گێڕانــەوەی زارەکــی بەستووە دەڵێن عەلی سەعید بەگ ئەندازیاری کوشتنی شێخ سەعید بووە، ئەمــە پێویســتی بەبەڵگــەی نووســراو هەیــەو یەکلاکــەرەوە نیــە. یــان دەبێــت لەبەڵگەنامەکانی بەریتانی یان عوسمانی یان لــەدانپیانانی نوســراوی یــەکێك لەبەشــداریکاران یــەکلایی بکرێتــەوە، لەکاتێکــدا چــەندین بەڵگــەی‌تر هەیــەو لەچەندان بۆنەدا عەلی سەعید نکۆڵی کردووە لەوەی دەستی لــەو کوشتنەدا هــەبێت، ئــەوەی جێــی باســە قونســوڵیەکانی بــەریتانی چــەندین پرســیار دەورووژێــنن لەســــەر والــــی کــــە شــــێخی دڵنیــــا کردۆتــــەوەو زەمانــــەتی پێویستیشــی نــەداوەتێ.........باشــە بۆچــی ســەرا دەرگــای لێنــەکردەوە؟ والی لەکاتی گەمارۆدانی شێخ لەکوێ بوو؟ راپۆرتی قونسوڵیەتی بــەریتانی دەڵــێ والــی بەئاژاوەچیەکانی وتــووە(چــی دەکــەن لەگــەڵ شــێخ بیکــەن)، خــۆ والی هەر بەهەشتا مەتر لەماڵی شێخەوە دووربووەو هەشت ســەد ســەربازی لــەژێر فــەرمان دابــووە بۆچــی نــەیتوانیوە شــێخ بپــارێزی(٨٩). ئەمانــە هــەمووی پرسیاری گونجاون و دەریدەخەن کە بەتاوانبارکردنی تەنها یەك کــەس لــەناو دەزگای ئیداری موسڵ چارەسەری ئــەو مەتەڵــەمان بــۆ نــاکرێ کــە پەیوەنــدی بەو قەسابخانەوە هەیە. ئەوەی شایانی باسە رۆژێك بــەر لــەو رووداوە والــی هــــەواڵی دابــــوو بەشــــێخ ســــەعید کەبروســــکەی لەســــەر بێتــــاوانی ئــــەو لەئەستەنبوڵەوە پێگەیشتووە لەبەیانیەوە دەتوانێ بگەرێتەوە بۆ سلێمانی. ئایا ئەمە دڵدانەوە بوو یان بەڕاستی والــی نیــەتی رزگــارکردنی هــەبووە یــان

ئاگادار بووە بەپیلانی دوژمنانی شێخ و ویستوویەتی رزگاری بکات؟ ئایا لەماوەی دەسەڵاتداریەتی سوڵتان عەبدولحەمید بەکردەیی ئەوانە لەناو دەزگای ئیدارەی عوسمانی لەموسڵ هەبوون هەندێك پشتگیری ئیتحادیەکان بکەن و هەندێکی‌تر لەسوڵتان ؟ هاوار هۆکاری ئەم قەسابخانەیە دەباتەوە بۆ پیلانێك بۆ دەرپەڕاندنی زەکی پاشای حەلەبی والی، چونکە ناوبراو لەئیتحادیەکانەوە نزیك نەبووە(٩٠). بەڵام هاوار لە عەبدولمونعیم غولامی خاوەنی کتێبی(الضحایا الثلاث) و عیزەت کاکەی سکرتێری شەخسی شێخ سەعید لە شێخ قادری کوڕی دەگێڕێتەوە کەقەناعەتیان وابووە لەناوبردنی شێخ سەعید بەشێك بووە لەنەخشەی ئیتحادیەکان بۆ لێدانی سەرانی دیکتاتۆر، بەدەربڕینێکی‌تر بۆ زاڵبوون بەسەر لایەنگرانی سوڵتان عەبدولحەمید(٩١)، کەقەناعەتی نووسەریش هەر ئەمەیە.

لەدوای لێکۆڵینەوەی دوورو درێژ لەکانوونی یەکەمی ساڵی١٩٠٩ز لەدۆسیەی ئەوانەی دەستیان هەبووە لەسازدانی ئەو قەسابخانەیە رەشید پاشای والی تازە فەرمانی گرتنی ١٤٠کەسی دەرکردو دای بەدادگا بەڵام زانایانی موسڵ ناڕازی بوون و ١٠٠کەسیان بەردا، ئەوانە دەستبەسەرو لێکۆڵینەوە چەند مانگێك بەردەوام بوو، شێخ عەبدولقادری نەهریش داوای لەسوڵتان کردبوو زەمانەیەك هەبێت بۆ دروستی دادگایی کردن. دادگا لەدوای چەند مانگ گەیشتە دەرخستنی بێ‌تاوانی سەیدەکان و گرتنی (٥٠) کەس بۆماوەی سێ ساڵ و لەسێدارەدانی سێ کەس، بەڵام ئیتحادیەکان لەئەستەنبوڵ بەم بڕیارە رازی نەبوون ئەوانە ئازاد کران تەنها یەك کەس لەگرتووخانەدا مایەوە[٩٢]. هەروەها (میلکی یۆنگ)ی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی(بێ‌لایەنانە) ئاماژە بەرۆژنامەکانی ئەو کاتەی ئیتحادیەکان دەکات

لەئەستەنبوڵ کە زیاتر بەدژایەتی شێخ سەعید باسی ئەو قەسابخانەیان کردووە. بۆیە هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری دادگا کە لەبەرژەوەندی شێخ بووە لەگەڵ باسکردنی رووداوەکە بەم شێوەیە دەمانخاتە ئەو بیرکردنەوەی کەئیتحادیەکان لەئاستێکی بەرز دەستیان لەو قەسابخانەدا هەبووە. لازاریف قەناعەتی وایە ئینگلیز لەپشت ئەو قەسابخانەوە بووە بەدروستکردنی ئاژاوە لەموسڵ لەنێوان کوردو ئەو عەرەبانەی داوای لامەرکەزیان دەکرد لەدەوڵەتی عوسمانی(۹۳). بەڕوونی دیارە ناحەزی هەبووە لەنێوان ئەفسەرانی ئینگلیز وەکو مێجەرسۆن و ئەدمۆنس بەرانبەر سەیدەکان بەگشتی و شێخ سەعید بەتایبەت. بیرترارد دکسۆن، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەوان لەساڵی۱۹۰۹ز سەردانی سلێمانی کردووە لەسەر شێخ سەعید ئاوا دەنووسێ: (خراپترین پیرەمێردی دەوڵەتی عوسمانیەو دەستێکی باڵای هەیە لەتاڵانی و بەکارهێنانی هێز بۆ زەوتکردنی سامانی خەڵکی و شارەزایە لەفێڵ و ورووژاندن و هەڕەشە......کەمترین وەسف بۆی ئەوەیە بڵێی پیاوێکی نەگریسە)(۹٤). سەرەڕای هەڵوێستی دوژمنکارانەی ئینگلیز بەرانبەر شێخ سەعید بەڵام هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر دەستێوەردانی ئەوان لەو قەسابخانەیە بەڵکو هەمووی ئاماژە بۆ دەستێوەردانی بەرپرسانی حکومی دەکەن، ئەو ئەگەرەی لازاریف باسی دەکات ناگونجێ لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیایەك کەپشتیوانی لەگەڵ عروبەی وڵاتی شام و عێراق دەکرد.

شەهیدبوونی شێخ سەعید کوردی بەشەکانی هەموو کوردستانی تووڕەکرد، شێخێکی تەمەن هەشتا ساڵ بەو بێویژدانیە کە کورد بەپیرۆزترین پیاوی ناو دەوڵەتی عوسمانی دانابوو هەستی هەموو کوردانی دژی دەوڵەت و بەتایبەتی دژی موسڵاویەکان بزواند. هۆزی هەمەوەندی

دۆستی شێخ سەعید شۆڕشیان بەرپاکردو چەکدارەکانی هەمەوەند بەتەواوی گەمارۆی مەرکەزە حکومیەکانی سلێمانیان دا، لەکەرکوکیش هۆزە کوردیەکان کۆبوونەوەو رێکەوتن لەسەر نەخشەی پێکهێنانی هێزی عەشایەری و هێرش کردنە سەر موسڵ و تۆڵەسەندنەوەی شەهیدی کورد (شێخ سەعید). رێگەی نێوان کەرکوك و سلێمانی گیراو ژیانی سەربازو کاربەدەستانی حکومی کەوتە مەترسیەوە. والی موسڵ خێرا بروسکەیەکی بۆ موتەسەڕیفی سلێمانی کرد کە خێرا شار بەجێبهێڵێ و بێت بۆ کەرکوك، هەروەها موتەسەڕیفی کەرکوکیش بروسکەیەکی بۆ والی کردو وتی ئەگەر شێخ مەحمودی کوڕی شێخ سەعید بەسەلامەتی خێرا نەگاتەوە کەرکوك ئەوە ژیانی موسلاویەکانی ئێرە دەکەوێتە مەترسیەوە[٩٥]. ئیدارەی ئیتحادیەکان بەتەواوی لەکوردستان کەوتبوە مەترسیەوەو سەربازەکانی حکومەت لەلیوای سلێمانی چەکەکانیان فڕێ دەداو هەوڵیان دەدا بگەنە کەرکوك. لەراپۆرتی قونسوڵی بەریتانیدا هاتووە کە ئیدارەی بەریتانی لەکوردستان تووشی هەرەسێکی لەناکاو هاتووە چونکە زۆربەی سەربازەکانی لیوای سلێمانی و کەرکوك و بەڕیوەبەری قەزاو ناحیەکان لەژێر نفوزی شێخ سەعید دان، هەروەها قونسوڵ دەڵێ : (ئەگەر نا چۆن هێزێکی ٤٠٠٠ کەسی ناتوانێ بەرگری هێزێکی بچوکی ٤٠٠ کەسی هەمەوەندان بکات)[٩٦]. حکومەت خێرا کەوتنە دانانی ریوشوێنی یەکلاکەرەوە، بۆئەو مەبەستە خۆی لەبەرپرسیاریەتی کارەساتی موسڵ دوورخستەوەو رایگەیاند کە لەئاکامی هەڵسوکەوتی ئیستیفزازی لایەنگرانی شێخ سەعیدەوە بووە، هێزەکانی لەشکری چوارو شەشی عوسمانی خرانە حالەتی ئامادەیی. هەروەها زەکی پاشا لەجیاتی رەشید پاشا وەکو والی دانراو والی تازە هاوەڵیەتی شێخ مەحمودی کرد بۆ سلێمانی و کەرکوك کە لەکاتی کارەساتەکە لەماڵی یەك لەبەرپرسە کوردیەکانی حکومەت لەموسڵ

پارێزرابوو، لەگەڵ گەیشتنەوەی وەفدی سادات ئەوانەی لەقەسابخانەکەی موسڵ رزگاریان ببوو بۆ سلێمانی پێشوازیەکی گەرم کران، هەتا تاڵەبانیەکانی دوژمنی تەقلیدی سەیدەکان دەماری کوردایەتیان بزووت و لەماڵەوە بەخێرهاتنەوەی سەیدەکانیان کرد، والی لەسلێمانی کەوتە چالاکی لەگەڵ سەیدەکان بەبەستنی کوبونەوەی گەورەی جەماوەری بۆ سەیدەکان و پیاوماقوڵانی شار بێجگە لەدوژمنەکانی شێخ سەعید کەنەهاتن ئەوانی‌تر هەموو ئامادەبوون. هەروەها والی تازە موتەسەرپیف و زۆربەی بەرپرسە گەورەکانی سلێمانی لەوێ گواستەوە. هاتنی والی بۆ سلێمانی و بەڵێن دان بەسزادانی ئەوانەی دەستیان لەو کارەساتەدا هەبووە وەکو پۆزش هێنانەوەی رەسمی بووە بۆ سەیدەکان، بەمەش ناحەزەکانی ئەمان لەسلێمانی نیگەران بوون(٩٧). هەروەها ئەو مەرگەساتە زەمینەسازی بوو بۆ شێخ مەحمود وەکو سەرکردەیەکی کوردستانی باشوور بەدیار بکەوێ. ئەو بەتەنگەوە هاتنەی ئیتحادیەکان بەرانبەر رووداوەکانی کوردستان لەنەقڵ کردنی موتەسەرپیف و گرتن و دادگایی کردنی تاوانبارانی ئەو مەرگەساتەی موسڵ نیشانەی نیەت باشی ئەوان نیە لەبەرانبەر سەیدەکان یان کورد بەڵکو لەشەعبیەتی بەرچاوی سەیدەکان تێگەیشتبوون و پێویستیان بەهێورکردنەوەی ئەو بارودۆخە هەبووە کەدەسەڵاتی ئەوانی شلۆق کردبوو، دوایی هەر ئەوان بڕیارەکانی دادگای موسڵیان خستەلاوە، ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر قسەکەمان .

بەکورتی شەهیدکردنی شێخ سەعیدی حەفید وەکو شەهیدکردنی ئیبراهیم پاشای میللی لاپەڕەیەکی بەرەنگاری خویناوی کوردی ئارەزوومەند بووە بۆ پارێزگاری لە سەربەخۆیی محەلی بەرانبەر ویستی ئیتحادیەکان کەسووربوون لەسەر سەپاندنی ئیدارەی مەرکەزی.

# بەڵگەنامەکان

## بەڵگەنامەی ژمارە (١)، Y.MTV . 112/ 31

لە بروسکەیەکی مەحمود پاشای جاف دا بەنوسراوی ٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی١٣١٠\ ١٨٩٣ز دا هاتووە: هەندێ گەورە پیاوی خراپ بڕوبیانوو دەدۆزنەوە بۆ خراپەکانیان، ئەگەر داوام لێبکەن بەدرێژی دەیخەمە بەردەستان . بۆ مەبەستی هەقیقەتی ئەو حالەتە نوسراوێکم نووسی و بەبروسکە لەبەرواری ١ی کانونی ساڵی ١٣١٠ك ناردمو باس لەهۆی ناکۆکی و رکەبەری بەردەوامی نێوان شێخەکانی سلێمانی و شێخ سەعیدو نەقیبی برای دەکات، کە داوای یارمەتیان لەئەو کردووە لەگەڵ هەندێ هەرەشە، ئەو کارە خراپانەی ئەوان دەیکەن پەشێوی لەناو هۆزەکاندا بڵاوکردۆتەوەو بۆتە هۆی گەرەلاوژە لەئیدارەی لیوا. لەوڵامی ولایەتو هەردوو بووسکەی ناوبراو دەردەکەوێ پاشای ناوبراو هەوڵبدات لایەنگر بۆخۆی دابین بکاتو سکاڵا لەدژی عوسمان پاشای برای کۆبکاتەوە کە قایمقامی گوڵعەنبەرە، ئەم دەیەوێت لەسەر کاری لاببات و بۆخۆی بچێتە شوێنی و بەسەرۆك هوزیش بمێنێتەوە، کار وا بڕوات بارودۆخەکە دەگۆڕێت بۆمەسەلەیەکی سیاسی و چارەسەر ناکرێت، بۆیە من وای دەبینم گرژی لە ولایەتەکە نەهێڵین و ئەو لەولایەتی موسڵ دوور بخەینەوە هەتا کاری جەرگبڕانە روو نەدات، لەیەکێك لەولایەتەکانی بەغدا بیکەین بەقایمقام . فەرمانی دوایی هەر چۆنێك بێت هی گەورەمان وەلی عەهدی هەموو لایەکە.

٥ی شەعبانی ساڵی ٣١٢ (٣١-٠١-١٨٩٥)و ١٨کانونی دووەمی ساڵی ٣١٠

یاوەران بەڕێز حەزرەتی مەولانا سوڵتان دەرێش

==================================

## بەڵگەنامەی ژمارە(٢) Y.MTV. 11l\31

**بۆحـــــــــەزرەتی دەرویش پاشا یاوەری بەڕێز مەولانا سوڵتان ج ٧ کانونی یەکەمی ساڵی ٣١٠**

**مەبەستم لەهەردوو برسکەی پیشوو بۆ دەربڕینی ئامادەیی بوو لەگەڵ براو کوڕو هۆزەکەم لەخەرجکردنی هەموو توانام بۆ ڕێزی سوڵتان، ئەوە پێنج ساڵە خۆمو بابو باپیرم پابەندین بەخزمەتکردن لەسنووری دەوڵەتی عیللی عوسمانی، ئەمە هەتا هەتایەیە. بەڵام شێخ سەعیدو نەقیبی برای داوایان لەمن کردووە یارمەتیان بدەم لەو ململانێیو ئاژاوەی ئیوە لێی ئاگادارن لەنێوان شێخەکانی سلێمانی، شێخ وا دادەنێ یارمەتی بدەم هەتا ئەگەر چارەگران بم لەلای پایەی باڵا ئەوکات داوای لێبوردنم بۆ بکات لەلای سوڵتان ، ئەگەر یارمەتیشی نەدەم ئەوە هەوڵبدات عەریزە بداتە مابینی هەمایونی بۆ ئەوەی من دووربخەنەوە، هەروەها هەڕەشەی کۆکردنەوەی نووسینی عەریزەی خەڵکی تریشم لێدەکات، لەکۆنەوە ئەو شێخانە پێویستیان بەسۆزی بابو باپیرانی من بووە. پەروەردەو مەنسووبەکانی ئەوانە بەخۆیانو خزمانیانەوە لەسەد خێزان زیاتر نینو لەئاست ئیرادەی سونیدا هیچیان لەباردا نیە. سەرەڕای بەردەووامیان لەسەر ئاژاوەگێڕی ئێستا سەغڵەتنو بیردەکەنەوە داوای پاسەوان بکەن. ئەوانیش لەسەر ئاژاوەگێڕیو گەندەڵی هەربەردەوام دەبنو دەیانەوێ تابوورێکیش سەرباز بەخۆیانەوە سەرقاڵ بکەنو ئاراستەی ڕەزامەندی هەندێ کەسیش لەبەرانبەر گەورەیتان بگۆڕن. لەوکاتەی لە(دارالسعادە) بەهۆی خزمێکی سوڵتان بەناوی ئەمین بەگ بەئامادەبوونی پاشاو کاتبی یەکەم ئەو بابەتەم خستەبەردەم بەڕێز مەقامی خەلافەت، خراپی باری عێراق ڕۆشنە لەلای**

هـەموو ئـەو بەرپرسـانەی سـەردانی ناوچـەکەیان کـردووە، بۆکۆسـپی ئاژاوەگێڕی‌و گەندەڵی قسەم لەگەڵ ئەو هۆزانە کردووە کە ئەو هانیداون‌و بوونەتە هـۆی خراپـی بـاری گشـتی ئیـداری لیـوا. زۆر شـت هەیە پێویستی بەڕوونکردنـەوە هەیـە‌و نـاتوانم بـەهۆی نـەبوونی کلیلـی جـوفرەوە روونـی بکەمـەوە، هـەروەکو دواکـەوتنی بروسـکە بـەهۆی ئـەوەوە بـووە. تکایـە ئاگاداربن .

١ی کانوونی دووەمی ساڵی ٣١٠ (١٣ی کانوونی دووەمی ١٨٩٥)

سەرۆك مەحمود جاف

Za.1311\101. 16 Irade –Hususi (٣) بەڵگەنامەی ژمارە

کۆشکی یەلدزی هەمایونی ـــ سەرۆکایەتی بەریوەبەری نوسین.

ئەو داواکاریەی هەیە لەسەر بواردنی ئەو زاویە پیرۆزەی شێخ سەعید ئەفەندی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ شەرپەرشتی دەکات لەباجی میرانەو ئیملاك‌و زەوی‌و مەڕو میرانە. خوالێخۆش بوو کاك ئەحمەدی شێخ لەسەیدە بەڕێزەکانەو لەژیانی‌دا هەنگاوی ناوە بۆ بڵاوکردنەوەی زانست‌و پیرۆزی تەریقەت‌و هەوڵی‌داوە ببێتە بەربەست لەبەردەم پەرەسەندنی مەزهەبی شیعە لەهەموو لایەکی وڵاتەکەی، خزمەتێکی بەرچاوی بەمەملەکەت‌و دەوڵەت کردووە. شێخ سەعیدی کوڕیشی لەسەر ڕێڕەوەی باوکی هەوڵی راکێشانی بانگەوازی خێرە بۆ حەزرەتی مەولانا سوڵتانی خاوەن مەجدو شکۆ. ئەو پیاوە بەڵێنی داوە بەبڵاوکردنەوەی زانست‌و فێرکردنی ئەحکامی دینی رۆشن بۆبەربەستکردنی مەزهەبی شیعە هەموو توانای خۆی بخاتەگەڕ. حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەت بەگونجاوی دەبینێ لەگەڵ ئەو خانەوادەیەو ئەو زاویەیە بەلوتف‌و سۆزەوە بجوڵێنەوە بەڵام ئەوە تێکەڵ نەکەین لەگەڵ ئستغلالکردن. لێدوان‌و روونکردنەوە هەیە لەسەر ئەندازەی ساڵانەی باجی ئیملاك‌و تاپۆو مەڕو میرانەی پەیوەست بەشێخ سەعید ئەفەندی‌و براکانی‌و ئەو زاویە پیرۆزەی کەدەکاتە بیست‌و هەشت هەزارو پێنج سەد قورش. بەخواستی ئیرادەی سوونی حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەت کە لەو بارەیەوە هاتووە ئەنجونەنی وەکلای تایبەت بەو بابەتە هانداوەو ئاکامی خستنەڕووی ئەمە بۆگلەینامەی باڵا مەحزەرەتی ناوبراویان ناردووە بۆ موقامی سەدارەتی باڵا. ئەمەش بەفەرمانی خاوەن فەرمان .

٢٨دولقعدەی ساڵی ١٣١١ك/ ٣حوزەیرانی ١٨٩٤ز سەرۆکی

بەرێوەبەرایەتی نووسین سوەییا.

---

## بەڵگەنامەی ژمارە (٤) 1323. 16 Irade – Husui
### کۆشکی یەلدزی هەمایونی ـ سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری نوسین.

بیرخەرەوەی تایبەتی بۆ مەقامی سەدارە بەمێژووی ٧ سەفەری ساڵی ١٣٢٣ (١٢نیسانی ١٨٩٤ان) بەرزکراوەتەوە لەسەر بروسکەیەك کەلەموسڵەوە هاتووە لەسەر زەروورەتی هێنانی شێخ سەعید ئەفەندی سلێمانیو کوڕەکەی بۆ (دار السعادە)و دوورخستنەوەی ژمارەیەك لەشێخەکان لەسلێمانی بەهۆی پەنابردنی ئەوان بۆهۆزەکانی سلێمانیو کەرکوك بۆ هێرش کردنە سەر هەمەوەندەکان بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوە. ئەوەی گومانی تیا نیە رووداوەکان بەهۆی گەندەڵی ئیداری کاربەدەستانی محەلیەوەیە، گوێرایەڵی شێخ سەعیدو راستگۆیی داوامان لێدەکات بایەخ بەزامنکردنی چاوەدێریو زیادکردنی خۆشەویستی خەڵکیو مسوڵمانانی ناوچەکە بدرێ. ویستی ئیرادەی سوونی حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەت هەندێك راسپاردە بۆولایەت دەردەکات بۆ دیاریکردنی ئەوانەی داواکراوە بگۆڕێن لەموتەسەڕیفو والی فەرمان بۆحەزرەتی وەلی ئەمر.

١٩سەفەری ١٣٢٣(٢٤نیسانی ١٩٠٥) سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی نوسین

## بەڵگەنامەی ژمارە( ٥) MV.84.35

مەحزەرەی تایبەت بەکۆبوونەوەی ئەنجومەنی راسپێردراو(الوكلاء) لەبەرواری ٢٤ شەوالی ساڵی٣١١( ٢٠نیسانی ١٨٩٥ز) بەکورتی: ئەنجومەن هەڵگیرا بەنووسینی بیرخەرەوەیەکی فەرماندەی سوپا بەمێژووی ١٤ی شەوالی ساڵی ٣١٢ بەهاوپێچی بروسکەیەکی موشیریەی هەمایونی شەشەم لەسەر ئەوەی فەرماندەی موسڵ لەولایەت بایەخ بەچاککردنی نەوەکانی مەرحوم کاك ئەحمەدی شێخ نادات. بەلای زۆردار دای شکاندووەو مامەڵەی خراپی موفتی پێشوو بۆتە هۆی هەڵگرتنی چەك لەلایەن خەڵکانێکی زۆرەوە بەدرێژایی سنووری سلێمانی، هەروەها بۆتە هۆی دەستێوەردانی خێڵە ئێرانیە سونیەکان، ئەمەش زیانی سیاسی لێدەکەوێتەوە. ئەوەمان لەگەڵ بروسکەی رۆژی ٢٤ی ئازاری ساڵی ٣١١ گرێداوە کەئیمزای سەیدحەسەن و سەیدەکانی بەرزنجی لەسلێمانی پێوەیە ئیفادەیان لەسەر بابەتی ئەو بڕیارە داوە.

ئەگەر هەوڵ بدرایە بۆ پێکهێنانەوەو نەهێشتنی ناکۆکی نێوان سەیدەکانی سلێمانی کەئەمە خواستی ئاینی سونی مەزهەب و خاوەن مەقامی خەلافەتە، ئەوە تەبلیغاتی یەك لەدوای یەکی سلێمانی نەدەگەیشتە ولایەتی موسڵ. هەندێکیان هەندێ جار گەیشتنە ولایەتی موسڵ و ئاشتکرانەوە، بەڵام بەپێی قسەکانی فەرماندەی موسڵ کەباسمان کرد دیارە هێشتا خەڵکێکی زۆر بەدرێژایی سنووری سلێمانی چەکیان هەڵگرتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ هێشتا ناکۆکیەکە کۆتایی پێنەهاتووە، بروسکە گەیشتووەکانی سلێمانیش پشتگیری قسەکەمانن. بەهۆی بەردەوام بوونی ناکۆکیەکان و باش نەبوونی نێوانیان ئەنجومەن بەزەرووری دەزانێ ئاگاداری ولایەتی موسڵ بکاتەوەو کاری تێبکات رێوشوێنی کارامە لەو بارەیەوە بگرێتە بەر بۆ بنبڕکردنی ناکۆکی و رێگەگرتن لەکارەسات کە جێی رەزامەندی پایەبڵندانە.

ئیمزاکانی بەڵگەنامە

**بەڵگەنامەی ژمارە (٧) Lef 3 رووی یەکەمی لاپەڕە .**

شێخ سەعید کوڕی کاك ئەحمەدی سلێمانی سەرۆکی سەیدەکانی ئەو ناوچەیە بەهۆی ئەو پەیوەستە بیروباوەڕەی لەخوالێ خۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخەوە بۆی ماوەتەوە خۆی بەسەرۆکی هۆزی جاف و هۆزەکانیتر دەزانێ بەهۆی ئەو میراتەی لەزەمانی کاکە ئەحمەدە ئەفەندی بۆیان ماوەتەوە، لەوکاتەی پێویستی بەهۆزەکانی دەوروبەری سلێمانی دەبێت پەنا دەباتە بەر حکومەتی سوونیو پڕووپاگەندە لەناو ئەو هۆزانە بلاودەکاتەوە کە لەژێر گوێڕایەڵی ئەو دانین وەکو هۆزی هەمەوەندو ئەوانیتر، ساداتەکانی دانیشتووی سلێمانیو هۆزەکانی دەورووبەریو ئەو هۆزانەی ناومان بردن ئەگەر چەکدار بکرێن هێزێکی بایی هەڵگەڕانەوەیان لێپێك دێت. هەموو فەرماندەو موتەسەڕیفو فەرمانبەرانی هاتوونەتە سلێمانی عەریزەی ئەویان قبوڵ نەکردووەو بەناشەرعیان زانیوە، ئەو کارانە زیان بەخەزێنەی دەوڵەت دەگەیەنێو تێك دەگیرێ لەکەڵ یاساو سیستەمو بنەماکانو بوختانو تەزویراتنو هیچ ئەسڵێکیان نیە، خەڵکی ژێر فەرمانی خۆیو شەریكو بەشەکانی خۆی وا لێدەکات سامانی حکومەت تالان بکەنو دەست بەسەر موڵکی گشتییدا بگرن، دەتوانێ لەلای موقامی بالا فێڵ بکاتو هەوڵی لابردنو دوورخستنەوەی خەڵکی بدات، بەمەش وایکردووە هەموو لێی بترسنو ناچاریان بکات بەرەزامەندی ئەو بجوڵێنەوە. لەراگەیاندنی حکومەتی تازە دەتوانێ هەرچی مەبەستی بێت بەدەستی بهێنێت، بەڵکو لەحکومەتی رابردووش حاکمی بێمونافیس بوو، هەروەها شێخ توانیبووی سۆزو شەفەقەتی حەزرەتی مەلانا سوڵتان سێبەری خوا لەسەر زەویو خەلیفەو مسوڵمانانو عوسمانیەکان بەتایبەتی

بەدەست بهێنێ، موچەیەکی مانگانەی بۆ ببڕننەوە، بەنزیکەی چل هەزار قورش، ئەمە سەرەڕای بە سوود وەرگرتن لەنفوزەکەی دۆستانی خۆی بەکاربەدەست دامەزراندووە، جگە لەوە بەئەندازەی حەوت یان هەشت لەو موچەیە داهاتیان لێوەردەگریێو بەشێکی زۆر کەم نەبێت نایگەڕێنێتەوە بۆ خەزێنە. هەروەها لەباجی مەڕو ئیدارەی سەربازیو شتیتر بوێردراوە لەگەڵ خەرجیە پێویستەکان، هەتا لەزەمانی دەیەکیش وامامەڵەی لەگەڵ کراوە کەلیوای سلێمانی تووشی هەژاریو موحتاجی ببوو. دووەم کاتێك حکومەت پەنا دەباتەبەر سەرکۆنەی ئەوانەی ناکۆکن لەنێوان خۆیاندا نابێت ئەو دەستی یارمەتیو دەسەڵاتیان بۆ درێژ بکات. ئەو کات تاوانباران لەدەستی زەبتو دادگەری دەردەچن، ئەو سیاسیانە مامەڵە دەکاتو بکوژان دەپارێزێ، ئەوجا حکومەت دەستەوستان دەوەستێت بەرانبەر بیرخەرەوەو هەزاران شاهید، ئەوکات سامو هەیبەتی حکومەت نامێنێو سامو هەیبەتی ئەو زیاد دەکات ، لێرەدا شێخی ناوبراو سەردەکەوێ لەقەناعەتی خەڵکی لەتاوانبارکردنو بوختان بۆهەڵبەستن بەشایەدی بەدرۆ بۆ ئەو کاربەدەستە مەدەنیو سەربازیانە . ئەوانە بەڕیگەی حکومەتەوە سەرشۆڕ دەکەنو لەلایەکی ترەوە لەدەستی حکومەت رزگاریان دەکات هەتا ئەگەر گەورەترین شۆڕشیان کردبێت ئیتر ووردە ووردە پەیوەندی مەعنەوی خەڵکی پێوەی چەند هێندانە بەهێز دەبێت، هەتا خەڵکی رەشو رووت داننانێن بەگوێڕایەڵی بۆ حکومەتو لەترسان دەبنە کۆیلەی شێخ . شێخی ناوبراو لەکاتی نەفیکردنی هەمەوەند هەندێ زەوی بێتاپۆی لەحکومەت کڕیوە، کاتێ هەمەوەندەکان لەدەست بەسەری هەڵاتنو گەڕانەوە سەر زەویەکانی خۆیانو کەوتنەوە کشتوکاڵ کردن، بەهۆی ئەو زیانانەوە بیری لەهەندێ بوختان کردەوە لەسەریان، هەر لەو ماوەیەدا زوڵمێکیتری لێبەدیارکەوت،

ئــەویش بەکوشــتنی ســەید نــوری ســەید حەســەنی کانیکــەوالی، ئــەوان خوێنەکەیان داوا دەکردوکار گەیشتە لای مقامی حەزرەتی سوڵتان، بەجدی مەفرەزەیــەك ســازدراو کەوتنــە دووی گــرتنی زۆراب و هیدایــەت لــەتیرەی ســــەفەرەوەندی ســــەر بــــەهۆزی هەمەوەنــــد، بــــەڵام ئــــەو بەڵێنانــــەی بەشــوێنکەوتووانی داوە کەســەر بەرەچــەڵەکی ســەیدانن و لەسایەی ئــەودان لەلای خەڵکی سلێمانی ناسراون بەدزیو هەمووجۆرەکانی بەدڕەوشتی هەتا هەنــدێکیان بەســووكو ناتــەواو ناســراون، لــەهۆزەکانی جــافو روغزایــیو هــەولێداوە بەســامانو دەســەڵاتو چــەكو تەقەمــەنیو ئــەو ماڵــە تالانیــەی لــەکاتی شــەڕدا دەســتیان کــەوتووە بەئــەوە توانیویانــە هــەڵیان بخەڵــەتێننو نزیکــەی هــەزار ســوارەو پیــادە کۆبکەنــەوەو بەســەرۆکایەتی شــێخ مــەحمود بینێــرن بۆ گونــدی داریکــەلی، کە چــوار تــا پێــنج ســەعاتەڕێ لەسلێمانیەوە دوورە. هــەروەها لــەو گونــدەوە دووســەد کەســی لــەو هێــزەی شــێخ ســەعیدی بەڕیوەبەری قەرەداغ کــۆی کردبــۆوە کەیــەکێك بــووە لەخزمــەکانیانو لــەلیوای سلێمانی بەزاڵم ناسراوە، وا بەدیاردەکەوێ سوورن لەسەر هێرشکردنە سەر هەمەوەند بۆسوتاندنی گوندەکانیان . زوو پەیوەندیمان کرد بەموتەسەڕیفی ســلێمانیەوە بابەتەکــەمان خســتەڕووو بروســکەیەکمان لــەو بــارەوە کــرد، ئامــادەیی وەرگــیراو بــەرەو ئــەو داوایــە پاڵیــان نــا ، بــەڵام ئامۆژگــاری ئــەو مــەفرەزە ســەربازیەی لەچەمچــەماڵەوە رەوانــەی گونــدی داریکــەلی کرابــوو بەســەرۆکایەتی بەگباشــی مســتەفا ئەفەنــدی بــۆ لای شــێخ مــەحمود ئەفەنــدی شایستەی وەرگرتن نەبوو چونکە ئەو مەفرەزەیە نەیتوانیوە بەزەبری هێــز کــاری وا ئــەنجام بــدات، لــەکاتی گەڕانــەوەی ئــەو مەفرەزەیــە بــۆ چەمچــەماڵ بەهۆی زیــادبوونی ژمــارەو ئــەو تۆپــەی لەوێ بووە لەگــەڵ ژمارەیــەکی کــەمی هەمەوەندان لەگونــدی بەگــەجانی تێکگیرانو شــێخ نــەجمەدینی بــرای ســەید

نوری کوژا کەبرایەکەشی پێشتر کوژرا بوو، بەگباشی مستەفا ئەفەندی لەکاتی گەڕانەوەی لەچەمچەماڵ لێکی جیاکردنەوەو پێکدادانەکەی وەستاند، کاتێ بینی شێخ سەعیدی سلێمانی بەو ئاگاداریانە وازناهێنێ و هێز کۆدەکاتەوە ئەمیش ناچارە هێز بەکاربهێنێ، بەبروسکەیەکی رۆژی ٧ی ئازاری ساڵی ٣٢١ کە ناردم بۆ دەرازەی باڵا ولایەتی پایە بڵندم ئاگادارکردەوە بەوەی بۆ هێنانە ژێر باری گوێڕایەڵی چار نیە بێجگە لەبەکارهێنانی هێز، مقامی سەدارەتی باڵاش ئاگادارە بەناوەڕۆکی ئەو بروسکەیە، ئەگەر ئەمە ناگونجێ لەگەڵ رەزامەندی ئێوەو بەکارهێنانی چەك لەدەرەوەی دەسەڵاتی ئەوە، من ولایەتی پایەبڵندم ئاگادارکردەوە کەبەگتاشی مستەفا بەگم لەچەمچەماڵ گەڕاندەوە، ئەمە گونجاو بووە لەگەڵ رەزامەندی باڵا و ئێمەش رینومایی حەکیمانەی ئەو هێزانەمان کرد کەپابەندن، ئەوە بەباشی بەرژەوندی دینێتە دیو ئەمن و ئاسایش زامن دەکات.

لەلایەکیی ترەوە بەفەرمانی حەزرەتی مەولانا سوڵتان سێبەری خوا لەسەر زەوی ، بەویستی سوڵتانی لەلایەن سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری هەمایونی لەبەرواری ١٧ی ئایاری ٣٢١ئاگادارم کردەوە کەدەرفەت نەدرێ خوێنی مسوڵمانان برێژێ لەگەڵ داوای بەخێرایی بڵاوکردنەوەی ئەو قەڵەباڵغیە، شێخی ناوبراو لەوە ئاگادارە، بەزمانێکی گونجاو تێگەیەنراوە کەکارکردن بەئەمە نیشانەی دڵسۆزی و گوێڕایەڵیە، بەڵام ناوبراو بەپێچەوانەوە هێزەکانی بڵاوە پێنەکردو بەڵکو لەهەوڵی زیادکردنی هێزی تری دابوو لەهۆزەکانی پشدەرو شوان و هۆزەکانی شێخ بزێنی بەڵام خوا دەستی نەدا. پێمان وابوو بەو هێزەی کۆی کردۆتەوە دەتوانێ بەسەر هەمەوەند زاڵ بێت یان هەموویان بەچەکەوە بگرێ . لەدووەم رۆژی

ئاگادارکردنەوەکەی کەراستەوخۆ بەئیرادەی سوڵتانی ئاگاداری درایە بەڵام ئەم لەداریکەڵییەوە هێرشی کردە هەشت گوندی هەمەوەند وەکو سورتکە، ئەڵلایی ، بازیان، سەروچاوە، تەکیە، کلاشکەران، جولومەك، ئەحمەدە رەش. وەکو حەیوان هەموو کشتوکاڵی ئەو گوندانەیان کوێرکردەوەو زیانی زۆری لێداون، کاتێك ئەوانە رێگەی بازیانیان گرت هەمەوەند ناچار بوون لەگوندی بیربادی و موزەفەری نزیك قەزای بازیان پەنابەرن بۆ ئەو هێزە سەربازیەی ناو قەزایەکە، موتەسەڕیفیەتی سلێمانی و فەرماندەکانی لەڕێگەی فەرماندەی بازیان میر ئالای تۆفیق بەگ لەسەر ئامادەیی بۆ قبوڵکردنی داواکاریەکانی سەیدەکان و شێخی ناوبراومان ئاگادارکردەوە بەڵام وەکو لەوڵامی پێشووتر روونکراوەتەوە ئەو رازی نەبووە، بەوەندەش وازی نەهێنا بەڵکو لێکدانەوەی سەیرو سەمەرەی بۆ قەدەغەکردنی سەربازی سوڵتانی کردووەو بەجۆرەها بوختان و تەزویر کەسایەتی میرئالای لەکەدار کردووە. ئەو رۆژی بیست و پێنجی ئازار خۆی ئامادە دەکرد بۆ هێرشکردنە سەرچەمچەماڵ. لەو کاتەدا نزیکەی چل کەسی هەمەوەند بۆ بەرەنگاری سوارەکانی هۆزی روغزایی و گەلاڵی دەچوون لەو شەڕەدا سەرۆکی روغزائی دەکوژی و هەندێك بریندار دەبن، ئەوانە ناچاردەبن بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان و پچنە لای سەیدەکان، هێزەکە تەقەی چڕیان کردە سەر هەمەوەند بەڵام ئەو چل هەمەوەندە بەهۆی کارامەیی لەشەڕو باش ئاگادار بوونیان لەخاکی ناوچەکەیان کەشوێن و زێدی خویانە بەرەو رووی ئەو هێرشە نامەشروعە بوونەوەو توانیان بەرەنگاریان ببنەوو هێرشکارانیان پەرت و بڵاوکرد، هەر لەو ماوەیەدا پاشماوەی هێزی هەمەوەند لەهەردوو گوندی بیربادی و موزەفەر کەژمارەیان دووسەدو پەنجا کەس بووە بەرەو شەڕگەکە هاتن، کەبینیان ئەوانە دێن

هەتا سەنگەری قایمیان پێبەجێشتن، ترس و تۆقاندنی ئەو هەمەوەندانە کەژمارەیان لەسێسەد کەس زیاتر نەدەبوو چووبووە دڵیانەوە، گەڕانەوە بۆ گوندی داریکەلی، هێزی هەمەوەند بەدوایانەوە بوو هەندێکیان لەوێ و بەشەکەی‌تر لەشوێنی خۆی لەگەڵیاندا کەوتنە شەڕ. تێکشکانی ئەوان لەلایەن ئەو هێزەی هەمەوەند کە بەکەمتر لەیەك لەسەر پێنج دادەنرێ ئەمە بەهۆی بێڕێزی شێخ سەعید ئەفەندی لەبەها دانەنان بۆ ئیرادەی سوڵتانی و بڵاوە پێ نەکردنی هێزەکەیی و پێچەوانە جولانەوە لەگەڵ ڕەزامەندی پایە بڵند تووشی ئەمە بووە. بێگومان ئەمە کەرامەتی حەزرەتی مەولانەمان سوڵتانە. کاتێك شێخی ناوبراو جاف و هەموو هۆزەکانی‌تری لەسلێمانی لەبەرانبەر کۆشکەکەی خۆی بینی و لەدوای ڕوو وەرگێڕانی لەهەمەوەند، گوێی لەو هۆزانە بوو کەگلەییان لەچەك هەیە بەلام سەیدەکان بۆ فریاکەوتنی ئەوان هیچیان نەکرد، ناردنی بۆ شەڕ هەتا هیچیان پێ‌نەمێنێ. هەست بەپەشیمانی دەکات کەگوێی بەویستی سوڵتانی نەداوە لەلایەکی‌ترەوە کەسایەتی و پایەی لای خەڵك نەماوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕایگەیاندووە بەو هێزەی بەسەر هێزە هێرشبەرەکاندا سەکەوتووە و ئیرادەی سوڵتانی بەجێهێناوە بەلام ئەو لوتی شکاوە و بەخراپی تێکشکاوە کەچی هەر زوو کەوتە خستنەڕووی درۆ و ناڕاستی، داوای کردووە هێزی سەربازی بۆ بنێرن بۆ پاراستنی داچێنراوەکانی داریکەلی کە ناوەندی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە هێرشبەرەکانی ساداتە کەبوونەتە خاوەنی ئەوێ و گوندەکانی دەوروبەری بەپێی تاپۆ، ئەمەش بۆ ئەوەی هەمەوەند نەیسوتێنێت و خراپی نەکات، فەرماندەی بازیان و قایمقامی ئەوێ بۆیان دەرکەوتووە هەمەوەند زات ناکەن تۆڵە لەشێخ خۆی بکەنەوە بەلام بەپێی ئەو زانیاریانەی پێمان گەیشتووە داوا لەحکومەت دەکەن نەهێڵێ شێخ

زوڵمیان لێبکات بەڵام فەرماندەی فیرقە وڵامی بروسکەی داونەتەوە کە ئەو جۆرە شاڵاوە سەربازیانە مەترسی نیەو هێزی پاسەوانی پێنەدان کەداوایان کردبوو، لەگەڵ ئەوەش شێخ مەحمودی کوڕی‌و شێخ سەعیدو بەڕێوەبەری قەرەداغ لەگەڵ سەد کەسێك لەو شوێنە ماونەتەوە، لەو بارودۆخەی پێشتر باسمان کرد دەردەکەوێ کەپڕوپاگەندە لای بەڕێوەبەرایەتیە باڵاکان هەیە کەشێخ بەهۆی هێزی شێخایەتی خۆیەوە دەتوانێ خەڵك بەشێوەیەکی گشتی لەهۆزە جیاجیاکانی لیوای سلێمانی کۆبکاتەوەو چی بوێ پێیان بکات‌و هەرکارێکی مەبەستی بێت بەدەستی بهێنێت، بوختان‌و تاوان دروست دەکات‌و کاربەدەستە سەربازی‌و مەدەنیەکان ئاراستە دەکات، نمونەی وا زۆر هەیە بەگشتی ترس‌و بیمی لەناو خەڵکی سلێمانی بڵاوکردۆتەوەو ناوێرن لەفەرمانی دەرچن. هەروەکو تێڕوانینی گەورەمان سوڵتانە کە ئەمە لەئەهلی گوێڕایەڵی‌و ساغبوونەوەیەو دەبێت پایەو گۆشەی شەریفی هەبێت. لیرەش دەتوانێ زیاتر زوڵم بکات‌و خواستە شەخسیەکانی بەدەست بهێنێت. لەهەمان کاتدا پێچەوانەی ڕەزامەندی پایەدارو یاسا تاوانی گەورەی ئەنجام داوە، وەکو چەکدارکردنی بەشێکی خەڵکەکەو بەگژابردنی ئەوانی‌تر، ئەوانە فیری کوشتن‌و سوتاندنی ماڵ‌و سامانی خەڵك‌و وێرانکردن‌و دزی‌و زەوتکردن دەکات، ئەمەش پێچەوانەی گوێڕایەڵی گەورەمان خاوەن تاج‌و سوڵتانە. لەواقیعدا بەناڕەحەتی نەبێت ئەو ناتوانی هەزار پیاو کۆبکاتەوە. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ بەجۆرێ لەکەس شاراوە نیە ئەو هێزەی نیە وەکو بانگەشەی بۆدەکات شەرمەزارەو تووشی تێك شکان بووە، پوختەی قسان ئەوەیە ئەو بارودۆخەی خستمانەڕوو زیان بەدارایی لیوای سلێمانی‌و زەبتکردنی دەگەیەنێ‌و ڕێگە لەخەڵك دەگرێ گوێڕایەڵی حکومەت بکەن‌و قبوڵی

فـــەرمانی لێپرســـینەوە بکـــەن، لەڕاســـتیدا راســـتگۆیی وەفاداریمـــان و گوێڕایەڵیمان بۆ حەزرەتی مـەولانا سوڵتان وامان لیٚدەکات دڵنیا بین بەهەر شـێوەیەك بێـت دوورخسـتنەوەی شـێخ و کوڕەکـانی و خزمـەکانی لـەلیوای سلێمانی واجب بێت. فەرمانیش لای حەزرەتەو ئەو خاوەن فەرمانە .

موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی ٣٠ ئایاری ساڵی ٣٢١.........

موتەسەڕییفی لیوای سولەیمانی \ ئەمیر لیوای ٢٢

ئەحمەد تۆفیق سالح سالم

FO 195\2308

سەعادەتی. ج. لۆتر بالۆیزی حکومەتی گەورەی بەریتانی - ئەستەنبوڵ
١٤ی کانونی دووەم ١٩٠٩ موسڵ.

گەورەم :

شەرەفمەندم راپۆرتێکتان لەسەر رووداوەکانی رۆژی سێ شەممەو چوار شەممەی رێکەوتی چوارو پێنجی ئەم مانگە بۆ بنێرم. ئەمە لەکاتێکدا زانیاریەکانمان زۆریان پەیوەستن بەراستیەوە، پێشتر راپۆرتێکم لەسەر ئەو بابەتە بۆ ناردن بەڵام هەتا ئێستاش هەندێ لێڵی لەسەر ئەو رووداوە هەیە، لێرە خەڵکەکەی دوو پۆلن : پۆلێك لەگەڵ سەیدەکانن و پۆلێکیتر دژیانن بۆیە هەندێ جار زەحمەتە زانیاری بابەتیانەو بێلایەن دەست بکەوێ.

وەکو بەدیار دەکەوێ ئەم کارەساتە بەم شێوە بووە :

لەرۆژی پێنج شەمەو پێنجەم رۆژی مانەوە سێ گەنج شێخ مەحمودوئەحمەد بەگ(کوڕی مستەفا بەگ)و بەها (کوڕی حاجی عەبدوڵڵە) لەبەردەمماڵی مستەفا بەگ کە لەسەر شەقامەکە هەڵکەوتبوو دانیشتبوون، بەها بەگ ئافرەتیکی موسڵاوی( الموصلويات) دەبینێ لەناو خەڵکەکەدا خزاوەو سوارەیەکی کوردی دەستی دەگرێو رایدەکێشێتە ماڵەوە. ئەو رۆژە هەوا خۆش و سێیەم رۆژی جەژنی قوربان بووە. لەکاتێکدا ئەو مەیدانەی ژنەکەی لێسوڕاوەتەوە نزیك بەبانکی عوسمانی و لەشوێنە قەڵەباڵغەکانی موسڵە.

بەها لەناو کۆمەڵە ئافرەتێکی موسڵاوی تردا چاوی بەو ئافرەتە دەکەوێ، داوای لێکردبوو لەگەڵیدا بچێتە ماڵەوە بەڵام ئەو ئافرەتە قبوڵی

نەکردو بەدەنگی بەرز هاواری کرد ئافرەتەکانی‌تریش لەگەڵی‌دا هاواریان کرد، بەخێرایی هەواڵ بڵاو بۆوە کەسەربازە کوردەکانی سەر بەتیپی چوارەی پیادەی کوردەکان ئابڕۆی ئافرەتێکی موسڵاویان بردووە. بەهۆی ئەمەوە هەندێ موسڵاوی لەشوێنی رووداوەکە کۆدەبنەوەو سەربازە کوردەکانیش تەقە دەکەن‌و هەندێ بەخراپی دەپێکرێن. مەفرەزەی سوپا هەرزوو دەگەنە شوێنی رووداوەکە بەڵام ئەوەی زیاتر کارەکەی ئاڵۆزکرد ئەو سێ لاوە کوردەی ناومان هێنان لەپەنجەرەوە تەقە لەئاپۆڕای جەماوەرەکە دەکەن .

ئەندامانی تیپی چوارەم لەگەڵ ئاگاداربوونی بەسەرهاتی برادەرەکانیان گەیشتنە شوێنی رووداوەکە، لەهەمان کاتدا ئاپۆڕای خەڵکی موسڵ زیادی کردو ژمارەی چەکدارەکان لەشوێنی رووداوەکە زۆر بوو، لەو کاتە زۆربەی ماڵەکانی موسڵ چەکیان هەبووو، ئەو تیپە سەربازیەی کەرکوک هەر زوو کەزانیان ژمارەی ئەوان لەبەرانبەر ئاپۆڕای جەماوەر کەمە کشانەوە بۆ پێگەیەکی سەربازی نزیک رووداوەکەو لەوێ سەنگەریان گرت، بەڵام ئەو پێگەیە تەلارێکی کۆن‌و خراپ بوو قاتی سەرەوەی نەمابوو، تەلاری بانکی عوسمانی‌و تەلاری شارەوانی‌و تەلارەکانی‌تری دەوروبەری بەسەریاندا دەڕوانی، سەربازو چەکدارە موسڵاویەکانیش لەپێگە سەربازیەکەی نزیک بەسوارە کوردە کەرکوکیەکانەوە سەنگەریان گرت‌و موسڵاویەکان کەوتنە تەقە، ماوەی سێ سەعات شەڕ بەردەوام بوو، هەتا کاتی سەردانی والی‌و یاریدەدەری قونسوڵی فەڕەنسیش تەقە هەر هەبووە، دیارە لەدوای گەڕانەوەی قونسوڵی فەڕەنسی شەڕ وەستاوە، ئیوارە سەربازە کەرکوکیەکان خۆیان بەدەستەوەداو وەکو بارمتە لەسەربازگەکەدا گیران، هەر لەڕۆژی یەکەمدا ژمارەی کوژراو لەنێوان ٣٠-٥٠ کەس دابووە لەناویاندا ژمارەیەك

ژن و منداڵ هەبووە، کاتی نیوەڕۆ والی و فەرماندەی حامیە زۆر بەدرەنگەوە کەوتنە گفتوگۆ بۆ چارەسەری کێشەکە بەڵام هەتا ئێستاش باسەکانی گفتوگۆیەکە نازانین چی بووە، فەرماندەی عەسکەری نزیکەی ۸۵۰ سەربازی لەبەر دەستدابووەو والیش لەسەرەتاوە هەتا گەرم نەبووە، هەڵوێستی جدی لەو کارە نەنواندووە . لەکاتەی والی گیشتە حامیەکە لەوێ بووکە قازیوفەرماندەی لیوا ئەنیس بەگ ( سەرۆکی هێزی سوارە) و نەقیب راشیح بەگو نەقیب سەعید بەگ(ئەفسەری ئەرکانی جەنگ لەموسڵ)و مولازم ناتیق ئەفەندیو ژمارەیەك لەزانایانو پیاوماقوڵانی شار لەدالانی ناوەوەی نزیك بەسەربازگەکە کۆببوونەوەو چارەسەریان لانەبوو چۆن دەست بەسەر قەیرانەکەدا بگرن. ئەفسەرانی جەندرمە٤٠٠ مەتر لەحامیەی نزیك بە سوارە کوردەگیراوەکانەوە پاسەوان بوون کەکارەساتەکە رووی‌دا. گتوگۆیەکی بێبەرهەم دەبیسترا لەنیوان والیو زانایانی شار، ئەوان داوایان لەوالی دەکرد رێگەیان بدا بچنە شوێنی رووداوەکە بەڵام والی بەر لەگەڕانەوەی کەوتە دانانی رێوشوێن بۆ پاراستنی پیاوانی قونسوڵیەتی بەرتانی لەموسڵو ماڵەکانیانو کومپانیای(لینج)، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ مەترسیەك لەسەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانی نەبووە. من داوام لەوالی کرد رێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر چونکە فەوزا هەموو شاری گرتۆتەوە. بەڵام والی لەگەڵ ئەوەشدا هێزی نارد بۆ پاسەوانی قونسوڵیەتی بەریتانیو فەرەنسی و نەی نارد بۆ دابینکردنی ئاسایشی کۆمپانیای لینج چونکە دوور بوو لەشوێنی رووداوەکەوە. لەدوای رۆژاوابوون شار ئارام بوو، بەیانیەکەی شەشی کانوونی دووەمی۱۹۰۹ی رێکەوتی چوارشەم زانرا کەسەربازە کەرکوکیەکان خۆیان داوە بەدەستەوەو لەحامیەکە دەست بەسەرن، دواتر هەواڵ بڵاوبۆوە کەوەفدێکی زانایانی موسڵ چوونەتە

سەردانی والی و داوایان لیٚکردووە سەربازە کەرکوکیەکانیان بداتە دەست چونکە ئەوانە دەست دریٚژیان کردۆتە سەر ئابرۆی ئافرەتی موسڵاوی، والی ئەمەی قبوڵ نەکردووەو هەر لەبارەگای خۆی مایەوەو جەماوەرەکەش بیٚئومید بوون و بەو حالەتەوە بەریٚنومایی و دەمڕاستیەتی ئەبوجاسم ناویٚك بەرەو دەرگای ئەو ماڵە رۆیشتن کە شویٚنی داڵدەدانی شیٚخ سەعیدو خزمەکانی بووە.

نیٚوانی شویٚنی مانەوەی حەوانەوەی شیٚخ لەبارەگای ئیدارەی حکومەت تەنها ١٠٠هەنگاو دەبوون، بۆیە واچاوەڕوان دەکریٚ بەرپرسانی حکومی لەویٚوە چاوەدیٚری ڕووداوەکەیان کردبیٚت .

ئاپۆڕای جەماوەر بەسەرۆکایەتی ئەبوجاسم ئاڵای سەوزیان بەرزکردبۆوە و هیٚرشیان کردە سەر ماڵی شیٚخ سەعید، ئەوانە دەرگای ماڵی شیٚخیان شکاندو بەمەش تاوانیٚکی قیٚزەونیان ئەنجام دا، لەکاتی گەمارۆدانی ماڵی شیٚخ چەقۆو خەنجەریان بەدەستەوە بوو هاواریان دەکرد (بژی غیرەت، بژی ئەبو جاسم ) .

١٣ کەس لەدەست و پەیوەندەکانی شیٚخ هەر لەناو ماڵەکەیدا کوژران، شیخ ئەحمەدی کوڕی هەنگاویٚك لەنزیك ماڵەکەی پیٚکرا، شیٚخ بەتەمەنی هەشتا ساڵیەوە قورئانی بەدەستەوە گرت و لەماڵ هاتە دەرەوە لەگەڵ هەندیٚ لەو پاسەوانانەی والی بۆی دانابوو بەرەو بارەگای والی نزیك خۆیان چوو، شیٚخ لەویٚ و لەبەدەم بارەگای حکومەت راوەستابوو بەردیٚکیان بەسەریدادا و کوشتیان، ئەو گروپە سەرلیٚشیٚواوە کەوتنە دامالینی پۆستاڵی مردووەکانی هاوەڵانی شیٚخ، لە ٥٣کەسی هاوەڵانی شیٚخ سەعیدی پیٚش دوو مانگ تەنها شیخ مەحمودو سیٚ کەس رزگاریان بوو، پیٚنج لەلایەنگرانی شیٚخ لەبیریٚکی نزیك شار خۆیان شاردبۆە کە دۆزیانەوە

دوویان کوژران و ئەوانی‌تر هەڵاتن، دوایی هەموو ماڵی شێخیان تاڵان کرد لە بەرماڵ و رایەخ و سەعاتی دیوارو دەروازەو هەندێ کەلوپەلی گرانبەها. هەتا ئەو گروپە بێسەرەوبەرە دەرگا و پەنجەرەی ئاسنیشیان لەماڵەکەی کردەوە.

بەو بیانووەی سابونچی ئەو سامانەی بەهۆی شێخ سەعیدەوە لەلای سوڵتان دەست کەوتووەو نازناوی(پاشا)ی پێدراوە، ئەو کۆمەڵەیە چوون و کۆگاکەی ئەویشیان تاڵان کردو هەموو شتەکانیان برد. سابونچی پێشتر خەریکی نێوانی والی و سەرۆکە کوردەکان بووە لەموسڵ، دەڵێن هەموو گەنم و دانەوێڵەو خوری کۆگاکەی سابونچیان تاڵان کرد، ئەمە لەکاتێکدا سابونچی لەدەرەوەی موسڵ بووەو کە گەڕایەوە خۆی گۆشەگیر کردو بەشەو ٣٠ پاسەوانی بۆ ماڵەکەی خۆی دانابوو.

ژمارەی کوژراوەکان لە ٧٠ کەس زیاتر بووە بەشێکیان ئافرەت و منداڵ بووە، بەڵام زەحمەتە ژمارەی قوربانیانی ئافرەت بزانرێ چونکە خانەوادەکانیان بەشایستەیان نەزانیوە دان بەکوژراوی ئافرەت دا بنێن و بزانرێ لەوکاتە لەدەرەوە بوون یان چۆتە شوێنە گشتیەکان، بەنهێنی پرسەیان بۆ داناوەو شارەوانی نەیتوانیوە سەرژمێریان بکات. بەڵام بۆپیاوان بەهیواین ئەو ژمارەی نەخۆشخانەکان دیاریان کردووە بنەڕەتێکی باش بێت بۆ دروستی ژمارەی کوژراوەکان. کوژرانی شێخ بەو جەرگبڕی و دڵتەزێنیە رووداوێکی نامۆو غەریبە بۆ شارێکی مسوڵمان و نەرۆژانی جەژن، بەڵام ناتوانین سەرکۆنەی ئەو موسڵاویانە بکەین کە بەرگریان لە ئابڕۆی خۆیان کردووە و هەروەها سەرکۆنەی ئەو کەرکوکیانە ناکرێت کەلەکاتی ناخۆشیدا بەرگریان کردووە، موسڵ شارێکی عەرەبیەو کوردان لەوێ نامۆن، بەڵام بۆ ڕووداوێکی لەو جۆرە واقعیە بڵێن ناکۆکی رەچەڵەک و بڵاوبوونەوەی چەك لەبەردەستی خەڵکی رۆڵی بەرچاوی هەبووە، هەندێ

سەركۆنەش دەكەوێتە سەر دەسەڵاتدارانی مەدەنی و سەربازی كەهیچ ڕێوشوێنێكیان نەگرتۆتە بەر بۆ بەرهەڵستی ڕووداوی لەو جۆرە. هەندێ ڕێوشوێنی كاریگەر وەرگیرا بەڵام هەر زوو سەربازەكان گەڕانەوە شوێنی خۆیان و بارودۆخەكەیان بەو مەترسیە بەجێهێشت، دەڵێن والی فەرمانی داوە سەربازە كوردەكان گوێڕایەڵیان كردو موسڵاویەكان بەقسەیان نەكرد، تەقەیان ڕاگرت و بەردیان دەهاویشت هەتا دەڵێن تەقەشیان دەكرد، مشت و مڕی زۆر هەبووە لەسەر بەرپرسیاریەتی دەسەڵاتداران لەو ڕووداوە و ناكۆكی گەرم هەبووە لەناو شار لەسەر ئەوەی كێ پشتگیری لەشێخ دەكات وكێ لەگەڵ كوشتنی دایە، تەنها ئەوروپییەكانی نیشتەجێی موسڵ بێلایەن بوون و زۆر سەخت بووە كەسێك بۆچوونێكی بابەتیانەت بداتێ لەسەر ئەوەی ڕووی دا .

بەڵام ڕووداوەكانی ڕۆژی دووەم لەشەشی كانوون زۆر جیاواز بووە لەگەڵ ڕووداوەكانی ڕۆژی یەكەم لەپێنجی كانوون، ناتوانین بڵێن هی دووەم بێبەرنامە بووە، بەر لەوەی زانایانی موسڵ بچنە لای والی سەربازە كەركوكیەكان خۆیان بەدەستەوە دابوو بارودۆخ زۆر هێمن بووە، دەستێوەردانی زانایانی موسڵیش لەو مەسەلە سەربازیە هیچ بڕوبیانوویەكی نیە، چونكە ئەوە سەر لەنوێ گرژیەكەی گەرمتر كرد، ئەمە هاوكاری بوو بۆ خەڵكەكە بەسەركردایەتی ئەبو جاسم بەئاڵای سەوزو بەدەف لێدانەوە بەرەو ماڵی شێخ بچن و ئەو حالەتە دروست بكەن .

بارودۆخی ڕۆژی یەكەمی ڕووداوەكە ڕێگەی خۆشكرد بۆ كارەساتی ڕۆژی دووەمی ماڵی شێخ سەعید. ئێستاش زۆر گرانە لەووردەكاریەكانی دروست بوونی كارەساتەكە ئاگادار بین، زۆر شت هەیە پێویستی بەدرێژە پێدان هەیەو قسەی شایەتحاڵەكان لەزۆر شوێن تێك دەگیرێ بەتایبەت

لەسەر پەیوەندی نێوان زاناکان و والی کەلایەنێکی دەسەلاتدار بووەو گلۆپی سەوزی بۆ کوشتنی شێخ هەڵکردبوو .....هتد بۆنمونە دەڵێن بە زاناکانی وتووە چی دەکەن بەئارەزووی خۆتان بیکەن، ئەوانیش داوایان لەخەڵك کردووە هێرش بکەنە سەر ماڵی شێخ سەعید، ئەمەش هەتا ئێستا گوتەیەو بڵاونەکراوەتەوە. بەڵام ئەوەی بەدڵنیاییی دەیڵێین والیو دەسەلاتدارە سەربازیو مەدەنیەکانی شاری موسڵ بەئەرکی خۆیان هەڵنەستاون و ئاژاوەچی یەکانیان بەرەڵا کردووە کارەساتی ئەوها بخولقێنن. هەروەها روونە کەزاناکان سەرکردایەتی ئاژاوەچییەکانیان کردووە بۆسەر ماڵی شێخ سەعید، کارەساتەکەش بەدووری ٤٠ مەتر لەماڵی فەرماندەی سەربازی موسڵەوە رووی داوە، هەتا ئێستاش هۆکاری ئەو هێرشەی سەر ماڵی شێخ سەعید دیار نیە، لەکاتێکدا شێخ بەهۆی هەڵسوکەوتی تاکڕەوانەی خۆیو منداڵەکانی لەسلێمانیەوە دوور خرابۆوە بۆ موسڵ (بڕوانە بروسکەکانی تشرینی یەکەمو کانوونی یەکەم ) ماوەی ئەو دوو مانگەش شێخ وەکو میوان مامەڵەی لەگەڵدا دەکراو خانوویەکی شایستەی سابوونچی یان دابوویەو حکومەتیش سەرقاڵی بڕیاری گەڕاندنەوەی بووە بۆ سلێمانی، دەڵێن سێ رۆژ بەر لەو کارەساتە سابونچی توانیبووی قەناعەت بەوالی بهێنێ ئەو ٨٠ پاوەن ئیسترلینیەی بۆ خەرج بکرێ کە پێشتر دەوڵەتی عوسمانی بۆی بڕیوەتەوە، لەهەمان کاتدا سوڵتان عەبدولحەمید زۆر رێزی لێدەگرت و ناو بەناو بروسکەی بۆ دەنارد و داوای لێدەکرد دوعای بۆ بکات.

هەتا ئێستا چەند ئەگەرێك هەیە لەسەر هۆکاری ئەم کوشتنە، ئەگەری یەکەمیان ئەوەیە کە ئاژاوەچیەکان نەهاتبوون بۆ کوشتنی شێخ سەعید بەڵکو هاتبوون بۆ گرتنی شێخ مەحمودی کوڕی چونکە یەکێك بووە لەو سێ گەنجەی لەبەردەم ماڵی شێخ تەقەیان لەجەماوەر کردبوو ئەم رووداوەیان

لەلایەن ئاژاوەچییەکانەوە زۆر مانا هەڵدەگرێ. ئەو ئاژاوەیەی هەندێ جار مسوڵمان‌و هەندێ جار نەسرانی دەبێتە قوربانی .

زەحمەتە لەو بارودۆخەدا لەرووداوێکی لەو جۆرە وورد بینەوە، دەبینین هەمووی پەیوەستە بەئەندازەی دەسەڵاتی حکومەت بەسەر موسڵ‌و بۆ ئەو مەبەستەش دەبوایە یەکێك لەم رێوشوێنانەی بگرتایە بەر :-

١- گۆڕینی ئەو حامیە عەسکەریە بەحامیەکی‌تر .

٢- دادگایی ئەوانەی دەستیان هەبووەو سزای توندی ئەنجامدەران .

٣- دوورخستنەوەی بەلایەنی کەمەوە ٦ زانا لەئەوانەی دەستیان لەو رووداوەدا هەبووە. دادگایی زانایانەی دەستیان هەبووەو سزای توندی ئەنجامدەران .

٤- دانانی والیەکی بەهێز .

٥- گرتنە بەری رێوشوێنی جدی بۆئەوەی ئەو قەناعەتە بخاتە بیری زۆربەی خەڵکەوە کەبنەڕەتەکانی دەسەڵاتی کۆن کەوت‌و بەدیل بۆ بارودۆخی تازە نیە.

ئەو بارودۆخەی ئێستا باڵی بەسەر موسڵدا کێشاوە، ئەوەش کە روونە لای هەڵویستی هۆزەکانی دەوروبەری ئەوەیە، بەدیلێك نابینم بۆ ئەو پێشنیارانەی لەسەرەوە ئاماژەم پێدا ئەگەر ئاشتی‌و ئارامی لەلیوا جێگیر نەبێت .

دڵسۆزتان

میلیکی یونگ

## - ٣ -

# بزووتنەوەی مەلا سەلیمی خیزانی لەبەدلیس ١٩١٤

لەمانگەکانی ئادارو نیسانی ساڵی ١٩١٤ز ناوچەکانی کوردستانی باکور شۆڕشێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی کە زانایانی تەریقەتی نەقشبەندی لەبەدلیس سەرکردایەتیان دەکرد، مەلا سەلیم و شێخ شەهابەدین و سەید عەلی لەسەرکردە بەناوبانگەکانی ئەو شۆڕشەبوون کەگڕەکەی لەخێزانەوە بۆ بەدلیس بلاوببۆوە. کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان پشتگیری خۆیان بۆ ئەو شۆڕشە دەربڕی لەگەڵ هەموو مەڵبەندەکانی تەریقەتی نەقشبەندی. ئەم شۆڕشە ئیتحادیەکانی زۆر نیگەران کرد، چونکە هۆکارە ئیقلیمی و زاتی و دەولیەکان لەباربوون بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش لەدژی ئیتحادیەکان، بۆیە چەندین تیپی سەربازیان نارد بۆ بەرگری لەبلاوبوونەوەو سەرکوتکردنی شۆڕش.

هەتا ئیستا ئامانج و هۆکارەکانی ئەو بزووتنەوەیە پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، ئێمە لێرەوە ئەم ئەگەرانەی خوارەوە هەڵدەبژێرین: ١- شۆڕشەکە کاردانەی گرتنی مەلا سەلیمی بەدلیسی بووە لەلایەن هیزەکانی حکومەتەوە. ٢- لەبەرنامەی رووسەکان بووە هەتا بیکەنە بیانوو بۆ دەست تێوەردان و داگیرکردنی کوردستان . ٣- شۆڕشی مەلا سەلیم بەشێك بووە لەبەرنامەی بزووتنەوەی کوردی و یانە کوردیەکانی ئەستەنبوڵ و کوڕانی بەدرخان و شێخەکانی شەمدینان نوێنەرایەتیان دەکرد. سەرکردەکانی شۆڕشی بەدلیس هیچ یاداشت یان هەڵسەنگاندیان بەجێنەهێشتووەو بەڵگەنامەکانی عوسمانیش دەست کەس نەکەوتووە. بەهیواین توێژەرەوانی تر بتوانن لەئاییندە زیاتری لەسەر بنووسن .

خولقاند، بەلام دواتر شێخ مەحمود تونیبووی بەسەلامەتی و ئەئاشکرا بڕیو چەندان کەس سەردانی بارەگای حکومەتیان کردووە لەموسڵو هیچ بەلگەیەك لەسەر ئەوە نابینرێ، بۆیە ئەم بیردۆزە بەلگەی قەناعەت پێهێنانی لانیە لەسەر هۆکاری ئەم کارەساتە، خەلکی موسلیش هیچ ناکۆکیەکیان لەگەڵ شێخ سەعید نەبووە. هەروەها ناگونجێ بلێین بەهەلە بووە چونکە شێخو بالای شێخ دیارو بەچاو بووەو دەلێن لەکاتی کوشتنی هەندێ پۆلیسی لەگەڵدابووەو هەتا نەگەیشتە بەردەمی دەرگای سەرەکی نەکوژرا، کوژرانی بەنوێژی نیوەڕۆو بەبەرچاوی خەلكو بەو وەحشیگەریەو بۆ پیاوێکی بەسالاچووی کەسایەتی ئاینی ناسراو و لەخانەوادەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت ) و قورئان بەدەستو لەشارێکی پڕ لەدەمارگیری ئاینی وەك موسڵ تا بلێی کارێکی سەیرە .

ڕووداوەکان زیاتر بەرەو ئەو ئەگەرەمان دەبەن کوژرانی شێخ بەرنامەڕێژی پێشتری بۆکراوە یان هەندێ لایەن ویستوویانە سوود لەو گەڕەلاوژەیە وەربگرنو نەخشەکەیان جێبەجێ بکەن بیانوو بۆ کوشتنی بەدەست بخەن. دەشگونجێت ئەو بروسکەیەی بەر لەرۆژێك لەرووداوەکە هاتبوو بۆ والی کەشێخ رێگەی پێبدرێت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی دوژمنەکانی ئەو شانۆگەریەیان سازدابێت بۆ کوشتنی هەتا نەگەڕێتەوە .

ئەگەرێکی تریش هەیە دەلێ بەر لەهاتنی شێخ پیاوماقولانی موسڵ دەیانویست ئاژاوەیەك بخولقێننو والی تێوەبگلێنن دوایی خۆیانی لێدەرباز بکەن، ئەم ئەگەرەش نزیکە ڕاست بێت.

زۆر شت هەیە لەسەر ئەو رووداوەو پرسیاری زۆر هەلدەگرێو لێلیو ژەنگو ژاری لەسەرە. بۆچی حکومەت بە٨٥٠ سەربازەوە نەیتوانی لەناو موسڵ کێشەیەك چارەسەر بکاتو نەیەلێ ٧٠ کەس بکوژرێ، لەماوەی ئەو

دوو رۆژەی رووداوەکان حکومەت بەچەند کاتژمێرێك دەیتوانی کۆنترۆڵی بکات؟ لەلاوازی والی بووە یان فەرماندەی سەربازی یان شەرمەزارکردنی والی بووە لەلایەن فەرماندەی سەربازیەوە کەدوژمنی سەرسەختی یەکتر بوون ؟ حکومەتی مەکەزی تێگەیشتبوو بیٔئاگایی لەسروشتی موسڵ هەڵەیەکی کوشندە بووە، دانانی زەکی پاشاش وەکو والی لەموسڵ هەڵەیەکیتر بووە لەدرك نەکردنی حکومەت بەهەستی خەڵکی موسڵ. دانانی لقی ئیتحادو تەرەقی موسڵیش هەمان هەڵەی دووبارە کردەوەو زیانی بەئیتحادیەکان گەیاند، چونکە سروشتی موسڵ لەگەڵ هی هەموو عێراق جیاوازە. بەرپرسانی خاوەن بیری لیبراڵ خەڵکی موسل برینداردەکات و زیاتر دوور دەکەونەوە، سەیرە حکومەت لەو رووداوە زاناکان سەرپشك دەکات، رۆژی یەکەم پشتگیری لایەك و رۆژی دووەم پشتگیری لایەکەیتر دەکات . پێنج ساڵ بەر لەو رووداوە زانایانی موسڵ ئاژاوەیەکی لەو جۆرەیان خولقاندو لەئاکام والی (نوری پاشا)یان دەرپەڕاند، لەساڵی ١٩٠٦ز ئەبوجاسم سەرکردایەتی شالاوێکی لەو جۆرەی کردو بووە هۆی نەقڵکردنی مستەفا بەگی والی، لە ٦ی تشرینی دووەم شتێکی تری لەو جۆرە رووی دا بەلام خۆشبەختانە بەئاشتی کۆتایی پێهات. ئەوەی جێی سەرنجە لەمێژووی نوێی کورد شتی لەو جۆرە رووی نەداوە وەکو ئەوەی رووی‌دا لە شاری موسڵ بەدەست ئەبوجاسم و ئەویش ئامرازی دەستی زاناکان بووە، هەستێکی لەو جۆرە هەیە هەموو ناکۆکیەکی نێوان مسوڵمان و گاورەکان بەتراژیدی کۆتایی پیٔدێت. لەو ماوەیە بارودۆخەکە گرژ بووەو ئەمەش هۆکارێکی تری نائارامی ناوچەکەیە، بەجۆرێ بازرگانەکان لەبەردەم دوکانەکانی خۆیان چەکیان بەدەستەوەیە، رێوشوێنی پێویست هەبووە بۆ پارێزگاری لەماڵی دەوڵەمەندو ناوداران. کوشتنی شیخ

## بەڵگەنامەکان

پشتگیری ئەو سەبارەت بەئەگەری یەکەم بەوەی شۆڕشەکە لەخۆوە بووە، ئەم دوو بەڵگەنامەی قونسوڵی بەریتانی کە لەخوارەوە دەیخەینە روو باس لەو ئەگەرە دەکات :-

### بەڵگەنامەی یەکەم.

FO 195\ 2458 ---- ژمارە(٨) بەدلیس ١٦ی نیسانی ١٩١٤ .

بەڕێز سیر لویس مالیت، باڵوێزی حکومەتی بەریتانی لەئەستەنبوڵ، لەبەر رۆشنایی رێنومایەکانی بەڕێزتان کەلە ١١ی نیسان لە بەدلیس گەیششتە دەستم پێم خۆشە دڵنیاتان بکەم ئەو زانیاریانەی لەڕاپۆرتی ژمارە-٧- بۆم ناردن و لەمەوایبە والی هاوکاری کردووم تائەندازەیەك دروستن .

مەلا سەلیم چەند مانگە خەریکی هاندانی کوردانە لە ناحی و خێزان و قارچغان بۆیاخی‌بوون لەحکومەت. مەلا سەلیم بانگەوازی هەندێ لەشێخی وەکو شێخ شەهابەدین و یەکێك لەنەوەکانی سەید عەلی بیستووە کەئەم دوو کەسایەتیە لەبەناوبانگترین کەسایەتیەکانی ناوچەکەن. لەکاتێکدا ئەوە بزانین کەشێخ بەهائەدین یەکێك لەکوڕەکانی شێخ جەلالەدینی خێزانی و سەید عەلیش برازایەتی بەڵام وادەردەکەوێ سەید عەلی رۆڵێکی دوولایەنەی هەبێت. لەلایەك خەڵکی هانداوە بۆ ئامادەکاری لەدژی حکومەت و بەنهێنیش پشتیوانی لەحکومەت کردووە .

بەپێی ئەو زانیاریانەی گەیشتۆتە ئێمە ئامادەکاری بۆ ڕاگەیاندنی شۆڕش لەدژی حکومەت گەرمەو کاریگەری ئەو ئامادەکاریانەش گەیشتۆتە ناوچەکانی دەوروبەری. دەسەڵاتدارانی حکومەت هەتا مانگی ئازار مەترسی ئەو مەسەلەیان نەزانیبوو، لەوکاتە موزەفەر بەگی والی فرمانێکی بۆ قەرەسۆی قائمقام دەرکرد مەلاسەلیم بگرێو ڕەوانەی بکات . لەوکاتەی مەلا سەلیم لەلایەن٤٠ کەس لەهێزەکانی حکومەت بەگیراوی دەگوازرایەوە، هێزێکی کوردەکان کە لە٤٠ کەس پێکهاتبوون هێرشیان هێناو قائمقامیان ناچار کرد بەرەڵای بکات. بەچەند ڕۆژێک لەدوای ئەو ڕووداوە شێخ بەهائەدین یادشتنامەیەکیدا بەوالیو داوای کردبوو شەریعەت لەکوردستان جێبەجێبکرێتو ئەو کاربەدەستە تورکە گەندەڵانە لەناوچەکە دوور بخرێتەوە، وەکو خۆی دەڵێ ئەوانە کافرنو ئاراممان لەبەرانبەریان نیە، جۆرەها باجیان لەسەر خەڵك داناوەو تەحەمول ناکرێ. شەهابەدین والی ئاگادار کردەوە، ئەگەر وەڵامی داوایەکەی نەدرێتەوە ئەوە موجاهیدەکان هەڵدەکوتنە سەر بەدلیسو کاربەدەستان دەگرنو پێستی لەشیان دادەماڵنو ورگیان هەڵدەدڕن .

والی ئەوەی ئەم یاداشتەی پێگەیشتو چەند ڕێوشوێنێکی بەپەلەی گرتە بەر، بەڵام بەتالوینی(١٠١) هێزەکانی حکومەت بەتەنها بەس نەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی کوردە شۆڕشگێڕەکان. بۆیە والی بروسکەی بەپەلەی کرد بۆ هەریەك لەموشو وانو ئەرزڕۆم هەتا هێزی زیاتری بۆ بنێرن، هەروەها والی وەفدێکی لەپیاوماقوڵانی ناوچەکە نارده لای(خێزان) هەتا بەڕێگەی ئاشتیانە کۆتایی بەو قەیرانە بهێننو داوای لەموجاهیدە کوردەکان کرد بلاوەی لێبکەنو ڕژێم نەخەنە پەشێوی، بەڵام حکومەت

لێرەدا دەیویست بەڕێگەی وەفدەکەوە بیانخافڵێنێ هەتا دەگاتە ئاکام‌و هێزی زیاتری بۆ دێت.

لە٢٤ی ئازار مەزهەر بەگ لەپایەی خۆی لابراو عەبدولخاق بەگی کۆنە والی سەعرەتی لەجێی دانرا، دوای چوار رۆژ کوردەکان یاداشتنامەیەکی تریان دایە حکومەت بەڵام لەو کاتە چوار تیپی حکومی تریش گەیشتنە بەدلیس، والی تازە بڕیاریدا هێرش بکرێتە سەر ئەوهێزە کوردیەی دوو سەعاتەڕێ لەباشووری بەدلیسەوە دوورن. هێزەکانی حکومەت لەبارودۆخێکی زۆر سەختی ئاوو هەوای نیسان‌و لەناو گەرداوی بەفردا هێرشی بردە سەر شۆڕشگێڕان‌و هێزەکانی حکومەت ناچاری پاشەکشەکران بۆ ناو بەدلیس. کوردەکان بەوەوە نەوەستان کەوتنە دوای هێزەکانی حکومەت‌و هەر ئەو شەوە گەیشتنە گەڕەکەکانی دەرەوەی شار، لەدووی نیساندا ٣٠٠٠کەس لەشۆڕشگێڕە کوردەکانی دەرەوەی شارو بەشێك لەوانەی لەگەڕەکەکانی لای رۆژهەڵاتی شار نیشتەجێبوون هەواڵیان دایە گەڕەکی ئەرمەنیەکان کەدوژمنکاریان لەگەڵ ئەواندا نیەو هیچ مەترسیەك بۆ سەر ئەوان نابێت، شەڕی شەوان بەتەنها دژی حکومەتە. هەروەها مەلا سەلیم نامەیەکی بۆ سەرۆکی روحی تایەفەی ئەرمەنی لەبەدلیس ناردو دڵنیای کردەوە کەلایەنگرانی هێرش ناکەنە سەر ئەرمەن‌و کاریان بەسەر ئەوانەوە نیە.

پەیدابوونی شۆڕشگێڕانی کورد لەناو بەدلیس وا لەناکاوو بەم ژمارە زۆرەوە توانای دەسەڵاتدارانی تووشی نووشستی کرد، بەرپرسان‌و فەرمانبەرە گەورەکان لەناویاندا بەڕێوەبەری پۆلیس لەشار هەڵهاتن‌و بەتەنها بۆ بەرەنگاری شۆڕشگێڕە کوردەکان‌و کاربەدەستە بچوکەکان مابوونەوە، هەروەها ٧٠-٨٠ جەندرمە لەبەدلیس چونکە کوردو هاوسۆزی

شۆڕشـگێڕەکان بـوون جـێی متمانـە نـەبوون، ١٠کـەس لەپۆلیسـی نـاوخۆ لەبـەدلیس هاتنـە نـاو قونسـولیە، زۆر دەترسـان و تۆقیبـوون و چـەکەکانیان دایـە قونسـوڵیەو فەرماندەیـەکی ئەرمـەن لـەوێ داڵـدەی دان، بـەڵام لـەدوای گفتوگۆ لەگـەڵ نمایـادەی قونسـوڵی لەبـەدلیس ئـەو مەفرەزەیـە نێـردران بـۆ کۆمەڵەی مسیۆنەری ئەمریکی( التبشيريه الامريكيه) لەشار. هەر لەو ماوەیە والـی هــەواڵی پێـدام کـە بارودۆخەکـە گەیشـتۆتە قۆنـاغێکی ناسـك و ئـەو کاربەدەسـتانەی لای خۆیـەتی نایانناسـیٚ و گومـانی لەئـەوان و هێزەکـانی پـۆلیس هەیـە چـونکە کـوردن و هـاودینی ئـەوانن. هێزەکـانی حکومـەت پێکهاتبوون لەپێنج تیپی پیادە بەچوار رەشاش و دوو تۆپی شـاخی کۆنەوە کـەژمارەی هــەموویان دەگەیشــتە ٩٠٠چــەکدار لەچــەند شـوێنێکی شـار بـەرگریان لەقـەڵای سـەنتەری شـارو کۆشـکی پێگـە سـەربازیەکان کردبوو، لەسـەر گردێکـی بەشـی رۆژاواش بـەرگریان لـەو گەڕەکـە دەکـرد کەبەدەست کوردەکانەوە بووە، لەکاتژمێر شەشی بەرەبەیانـەوە تەقە دەستی پێدەکرد و هــەموو رۆژیٚ هــەتا شــەو دەهاتــەوە بــەردەوام دەبـوو. تەقەمـەنی زۆر بـەکار هێنـرا بـەڵام لەهــەردوولا زیـان کـەم بـووە. تـەنها ٣٠٠کـەس لەموجاهیـدە کوردەکان چەکی هاوچەرخیان پێبوو. ئەوانی‌تر شمشێرو چەقۆو داسیان هەڵگرتبوو. بەو هیوایەی دەست بگرن بەسەر مەڵبەندی تەقەمەنی شارو بەو چـەکانە خۆیـان چـەکدار بکـەن. هەنـدیٚ لەخـەڵکی بـەدلیس پەیوەنـدیان بەشۆڕشگێڕانەوە کرد، بـەڵام بەو ئەندازەیە نـەبوو کەمـەلا سـەلیم چاوەڕێی دەکـرد. هـەموو خـەڵکی بـەدلیس چـاوەڕوانی ڕووداوەکـەیان دەکـرد هـەتا لایـەنێك لەشـەڕەکەدا سەرکەویٚ. چەکی رەشاشـی هێزەکـانی حکومـەت لـەو شەڕەدا رۆڵی یەکلاکەرەوەی بینی. چونکە نەیهێشت شۆڕشگێڕان پێشڕەوی بکەن بۆناو شارو پەیوەندی راستەوخۆبگرن لەگەڵ‌خەڵکی بەدلیس وئەوان

بچــنه پــاڵ شۆڕشــگێڕان. هــەروەها چــەکی هێزەکــانی حکومــەت لــەهی شۆڕشگێڕەکان چاکتر بوو، بەهۆی ئەمەش ورەیان بەرزتر بوو، لەکاتێکدا هێزەکانی حکومەت تەواو مەشقیان پێنەکرابوو، بەشێوەی بێسەرەو بەرە تەقەیان دەکرد. ئەگەر شۆڕشگێڕان بەشەو بهاتبانایە ناوشار بەزەحمەت هێزەکانی حکومەت دەیانتوانی بەرگری بکەن و گیانی بەرگری دەفەوتا.

مەلا سەلیم دوای کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆ بۆی دەرکەوت هێزەکانی ناتوانن ئامانجەکانی خۆیان بپێکن و خەڵکی بەدلیس وەکو چاوەڕوان دەکرا پەیوەندیان پێوەنەکرد. بۆیە ئەویش داوایەکی نارد بۆ قونسوڵیەتی بەریتانی کەبیپارێزن. وەڵامیان دایەوە کەناتوانن و بابچێت بۆ قونسوڵیەتی رووسی. هەوەها رەشاشیش رۆڵی هەبووە لەکوتانی شوێنی شۆڕشگێڕان و بڵاوکردنەوەی ترس وبیم لەناویاندا هەتا ناچاری کردن شوێنی خۆیان بەجێبهێڵن و هەندێکیان خۆیان خزاندبووە کەنیسەی ئەرمەنی، مەلا سەلیم بەشەو داوای لەهێزەکانی کرد پاشەکشە بکەن.

ئەگەر بەراوردی قەبارەی تەقەمەنی و چەکە بەکارهاتووەکان بکەین لەماوەی شەڕەکە ئەوە ژمارەی قوربانیەکان کەم بووە، زیانی هێزەکانی حکومەت لەنێوان ٨ کوژراو و ١٦ برینداردابووە بەڵام زیانی لایەنی کوردی لەو شەڕەدا بەئاسانی دیاری ناکرێت چونکە ئەوان کوژراو و برینداری خۆیان لەگەڵ خۆیان بردووە گەرچی ژمارەی کوژاوی ئەوانیش لە٦٠ پێکراو تێناپەڕێ، ژمارەی پێکراوە مەدەنیەکانی ئاکامی تەقەی عەشوائی نێوان هەردوولا ٤ کوژراو و ١٨بریندار بووە.

بۆ رۆژی دوایی هێزەکانی حکومەت لەگردەکانی دەروبەری شار شوێنی خۆیان گرت و لەبەرانبەر هێرشی لەناکاوی شۆڕشگێڕان ئیحتیاتی خۆیان وەرگرت. حکومەت بەشی زۆری هێزەکەی بەرەو خێزان بەڕێکرد

بەفەرماندەی ئیحسان پاشای فەرماندەی تیپی ٣٤ بەچوار تۆپو ٨ رەشاشەوە. هەر ئەو کاتە لەناوچەکانی تریشەوە هێزەکانی حکومەت گەیشتن، بەلام حکومەت گوندەکانی خۆیان بەجێهێشتو ئافرەتو منداڵەکانیان ناردە ناوچە کوردیەکانی ترو مەڕومالاتەکانیشیان بۆ شوێنە سەختەکان دوورخستەوە.

هێزەکانی حکومەت لە١٤ی نیساندا گەڕانەوە جگە لەهێزی بەدلیس نەبێت ماوەیەك لەخێزان مانەوە. لەخێزانیش ٨ تا ١٠دیلیان لەگەڵ خۆیان هێنا، سەید عەلی و کوڕەکانی لەناو ئەو دیلانە بوون، حکومەت دوای ئەوە هیچ بڕیاری لەسەر نەدان ئایا دادگاییان دەکەن یان وەکو بارمتە بەمەبەستی سەرهەڵنەدانەوەی شۆڕش دژی حکومەت بەکاری دەهێنن، هەتا ئێستاش شەهابەدینی فەرماندەی شۆڕشگێڕان نەگیراوەو هەڵاتووە بۆ ئێران.

هێزەکانی حکومەت لەو هێرشانە بەحیکمەت مامەڵەیان دەکردو هیچ حالەتێکی تالانو زەوتکردن لەو گوندانەی هێرشیان کرابووە سەر ئەنجام نەدران، هەتا تەکیەی شێخ شەهابەدین هیچ کەس خراپەی بەرانبەر نەکرد.

بەرپرسانی حکومەتو عەسکەریەکانیش قەناعەتیان وابووە ئەوەی رووی داوە سەرکردە کوردەکان لێی بەرپرسیارن نەك خەڵکی گوندەکان چونکە ئەوان نەفامنو لەژێر کاریگەری سەرکردە ئاینەیەکانیان دانو ناتوانرێ بەوەی رووی‌داوە تاوانبار بکرێن، لێرە بۆئەندازەی دواکەوتوویی کوردان نمونەیەك دەهێنمەوە زۆر لەو خەڵکە قەناعەتیان وایە مەلا سەلیم دەتوانێ گوللەی چەکەکان هەڵگێڕێتەوە بەرەو ئاسمان، یەکسەر بەهۆی پەیوەندیو هاواری بۆ خوا دەتوانێت تۆپی هێزەکانی دوژمن خراپ بکات، حکومەتیش ڕێگەی نەرمی هەڵبژارد لەگەڵ گوندنشینەکان لەگرتنە بەری ڕێوشوێنی توند لەلێپرسینەوەی لادێیەکان خۆی بەدوور گرت،

سەركەوتوو بوو لەگێڕانەوەی گوندنشینەكان بۆگوندەكانیان هەتا لەكێڵگەكانیان بەكشتوكاڵەوە خەریك بن.

مەزهەر بەگی والی پێشوو بەرپرسیاریەتی ئەو راپەڕینەی دەكەوێتە ئەستۆ چونكە چەندین جار ئاگاداركراوەتەوە بەوەی كوردەكان دەیانەوێ راپەڕن دژی حكومەت بەڵام ئەو هیچ رێوشوێنێكی گونجاوی نەگرتۆتە بەر .

حكومەت قەناعەتی وابوو شۆڕشی كوردی رووداوێكی لەناكاوو گۆشەگیروكۆتایی پێهاتووەو سەركوتكراوەو لەئایندە دووبارە نابێتەوە، بەڵام زۆربەی قەناعەتی وایە شۆڕشی كوردی لەبەدلیس بەشێكە لەو نەخشە بەرفراوانەی كورد كەبڕیار بووە لەبەدلیس بقەومیٚو ئەوەی بەدلیس بەر لەكاتی دیاریكراوی خۆی هەڵگیرسا، گرتنی مەلا سەلیمو ئارەزووی تۆڵەكردنەوەی حكومەت لێی خەڵكی خێزانی بەر لەكاتی خۆی ڕاپەڕاند. بەهۆی ئەمەوە شۆڕشەكە دابڕاو بوون لەناوچەكانی دەورووبەری. چاوەڕوانی ئەوە دەكرا كوردەكانی دانیشتووی خۆیەشو مودكانو چەقور لەرۆژاواوە هێرش بهێنن بۆ سەر بەدلیس بەڵام نوشستی بەرەی خێزان وای لێكردن پەشیمان ببنەوە لەو هێرشە، نكوڵی لەوە ناكریٚ هەردوو هێرش پێكەوە بكرایە بێگومان بەدلیس كەوتبو. عەبدورەزاق بەدرخانیش دەستی لەو هەڵگەڕانەوەیەدا نەبووە، ئێستا ئەو لەئێران دادەنیشێت، ساڵی پار بەسەرۆكایەتی خۆی دەستی هەبووە لەهەڵگەڕانەوی هۆزە كوردەكان. مەلا سەلیم چەندین جار سەردانی ئەستەنبوڵی كردووەو دەڵێن پەیوەندی هەبووە بەبەرهەڵستكارانی پارتی دەسەڵاتدار لەتوركیا، هەروەها دەڵێن (عەزیم بەگ) كەدەستی هەبووە لەكوشتنی مەحمود شەوكەت ئێستا لەخێزان خۆی شاردۆتەوە بەڵام كەسێك لەناوچەكە نەی بینیوە یان هەستی نەكردووە لەویٚ بێت .

سەرەڕای ئەوەی دڵنیا نین بەرهەڵستکارانی ئەستەنبوڵ دەستیان لەو هەڵگەڕانەوەیەدا نەبووبێت، ئاماژە هەیە بەوەی کوردەکانی دەرەوەی خێزان دەستیان لەو هەڵگەڕانەوەیەدا هەبووە، ئەگەر هێرشی سەر بەدلیس ئامانجی پێکابایە ئەوە زۆربەی کورد دەبوونە هاوکاری شۆڕش و لەوانە بوو شۆڕش ببوایە بەرەنگاریەکی گەورە لەدژی حکومەت، یەکگرتنی کورد بەتەنها لەیەك ولایەت زەحمەت بوو ئەو مەترسیە گەورەیە دروست بکات، تیپە سەربازیەکانی حکومەت لەناوچەکەدا لەحالەتێکی زۆر خراپ دابوون، لەرووی چەك و مەشق و خۆراك و زەبتەوە تووشی ناتەواوی ببوون و ژمارەشیان زۆر کەم بوو، یەکە سەربازیەکان لە٢٥٠سەرباز تێنەدەپەڕی، هێزە یەدەگەکان و تیپەکانی تۆپخانە سنووردار بوون و خزمەتگوزاریش تاڕادەیەك هەر نەبوو.

ئەم بەشەی تورکیا و بارودۆخەکەی زۆر پێویستی بەچاودێری و بایەخ پێدانە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا زۆربەی کوردەکان نەچوونەتە پاڵ هەڵگەڕانەوەی دژ بەحکومەت، هەست بەسۆزو خۆشەویستی حکومەت ناکەن لەگەڵیانداو بەناچاری گوێڕایەڵن، چونکە ئەو باجە نوێیانەی حکومەت لەسەری داناون نەگونجاوو جێی ناڕەزایی زۆربەی خەڵکیە، بەتایبەتی ئەو باجەی لەسەر ئاژەڵ و وردتر لەسەر مەڕ دانراوە مایەی ناڕەزایی کوردانە و کاربەدەستانی حکومەت بەتەنها وەکو باجگر دەناسن.

بەبەراورد لەگەڵ ئەرمەن کوردان لەژیانێکی خراپ دا دەژین، زۆربەی کورد ژێردەستی زوڵمی دەرەبەگایەتی و لەبن دەستی سەرۆك هۆزەکان دابوون و دەبوایە جوتیارەکان بۆبەرژەوەندی سەرۆك خێڵەکان کاربکەن و دەرفەتی باشکردنی ژیانیان نەدەدرا. لەکاتێکدا سامانی جوتیاران بەدەست سەرۆك هۆزو شێخەکانەوەیە، ئەم حالەتەش بەردەوام بووە. پیلانێك هەیە

لەنێوان سەرۆك هۆزەكان و حالەتی هەڵگەڕانەوە، كوردان گوێڕایەڵی سەرۆك هۆزەكانیانن و هاوسەنگی بۆ ئەم گوێڕایەڵیە هەیە، لەكاتی هەڵگەڕانەوەش لەحكومەت بێزیانن چونكە ئارامی و ئاشتی نیە، لەهەرجێگەیەك هەڵگەڕانەوە سەركوت بكرێ لەجێگەیەكیترو لەپارێزگایەكیتر سەرهەڵدەداتەوە، وادەزانم تاكە چارەسەر ڕزگاركردنی كوردانە لەكۆت و پەیوەندی ئەو كۆیلایەتیەی سەرۆك هۆزەكان بەسەریاندا سەپاندوون لەگەڵ دابەشكردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا.

والیەكانی ئێستای هەریەك لەوان و بەدلیس تەواو ئاگادارن كەدەبێت ئاستی بژێوی كوردەكان باش بكرێ، ڕێگەوبان و كردنەوەی قوتابخانە لەئەولەویات بێت، بەڵام ئەگەر حكومەت پارەی بۆ تەرخان نەكات ئەوانە پارەی پێویستیان لەبەردەست دانیە بۆجێبەجێكردنی ئەو بەرنامەیە، بەرزكردنەوەی ئاستی بژێوی و سنووردانان بۆ دەسەڵاتی سەرۆك هۆزەكان بەردی بناغەی ئارامی ناوچەكەیە.

مەلا سەلیم نامەیەكی ناردووە بۆ سەرۆكی روحی گاورەكان و جەخت دەكاتە سەر ئەوەی شۆڕش بەتەواوەتی دژی حكومەتە نەك دژی ئەرمەن. لەو نامەیەدا دەڵێ:

لای بەرێزتان شاراوە نیە ئێمە فیداكارانی ئیسلامیمان ئامادەكردووە بەڵام ئاگادارتان دەكەمەوە هەرگیز نامانەوێ خراپە بەرانبەر گەلی ئەرمەن بكەین، لەو بارەیەوە ڕینومایی توندمان بۆلایەنگرانمان ناردووە، داوا دەكەین ئێوەش بەلایەنگرانتان بڵێن با بێلایەن بن و خۆنەخەنە ناو ڕووداوەكانەوە، ئەگەر لایەنگرێكی ئێوە شۆڕشگێڕێكی ڕاپەڕیوە كانیان بینی وابزانێت نەی بینیوە، ئێمە سەرقاڵی مەسەلەیەكی ترین و هیچ پەیوەندی بەئەرمەنەوە نیە.

پەیوەندی کوردو ئەرمەن ئێستا لەهەموو کاتەکان باشترە. مەلا سەلیم‌و چوار لەهاوڕێکانی ئێستا لەقونسولیەتی رووسین‌و لەلایەن سەربازە تورکەکانەوە لەژێر چاودێری توند دان . میستەر م. شیکۆی رووسی پێی راگەیاندم کە ڕینومایی لەباڵوێزخانەی رووسی وەرگرتووەو داوای لێکراوە هەتا دەرفەتی هەڵاتن بۆدەڕەخسێت پارێزگاری لەمەلا سەلیم‌و هاوڕیکانی بکەن.

بەم دوایەش هەریەك لەبەدلیس‌و ناهی خرانە ژێر ئەحکامی عورف، فەرماندەی سەربازی لەناوچەکە پێی وتم دادگا فەرمانی وەرگرتووە ئەوانەی دەستیان لەو هەڵگەڕانەوەیە هەبووە بەزوویی دادگایی بکرێن بەڵام ئێستا لەسەرکردەکانی ئەو هەڵگەڕانەوەیە سەید عەلی نەبێت کەس نەگیراوە ، ئەویش لەو هەڵگەڕانەوەیە بەشدار نەبووە.

دڵسۆزو خزمەتکاری گوێڕایەڵتان سیر سمیت/ یاریدەدەری قونسولیەتی بەدلیس

## بەڵگەنامەی دووەم

ئەرزڕۆم / ٦ی مایسی ١٩١٤ پاشکۆی ژمارە(٢) : سێر

بەختەوەرم ئێستا لەگەڵ نامەکەم ناوەرۆکی ئەو دوو نامەت بۆدەنێرم کەلەلایەن (ریفرن مینارد) بەمسیۆنەری ئەمریکی سەرقاڵ بەکاروباری قونسوڵیە لەبەدلیس لە٣٠و٣١ نیسان نێردرابوو، ئەو دوو بڕگەی هەردوو نامەکەی ئەوان کە بۆمنیان ناردبوو تەواوکەری ئەو زانیاریانەیە کەمولازم( ئەیان مسیس) لەپاشکۆی ژمارە(٨)ی ١٦ی نیسان ناردبووی، چەند تێبینیەك لەناوەرۆکی راپۆرتەکە بەدی دەکرێ. (می نارد) دەڵێ ئەو چەکدارە کوردانەی پەنایان بردبووە بەر قونسوڵیەکە چەکەکانیان لای خۆیانە بەڵام ئەیان سمیس دەڵێ بەر لەوەی بچنە ژوورەوە چەکەکانیان داوە بە یاریدەدەری قونسوڵیە. ئەو زانیاریانەی لەسەر گرتنی شێخ بەهائەدینیش هاتووە گوایە لەسەر سنوور گیراوە روون نیە.

### لەنامەی ٣٠. نیسانی ١٩١٤ وەرگیراوە

کەنیسەی (سورب کافرون) لەناوچەیەکی نزمایی هەڵکەوتووەو گردێك بەسەریدا دەڕوانێت، ئەویش لەبەرانبەر پێگەیەکی سەربازیو بازاڕە. دوێنێ ٣ی نیسان نزیکەی دووسەد کورد دەجەنگانو لەهەوڵی ئەوە دابوون ئاگری چەکەکانیان بکەنە هێزەکانی حکومەت. ئەمە مەسەلەیەکی سەرنج راکێش بوو، ئێمەش لەشوێنی خۆمانەوە لەپشت گردەکەوە تەماشای پێگە سەربازیەکانو کوردەکانمان دەکرد، جوتیارە کوردەکان بەرگی شڕیان لەبەردابوو، چەکی سادەو کەمیان پێبوو، یەکیان پەنجەی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بوو سەردەکەوتە سەر گردەکەو بێ ئامانج چەند

تەقەیەکی کردوو بەرەو شوێنی خۆی هەڵات. پێم وابوو ئەو تەقانە کەسی لەسەربازەکان یان خەڵکی مەدەنی بریندار نەکرد، ژمارەیەکی ئەوانەی کەنیسە چەکدار بوون.بەلاّ م هێزەکانی حکومەت رووی چەکەکانیان تێکردن و زۆر سەغڵەتیان کردن، زیانێکی سووك بەر رەشاشەکە کەوتبوو هەروەها دەڵێن بەشێك دیوارەکە رووخا، چەند ئارپێچیەك لەساحەی بەرانبەر کەنیسە کەوتەوەو ٧کەسی کوشت و هەندێکی تری بریندار کرد، تەلارەکە بەئامانج گیرابوو بۆیە بۆردومانی چڕو بەردەوامی لەسەر بوو، لەکاتی نیوەڕۆ هێزەکانی حکومەت چوونە ماڵی موفتی وا دیارە موفتی هاوسۆزی لەگەڵ شۆڕشگێڕان هەیە، ئەوەش کەهاتنە ماڵەکەی لەسەر داوای موفتی خۆی بووە هەتا پارێزگاری لێبکەن یان بۆیە هاتن چونکە ئەو پێی ناخۆشە، لەکاتێکدا ماڵی ناوبراو لەسەر هێڵی ماڵی ئێمەو کەنیسەی (کورب کفرك) دوور نیە، بەبەردەوامی شۆڕشگێڕە کوردەکان لەبەشی راستەوەو بەتایبەتیش لەماڵی موفتیەو پێگە سەربازیەکەوە تووشی بۆردومان بوون، لەدەمی ئێوارەش لەماڵی موفتیەوە تووشی بۆردومانی چڕ هاتن، شوێنی کەنیسەکە نزم بوو بەتەواوی نەمانزانی بوو ئێمە لەو شوێنە وەستاوین کە بۆردومان کردنی لەلای ماڵی موفتیەوە ئاسانە، هەتا کاتژمێر پێنج لەوێ ماینەوە. ئەو کاتە کەنیسەو قوتابخانەو ماڵی ئێمە بەئامانج گیران و بەچڕی بۆردومان کران، لەهەر دەقیقەیەکدا فیشەکسێك لەلامان دەکەوتەوە، هەرزوو عەسرەکەی ئەو رۆژە هەندێ بەردم خستە بەردەم ئەو دەلاقەی دەکەوێتە بەشی سەرەوەی شوێنی دانیشتن، بۆ ئەوەی لەکارەسات بەدووربم، چوومە ژوورەوەو لەگەڵ ژنەکەم قسەم دەکرد فیشەکێك هات و جامی پەنجەرەکەی شکاند، بەلاّم بەردەکەی دیوی ژوورەوە گێڕایەوە، دوایی فیشەکێکی ترمان لەهەمان شوێن دۆزیەوە،

گوللەیەك پەنجەرەی ژووری نوستنی خراپ کردو دیوارەکە گوللەیەکی تریشی گێرابۆوە، گوللەکەی دوایم هەر بۆ بیرەوەری هەڵگرت، لەکاتژمێر هەشت و نیو تەقە وەستا، وادیارە چەکدارە کوردەکان لەکەنیسەکە هەڵاتن و ئەمەش ئەزمونێکی تاڵ بووە لەسەر دڵیان، بەزۆرمان دانابوون بەلاّم دیار بوو تەنها یەك دوانێك بوون.

ئەمرۆ هەزوو کوردەکان تەقەیان لەبنکەیەکی پۆلیس کرد لەگەڕەکێکی مەدەنی هەروەها تەقە لای گردی (شەربێل)ی لای مەکەزەوە دەهات. پۆلیسەکان ترسان هەر زوو هەلاّتن بەرەو بارەگای قونسوڵیەی لای شەقامەکەی موساو گریگۆر، لەوێ ڕێگەیان دا بچنە قونسوڵیەکە. کاتێ من ئەوەم زانی نەمویست قونسوڵیەکە ببێتە پەناگەی پەنابەران بەلاّم ئەم پۆلیسانەمان بەبیانووی پاراستنی بەڕێوەبەرایەتیەکەمان قبوڵ کرد. لەناو پەنابەرانی قونسوڵیە مفەوەزێکی پۆلیس و دە کەسی لەهێزەکانی پۆلیس لەگەڵ دابوو، پێشتریش والی ٤ پاسەوانی بۆ ناردبوون، بەمەش هێزەکەی لای ئێمە بووە ١٤هێزێکی چواردە چەکداری باش، راستە ئەمانە لای ئێمە پەناهێندەن بەلاّم لەکاتی پێویست دەتوانین بۆ بەرگری لەخۆمان بەکاریان بهێنین، بەتوندی فەرمانمان بەو چەکدارانەی لای خۆمان دابوو لەتەقە کردن دەست پێشخەری مەکەن هەتا ئەوان یەکەم جار هێرش نەیەنن، نزیکەی کاتژمێر چوار بوو چوار سەرکردە هاتنە لامان مەلاو ئاغاو فەقیر(موریدی شێخ . وەرگێڕ) وەفدێك بوون داوایان لەقونسوڵیەکرد پێشوازی و پارێزگاریان لێبکاتّ، ئەو سێ شێخەش بریتی بوون لە سەید عەلی بێدەنگی خراپی خێزان و ئەو مەلا سەلیمەی گیرابوو چونکە پڕوپاگەندەی دژی حکومەت کردبوو بەلاّم لایەنگرانی لەڕێگەی بەدلیس ئازادیان کرد (پێشتر لە٩ی مانگ قسەم بۆکردبوون) لەگەڵ شێخ شەهابەدین کەبڕیاربوو

لەحالەتی سەرکەوتنی شۆڕشگێڕان بکرێتە حاکم، پێم وتن( من قونسوڵی نیمو بەتەنها لەکاروباری دارایی بەرپرسم لەگەڵ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم تەلارە) ئێستاش ناتوانم بروسکە بکەم بۆباڵوێزخانەی بەریتانی لەئەستەنبوڵ هەتا لەبۆچوونی ئەوان تێبگەم لەسەر ئەو کێشەیە چونکە ئێستا پەیوەندی پچڕاوە، ئەگەر دەتانەوێ حکومەتی بەریتانی بتان پارێزێ، من پێتان دەڵێم ناتوانێت زەمانەتی ئێوە بکات چونکە ئێستا ئێمە خۆمان لەژێر رەحمەتی دەسەڵاتدارانی ئەم دەڤەرەین لەو شارەدا، ئێوە بێنە لای ی، قونسوڵیە ژیانتان باش نابێتو مەترسی کەمتر نابیت لەئەو کاتەی ئێستا تێیدان.

ئەو کوردانەی رژابوونە شار بەشێوەیەکی گشتی چەکدار نەبوونو شمشێریان هەڵگرتبوو چونکە موحەمەد کاتی خۆی هەڵی گرتبوو بۆ لەناوبردنی دوژمنەکانی، ئەوانە سەرکەوتنیان لەخوا دەویستو ببوونە قوربانی وتارە کاریگەرەکانی شێخەکانیان، هەرگیز شێخ شەهابەدینو سەید عەلی نەهاتوونەتە بەدلیس، لەسەرەتاوە شۆڕشگێرانی کورد رایانگەیاند دژی حکومەت شەڕدەکەینو گاورەکانیان دڵنیاکردەوە کەپارێزراون، قەناعەتم وایە ئەمە تاکتیکی ئەوان بێت بۆ بێلایەنکردنی ئەرمەن، چونکە بەگشتی ئەرمەنەکان چەکدارنو دەیانتوانی لەپەنجەرەی ماڵەکانیانەوە تەقە لەشۆڕشگێڕان بکەنو زیانی گەورە بەلایەنی کوردی بگەیەنن، بۆیە گەڕەکە ئەرمەنیەکان بۆ هاتووچۆی شۆڕشگێڕان لەگەڕەکە کوردیەکانی ناوچەی بەدلیس زیاتر ئەمین بوون، یازدە کەس لەشۆڕشگێڕان هاتنە ماڵە کوردێکی دراوسێمان هەتا بیکەنە بنکەی هێرش بردنە سەر هێزەکانی حکومەت بەڵام دراوسێ کوردەکە نیگەران بوو چونکە دەترسا ببێتە ئامانجی هێزەکانی حکومەتو ماڵەکەی بدەنە بەرتەقە، ئەو کوردانە لەرێڕەوی ماڵی ئێمە پەڕینەوە لەرێی گەڕەکی ماڵە ئەرمەنەکانەوە

هەموومان تەماشای ئەو هەموو شۆڕشکێڕەمان دەکرد، ئەمڕۆ ٢ی نیسان نزیکەی ٣کەس لەپیاوانی جەندرمەو سوپا کوژران، پێدەچێت هەتا ئێستا ژمارەی پێکراوان گەیشتبێتە نزیکەی ١٠کوژراوو ژمارەیەك برینداد لەکوردان هەبووە، ئێستا حکومەت هەموو ئەو کوردانە دەگرێ کە لەکوژراوەکان بێت یان لەبریندارەکان یان لەخەڵکی مەدەنی.

ئەمە بەشێکە لەنامەی ٣٠ی نیسانی ١٩١٤:.

بارودۆخی شار ئارامەو هێزەکانی حکومەت سەرقاڵی چالاکین، لەناوچەی شۆڕگێڕەکان چەندین کەسیان گرتووەو هێناویانەتە بەدلیس، وادەزانم ئێستا ژمارەی کوژراوان گەیشتۆتە ١٠٠کەس، لەسەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە بیستوومە گیراوەکان بەشێوازێکی وەحشیگەرانە لێیان دەدرێ، هەر گیراوێك دەبێت ١٠٠تا ١٥٠٠ جەڵدەی لێبدرێ، ناوبەناو پزیشکی سەربازی دەچێتە لایان هەتا دڵنیابێت ماون و بەرگەی لێدانیتر دەگرن یان نا...ڕۆژی پێنج شەممەی ڕابردوو بڕیاری گرتنی شێخ بەهائەدین درا، لەبۆنەی پیرۆزبایی هاتنی سوڵتان بۆ عەرش بینیم و ئەو هەواڵەی پێدام. دەبوایە ئاگاداری ئەوەبین ئەگەر شۆڕش سەرکەوتووبوایە شێخ شەهابەدین حاکم دەبوو، هەتا ئێستا مەلا سەلیم لەقونسوڵیەتی ڕووسی پەناهەندەیە گوێم لێبوو هەندێ لەلایەنگرانی لەهەوڵی هەڵاتن دابوون، بەڵام بێئاکام بوو، واچاوەڕوان ناکرێ قونسوڵیە لەبەدلیس بیهێڵێتەوە چونکە من پێم وایە ئەو بارودۆخە شتی وا قبوڵ ناکات....

دڵسۆزتان

خزمەتکاری زۆر گوێڕایەڵتان ج. ایج، ماینهان. ی، قونسوڵیەتی بەریتانی .

# وان ١٦ـ مایسی ١٩١٤، پاشکۆی ١١

لەدەست پێکردنی بزووتنەوەی مەلا سەلیم جۆرێك لەگەڕەلاوژە هەیە، بەپێی بەڵگەنامەی یەکەم راپەڕین وەکو بەشێکی گشتی شۆڕشی کوردان دەبوایە لەمانگی نیسان دەستی پێکردبایە، بەڵام هیچ کام لەبەڵگەنامەو سەرچاوەکان ئەوەی دیاری نەکردووە، کێ‌ئەو شۆڕشە بەرفراوانە بەئەستۆ دەگرێ، پەیوەندی لەو جۆرەی نێوان کوردان وا ئاسان نەبوو قونسوڵی بەریتانی لێی بێ‌ئاگا بێت چونکە ئەو پەیوەندی لەگەڵ هەموو هێزە کوردیەکان هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوو بەڵگەنامەیە زۆر بەدرێژی چونەتە ناو رووداوەکان..

مەکدواڵ قەناعەتی وایە راپەڕینی مەلا سەلیم بەشێکە لەنەخشەی رووسی بۆدروستکردنی پەشێوی لەناو دەوڵەتی عوسمانی، هەندێ لەنووسەرە تورکانیش پشتگیری ئەو بۆچوونە دەکەن، چونکە مەلا سەلیم‌و هاوڕێکانی خۆیان داوەتە دەست قونسوڵیەتی رووسی‌و ئەوانیش نەیانهێشتووە بکەونە دەست دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەسەر ئەمە ئەو قەناعەتەیان دامەزراندووە(٩٨) بەڵام ئەو بەڵگەنامەی سەرەوە ئەوە دەگەیەنێت ئەوکارەی مەلا سەلیم بێ‌نەخشە بووەو لەئاکامی بێ‌پشتیوانی هۆزەکوردەکان(هەتا خەڵکی بەدلیس)یش پەنای بۆ ئەوێ بردووە. لەبەڵگەنامەی یەکەمدا بەدیار دەکەوێ کەمەلا سەلیم یەکەم جار پەنای بردۆتە بەر قونسوڵیەتی بەریتانی بەڵام ئەوان رازی نەبوون پەنای بدەن‌و بەناچاری بڕیاری داوە بچێت قونسوڵی رووسی بیپارێزین لەکاتێکدا

قولسولّی بەریتانی چاودێری قونسولّی رووسی دەکرد، بەبایەخەوە لەکاری ئەوان وورد دەبۆوە، هەردوو بەڵگەنامەی پێشوو پشتگیری ئەو بۆچوونە ناکەن بەوەی ئەم جولانەوەیە دەستکردی رووس بێت. گەرچی باس نەکردنی رۆڵی روس لەو دوو بەڵگەنامەیە نیشانەی تەواوی دەست تێوەرنەدانی رووس نیە لەو مەسەلەیە.

بەووردبوونەوە لەو بۆچوونەی باس لەدەستێوەردانی رووسی دەکات لەو راپەرینە ئەوە یەکەم جار بۆچوونی لازاریف وەربگرین کەپشت دەبەستێت بەبەڵگەنامەی رووسی، لەناوچەیەکی نزیك بەخێزانی سەر بەبەدلیس بەرپرسانی تورك مەلا سەلیم دەگرن و مریدەکانی تەریقەتی نەقشبەندی دەتوانن رزگاری بکەن ئەمە لەماوەیەکی کەم بووە هۆی راپەرین لەهەموو بەدلیس، ژمارەی شۆرشگێران گەیشتە ٨٠٠٠ هەزار موجاهیدو بەرەو بەدلیس بەرێکەوتن و داگیریان کرد، داوان دەکرد ( شەریعەت جێبەجێ بکرێ و حوکمی ئیتحادیە تورکەکان لابرێ بەرای کورد دیکتاتۆرن و ناتوانن بەرگری لەخاکی ئیسلامی بکەن و سەرشۆری کافرانن). هەروەها لازاریف دەڵێ:

لەسەرەتای راپەرینەکە ئیتحادیەکان هەلۆێستی چاوەروانیان وەرگرت و خۆیان لێپاراست بەو هیوایەی بزووتنەوەی کورد بەئاراستەی دژایەتی بزووتنەوەی چاکسازیەکانی ئەرمەن دا بروات بەلاّم هەرزوو بۆیان دەرکەوت بۆدژایەتی ئەوانەو بەو پەری توندی سەرکوتیان کرد. لەناوەراستی ئازار شۆرشگێرەکان توانیان هەموو ولایەتی بەدلیس رزگار بکەن و شاری بەدلیس لەهەموو لایەوە گەمارۆ درا بوو، ئەمە ناچاری کردن لەگەڵ شۆرشگێران بکەونە گفتوگۆ بەلاّم بێئاکام بوو، حکومەت بەرێنومایی

تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ ئەوپەری هەلوێستی توندو تیژی وەرگرتو والی گۆڕیو هێزی تری لەئازەربێجانەوە هێنا بۆ سەرکوتکردنی کوردان.

کوردەکان توانیبویان ئەو هێزە تێك بشکێننو لە٣٠ی نیسان چوونە شارەوەو شەرێکی گەورە لەنێوان هەردوولا رووی‌دا، حکومەت ناچاربوو لەموشەوە هێزێکی تر بهێنێ، شۆڕشگێڕان ٦٠ کەسیان لێکوژراو ٤ کەسیان لەهێزەکانی تورك کوشت، مەلا سەلیمو سێ لەهاوڕێکانی خۆیان دایە دەست هێزەکانی رووسی لەبەدلیس، حکومەت بەوپەڕی بێویژدانی کەوتە وێزەی شۆڕشگێڕان، زۆربەی سەرکردەکانی لەسێدارەدانو دەیانی لێگرتن، ئەو وەحشیگەریەی حکومەت بۆیە بوو گوایە کورد خیانەتیان کردووە بەلاّم لەوورەی کوردانی دانەبەزاند، یەکێك لەسەرکردەکانی شۆڕش لەبەردەم پەتی سێدارە دەلّێ ( ئێمە دلّخۆشینو مردنی ئێمە نزیکبوونەوەی مەرگی تورکانە). ئەم هەلّویستە بێشەرمانەیە بەرانبەر کورد بەلەسێدارەدانی سەرکردەکانی بەتایبەت شێخ شەهابەدین کەپیرۆزترین شێخی کوردستان بووە دەنگی ناڕەزایی لەهەموو گۆشەیەکی کوردستان دژی تورك بەرزبۆوە(٩٩).

هەروەها ئەو گێڕانەوەی سەرەوەی لازاریف ئەوە ناگەیەنێت رووس رۆلّی هەبوو بێت لەبزووتنەوەی مەلا سەلیم.

رووسو عەبدوڕەزاق نەخشەیان بۆ ئەم شۆڕشە دانەڕشتووە بەلّکو ئەم شۆڕشە بەشێك بووە لەشۆڕشێکی بەرفراوانی کوردی کەلایەنە کوردیەکان نەخشەیان بۆ داڕشتبوو(بەو پێیەی لەبەلّگە نامەکاندا هاتووە). لەو ئەدەبیاتە نوسراوە سنووردارانە سروشتی پەیوەندی نێوان لایەنە کوردیەکانو شێخەکانی خێزانی تیانیە، زیاتر واچاوەڕوان دەکرێ جۆرێك لەپەیوەندی هەبووبێت لەنێوان نەوەکانی بەدرخانو مەلا سەلیمو شێخ

شەهابەدین و سەید عەلی. ساڵی ١٩١٣ (وەکو دواتر باسی دەکەین) ساڵی نەخشە داڕشتنی شۆڕشی کوردان بووە دژی ئیتحادیەکان، پەیوەندی نێوان شێخەکانی خێزان بەبزاڤی کوردی دژ بەئیتحادیەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٨ (باسل نیکتین) ئەو کاتە قونسوڵی رووسیا بووە لەکوردستان دەڵێ: مەلا سەلیم ئەندامی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بوو(١٠٠) .زۆر دەگونجێ ئەمە راست بێت چونکە بەدلیس مەڵبەندی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی و لەبەهێزترین مەڵبەندی ئەو کۆمەڵەیە بووە لەکوردستان ، هەر لەبنەڕەتەوە لەوێ شێخانی تەریقەت و زانایانی ئیسلام دەورەیان لێدابوو. وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا کۆمەڵە کوردیەکانی ئەستەنبوڵ زۆر مەبەستیان تەکیەو مەڵبەندە ئیسلامیەکان و مزگەوتەکان بووە، چونکە رێگەیەکی کاریگەر بووە بۆ کوردایەتی لەناو جەماوەری کورد.

بەڵگە نامەی یەکەم باس لەنەخشە سەرنەگرتووەکەی کوردان دەکات لەبەشی رۆژاوای بەدلیس، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەخشەی لەپێشتری شۆڕشگێڕان لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەر، راپۆرتی قونسوڵی بەریتانی بەنووسراوی ٧ی کانونی دووەمی ١٩١٤ باس لەسەردانی هەریەك لەمەدحەت بەگ و حوسێن بەگ و عەبدولکەریم بەگ نەوەکانی بەدرخان دەکات بۆلای پیاوماقوڵان و شێخانی کوردو لەناویاند بۆلای شێخانی بەدلیس هەتا هانیان بدەن بۆ بەرپاکردنی بزوتنەوەیەکی بەرفراوان دژی ئیتحادیەکان، دوای لەناوچوونی شۆڕشەکە تەلعەت پاشا داوای لەحکومەتی رووسی کرد عەبدورەزاق تەسلیم بکات و سزای سمکۆ بدات چونکە دەستیان هەبووە لەبزوتنەوەی بەدلیس(١٠١)، دوور نیە شێخ شەهابەدین و مەلا سەلیم و کوڕانی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری نەهری لەسەر ئەوە رێکەوتبن، بەلگەنامەی یەکەمیش ئەوەی تیایە مەلا سەلیم

چەندین جار چۆتە ئەستەنبوڵ هەتا چاوی بەبەرهەڵستکارانی ئەویٚ بکەویٚ، کەچی بزوتنەوەکەی لەبەر هۆکاری خۆیی تەقیەوە(هەروەکو بەڵگەنامەی یەکەم ئاماژەی پێدەکات) ئەمەش ئەوە ناگەیەنیٚ کەسەعاتی سفر هەبووە لەنێوان شێخانی خێزانو کوڕانی بەدرحان، بەڵکو زیاتر رێکەوتنی گشتی بووە.

سەبارەت بەئامانجی راپەرینەکەش هەمان ئیشکالیەت هەیە، توێژەرەوە رۆژاوایی و رووسەکان و نووسەرە کوردە عەلمانەکان پێکەوە ئەم ئیشکالیەتەیان دروست کردووە، کۆلای بەپشتبەستن بەرای جەلیلی دەڵیٚ بزووتنەوەی مەلا سەلیم (چوارچێوەیەکی ئیسلامی و بەناوەرۆك نەتەوەیی هەبووە)(١٠٢) ئەم خوێندنەوە عەلمانیە بۆ جیهادی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی وەکو شێخ شەهابەدین و مەلا سەلیم و شێخ سەعیدی پیران بەوەی بەرگریان لەبیروباوەرەکەیان کردووە نابابەتیە، چونکە ئیسلام و کوردایەتی لەلای جیلی رۆژانی ئەوان وا بەئیزدیواجی سەیری نەکراوە، بەڵکو هەردووکیان لەو رۆژگارە وەکو دوو دیوی یەك دراو وابووە، پێشتر ئاماژەمان بەراپۆرتی(بیرترام دکسۆن)ی قونسولی بەریتانی کرد لەسەردانەکەی ساڵی ١٩٠٩ز بۆ کوردستان دەڵیٚ لەکوردستان لەسلێمانی هەتا وان ناڕزایی هەیە لەسەر لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید و گۆشەگیرکردنی رۆڵی شەریعەت لەلایەن ئیتحادیەکانەوە. لازاریفیش لەمە پشتگیری لەهێزا دکسۆن دەکات(١٠٣) ئەمەش لەهەنگاوی یەکەمدا بەروونی لەداواکاری شۆڕشگێڕاندا هاتووە :

١. دەرکردنی کاربەدەستە خراپەکانی توورك لەولایەتی بەدلیس.

٢. گەرانەوەی تەواو بۆ پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامی.

خراپی ئیداری خەمی گەورەی شێخەکان و هەموو خەڵکی بووە.

(مالمسانین) لەلاپەڕە ٦٣ـ ٦٤ی کتێبی ناوبراودا لەسەر زاری سەید مستەفای نوێنەری ئەرزڕۆم لەئەنجومەنی تورکی(ساڵی ١٩٢٣) دەگێڕێتەوە: کەمەلا سەلیم بەر لەسێدارەدانی وتوویەتی : ئەی تورك لەسێدارەم دەدەن لەسێدارەم بدەن بەڵام ئێوە شایستە نین بەبەڕیوەبردنی وڵاتی من. هەموو زەمینەیەکمان بۆڕەخساندن چۆن ئیدارەی وڵاتی من دەگێڕن؟ ئێوە چاك ئاگادارن بەسروشتی بەڕێوەبردنی ئەم سەردەمە، ئێوە لەلای ئێمە خۆتان بەناتەواو نازانن، کێ زیانی لێدەکەوێ؟ بەڕێزان ئێوە بەدلیس بدەن بەئێمەو دەسەڵاتی خۆتان بکێشنەوە، ئەگەر لەئێوە باشتر بەڕێوەمان نەبرد لەگەردنمان بدەن.

(مالیسانین) لەهەمان کتێب و لەلاپەڕە(٦) لەکارۆساسونی نووسەری کتێبی(پەیوەندیەکانی کوردو ئەرمەن) بۆمان دەگێڕێتەوە کەمەلا سەلیم پێشتر چاوی بە(وارتانی راهیب)ی ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی تاشناقی ئەرمەنی و کەسایەتیەکانی‌تری ئەرمەنی کەوتووە، لەسەر ئامانجی شۆڕش لەگەڵیاندا رێککەوتبوو:-

١ـ ئەم وڵاتە تایبەتە بەکوردو ئەرمەن. ٢ـ کوردستان حوکمی زاتی فراوانی هەبێت. ٣. ئەرمەن و کورد ئیدارەی کوردستان بگێڕن.

لەبەر دوو هۆ دەگونجێت ئەمە راست بێت: یەکەمیان ئەمە لەگەڵ راپۆرتی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی(بەڵگەنامەی دووەم) تێك دەکاتەوە کەلەکاتی هێرشی سەر بەدلیس جۆرێك لەلێك تیگەیشتن هەبووە لەنێوان کوردو ئەرمەن. دووەم رێڕەوی بەرنامەی شێخ عوبێدوڵلاو سەرکردەکانی تری جولانەوەی کوردان لەسەدەی نۆزدەهەم هەروابوو، سوور بوون لەسەر دۆستایەتی ئەرمەن( هەر هیچ نەبێت لەململانێی لەگەڵ ئیتحادیەکان

بێلایەن بن) سیاسەتی مەلا سەلیم لەسەر نەخشەی کۆمەڵە کوردیەکان بووە کە ئامادەبوون هەموو زەمانەیەك بدەن بەمەسیحیەکانی کوردستان و رایانگەیاندووە ئامانجی بزووتنەوەی کوردایەتی رزگار بوونە لەزوڵم نەك کوشتاری مەسیحیەکان. سەرەڕای ئەمەش کولای لەمێژوونووسی تورکی دەگێڕێتەوە کەئەرمەنەکان لەسروشتی ئیسلامەتی بزاڤەکەی مەلا سەلیم نیگەران بوون و لەکاتی شەڕ بۆ بەرگری لەدامەزراوەکانی حکومەت پشتگیریان لەحکومەت کردووە لەناو شاری بەدلیس چەکیان هەڵگرتووە(Ittihat Ve Terraki. P.169) لەبەڵگەنامەی یەکەمدا لایەنی ئابووریش هەیە، ئیتحادیەکان باجی زیاتریان خستبووە سەر مەڕومالاتی کوردستان. ئەمە بۆکومەڵگای ئەو کاتەی کوردستان زۆر جێی بایەخ بووە. چونکە سامانی ئاژەڵی بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگای کشتوکاڵی ئەو کاتەی ژیانی ئابووری کوردستان بووە، هەروەها نابێت خۆ لەوراستیە ببوێرن کەتەکیەکانی نەقشبەندی لەخێزان مەڵبەندی دەسەڵات بوون لەکۆمەڵگای کوردستان و ئیتحادیەکان بەرنامەی لەناوبردنی هەموو ناوەندەکانی هێزی تەقلیدی ناو دەوڵەتی عوسمانیان دارشتبوو، لەگەڵ بنیاتنانی دەوڵەتی شێوە رۆژاوایی زیادەڕۆ لەمەکەزیەت، ئیتحادیەکان لەدوای گەڕانەوەی دەسەڵاتیان بۆبەدلیس بەربوونە شالاوی کوشتن و کوشتاری شۆڕشگێڕو هاولاتیە بێچەك و گوندنشینەکان بەبێ جیاوازی. ئەحکامی عورفیان راگەیاند، کەوتنە داخستنی هەموو مەڵبەندەکانی تەریقەتی سۆفیگەری لەکوردستان و پەیوەستکردنی راستەوخۆیان بەوەزارەتی ئەوقاف(١٠٤).

بەچاوخشاندنێکی خێرا دەگەینە ئەو ئاکامەی هەردوو جولانەوەی شێخ سەعیدی پیران و مەلا سەلیمی بەدلیس یەك سروشت و ئامانجیان هەبووە لەوەی هەردووك لەلایەن شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیەوە سەرکردایەتی

کراون‌و ئامانجیان بەرگری لەشەریعەتی ئیسلام بووەو لەلایەك هێرشی عەلمانیە تورکانەوە وەحشیگەرانە سەرکوتکراون، هەروەها لەهەدوو بزووتنەوەکە توێژە نیشتیمانیەکان لەگەڵ شێخانی تەریقەت‌و زانایانی ئیسلام پێکەوە کۆبوونەوە بۆ سازدانی بزووتنەوەیەك کەمەزلۆمیەتی کوردو شەریعەتی ئیسلام پێکەوە گرێبدات، سەرەڕای زۆر خاڵی تری هاوبەش، هەردوو جولانەوەکە بەناوی جیهادەوە بووە، لای مەلا سەلیم (خۆبەختکارانی ئیسلام =فدائی ئیسلام) ناوی راپەڕیوەکان بووەو بە شێخ سەعید دەوترا (میری موجاهیدان) یان وەکو خۆی دیوت(خزمەتکاری موجاهیدان)، هەردولا دەسەڵاتی مەرکەزیان بەبێ‌دین‌و دوور لەشەریعەت ناودەبرد، هەردوولایان لەبەدیهێنانی ئامانجەکانیان سەرنەکەوتن، هەردوو بزووتنەوە بەر لەکاتی دیاری کراوی خۆی تەقیەوە، هەردوو بزووتنەوە بەهۆی نابەرانبەری چەك‌و تەقەمەنی لەبەرانبەر دەسەڵاتی توورکی نوشستیان هێنا، هەردووك سیمای لادێیان بەسەرەوە بووە. مەلا سەلیم نەیتوانی پشتگیری تەواوی خەڵکی بەدلیس بەدەست بهێنێ ئەمەو دوای ١٢ساڵ شێخ سەعیدیش لەرزگارکردنی شاری دیاربەکر نوشستی هێناو نەیتوانی پشتگیری خەڵکی شار مسۆگەر بکات، هەردوو سەکردەش دوای هەوڵی سەرنەکەتوانە لەهەڵاتن بۆ ئێران گیران‌و لەسێدارە دران.

ئەمانە بەڵگەن لەسەر بێسەرەوبەرەیی هەردوو جولانەوەکەو نەبوونی رێککەوتن‌و رێکخستنی پێشتری نێوان ئەوان‌و قسەڕۆیشتوانی شارە کوردیەکان. ئەم دیاردەیە بەدرێژایی سەدەی بیستەم وەکو نەخۆشیەکی درم هەروا مایەوە. سەرکردەو مریدو شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی باجێکی زۆریان دا لەپێناو کوردایەتی‌و نەیانتوانی شتێك بەشتێ بکەن(*)، بەداخەوە لەم بیست ساڵەی دوایی تەکیەو رێڕەوی سۆفیگەری لە(بنجۆل)

لەكوردستانی باكور خیانەتێكی گەورەیان بەو كەلەپورە جیهادیە كرد كەدەبوایە بەئاوی زێڕ بنوسرابایەوە، بەوەی مەڵبەدەكەیان كردە بڵندگۆی بانگەوازی تۆرانیەت، هەروەها هەندێ لەو مەڵبەندو تەكیانەی كوردستانی عێراقیش ببوونە سەرچاوەی هەڵخلیسكان و دواكەوتوویی و فاڵچیەتی.

## ـ ٤ ـ

# شێخ عەبدولسەلامی بارزان

بزاڤی شێخ عەبدوسەلامی بارزان رووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە بووە لەبەرانبەر دەسەڵاتی ئیتحادیەکان لەکوردستان، چونکە رێگەی ئیسلام و جیهادی گرتبوە بەر لەبەرانبەر ئەو دەسەڵاتە مەرکەزیەی عوسمانیەکان کە لە شەرعیەتی لەئیسلامەوە سەرچاوەی نەگرتووە بەوەی نوێنەرایەتی خەلافەتی ئیسلامی ناکات، هەروەها دەسەڵاتی لەسوڵتان داڕنیووەو یاسای دەستکردی رۆژاوای لەجێگەی رۆڵی شەریعەت پیادە کردووە. سەرەڕای ئەمە جولانەوەی بارزان بەرەنگاربوونەوەی گەورەی کوردانە بووە لەبەرانبەر دەوڵەتی تۆرانی و دەگونجا کاریگەری هەبوایە بەسەر هەموو پارچەکانی کوردستان و ببوایە جۆشدانی عەرەبەکان (هەر هیچ نەبێت عەرەبەکانی عێراق) بەوەی کورد مەترسی گەورە دروست دەکەن لەسەر قەوارەی عوسمانی.

گەرچی ئێرە جێی باسکردنی مێژووی بارزانیەکان نیە بەڵام پێویستە کورتەیەك لەمێژووی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی باس بکەین، لەبارەی مێژووی بارزانیەکانەوە هێژا مەسعود بارزانی دەڵێ:_ ناوی هۆزی بارزان دەگەڕێتەوە بۆ گوندی بارزانی مەڵبەندی شێخانی بارزان، ئەوانیش دەچنەوە سەر زنجیرەی خانەوادەی ئامێدی، لەسەردەمی باپیرەگەورەمان مەسعود ناوێك دابەزیونەتە گوندی (هەفنکا)ی نزیك بارزان و لەوێ نیشتەجێبوون. لەسەردەمی یەكێك لەکوڕەکانی بەناوی شێخ تاجەدین کەزانایەکی گەورەو پیاوێکی کارامە بووە خەڵکێکی زۆری لێ کۆبۆتەوەو بەمریدەکانیەوە هاتوونەتە بارزان و لەوێ تەکیەی دامەزراندووە. لەدوای

مردنی شێخ تاجەدین شێخ عەبدوڵڵای کوڕی کەبەخواناسی و دینداری ناسرا بوو جێگەی باوکی گرتۆتەوە.. لەسەردەمی خۆیدا شێخ عەبدوسەلامی کوڕی دەنێرێتە خوێندنگا و لەسەر دەستی شێخ تەهای نەهری فێری زانست بووە، حەزرەتی شێخ مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەسەردانێکی بۆ تەکیەی بارزان شێخ عەبدوسەلامی کردۆتە خەلیفەی خۆی . لەساڵی ١٨٧٢شێخ عەبدوسەلام دەمرێ، شێخ موحەمەد جێگەی دەگرێتەوە بەشێخێکی خواناس و دیندار ناسرا بوو هەتا لەوەرعدا خەڵك بەنمونە ناویان هێناوە . لەسەردەمی ئەو تەکیەی بارزان ببووە پەناگە بۆ مەزڵوومانی هۆزەکانی دەورووبەری بارزان، لەبەر ئەمە بووە سەرۆك هۆزەکان لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی شکاتیان لەشێخ موحەمەد کرد. شێخ پێنج کوڕی لەدوا خۆی بەجێهێشت. (شێخ عەبدوسەلام، شێخ ئەحمەد، موحەمەد سدیق، بابۆ، مەلا مستەفا)(١٠٥).

ئەو عەبدوسەلامەی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی دەکەین نەوەی شێخ عەبدوسەلامی یەکەمە، کەپیاوێکی چاکسازو چاپوك بووە. بەتاوانی لادان لەئیسلام لەلای سوڵتانی عوسمانی تاوانبار کراو گیراو دوور خرایەوە بۆموسڵ، هەتا ٣٠٠کەس هێرشیان بردە سەر موسڵ بەڵام ئەوانیش گیران و زۆربەیان خراْنە بەندیخانە.. هەروەها خۆی و شێخ موحەمەدی کوڕی زۆر بەرگریان لەجوتیاران کردووە کەلەژێردەستی ئاغاکان بەتایبەت ئاغاکانی زێبار دەچەوسانەوە، بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی بەناوی(دێوانە) لەو سۆفیانە پێك هێنابوو هەتا ببنە هێزێك بۆ دانانی سنوور لەبەردەم زوڵمی ئاغاکان و ئەوانی پیٚچاوترسێن دەکرد. هەروەها لەرۆژانی شێخ موحەمەد سدیقی کوڕی شێخ عوبێدوڵڵا شێخ مومەمەد کەوتە شەڕەوە لەگەڵ شێخانی شەمدینانی نەهری. هەردوولا(نەهری و زێبار) ناچاربوون

بەشی لای راستی زێی گەورە بەجێبهێڵن. وای لێهات سنووری شێخ نشینەکەی فراوان بوو بۆ ئەمارەتێك کەهەموو گوندەکانی زێبارو شێروان و مزووری دەگرتەوە. ئەمە بووە هۆی نیگەران بوونی ئاغان، لای دەسەڵاتداران لەموسڵ عەبدوسەلامیان تاوانبارکرد بەوەی دڵسۆز نیە بۆ سوڵتان و ئەویش دووری خستەوە بۆ بەدلیس.

شێخ عەبدوسەلام لەسەر رێبازی باوکی دەڕۆیشت هەتا بووە پیاوێکی ئیسلاحی ئاینی و سەرکردەیەکی نیشتیمانی، بەهەنگاوەکانی شێخنشینی بارزانی زیاتر فراوان و زیندووکردەوە، لەگرنگترین هەنگاوەکانی:

١- هەڵوەشاندنەوەی خاوەنداریەتی زەوی.

٢-دابەشکردنەوەی زەوی بەسەر جوتیاران.

٣- هەڵوەشاندنەوەی مارەیی زۆرو بەشوودانی بەزۆرەملێ.

٤- رێکخستنەوەی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنەڕەتی دادگەری و یەکسانی.

٥- دروستکردنی مزگەوت لەگوندەکان هەتا ببێتە شوێنی خواپەرستی و مەڵبەندێکی تازە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی و رووحی و سیاسی خەڵکی ناوچەکە.

٦- نزیك خستنەوەی زانایانی زۆربەی ناوچەکانی بادینان لەخوێندنگای بارزانی ئیسلامی هەتا کارگەیشتە شۆڕشێکی زانستی لەناوچەکە، شێخ رێزی لەزانایان دەنا و لەزۆربەی کاروباری سیاسی و زانستی شێخنشینەکەی راوێژی پێدەکردن(١٠٦).

شێخ عەبدوسەلام لەدوای مردنی شێخ موحەمەدی باوکی لەساڵی ١٩٠٢ لەماوەی پێنج ساڵی یەکەم لەسەر رێڕەوی باوکی سەرقاڵی پتەوکردنی ناوخۆیی میرنشینەکەی و فراوانکردنی بووە، یاریدەدەری قونسوڵی

بەریتانی لەدیاربەکر راپۆرتێکی لەسەر شێخ عەبدوسەلام نووسیوەو دەڵێ:-

لەم سالآنەی دوایی لەناوچەکە ئیسلاحیەکی کۆمەلآیەتی بەناوی شێخی بارزان پەیدا بووە، شوێنکەوتووی لەهۆزە کوردیەکانی واروماو شێروان هەیە، سەرکەوتوو بووە لەسەرکردایەتی کردنی هێرشەکانی بۆ سەر شێخە بچوکەکان و هەندێکی بەئەوانیتر لەناوبردووە، شێخ ئێستا ١٥٠٠ چەکداری دڵسۆزی لەشوێنکەوتوانی خۆی هەیە، لەنەخشە چاکسازیەکانیدا جەختی دەکاتە سەر نەهێشتنی دەسەلآتی ئاغاکان و یارمەتی و پشتیوانی لەهەژارو چەوساوان دەکات لەگەڵ بلآوکردنەوەی ئاشتی و ئارامی، ماڵی ئاغاکانی تالآن کات و بەسەر گوندنشینەکانی دابەش دەکات، قەلآو قایمکاری ئاغاکانی نەهێشت، لەجیاتی حکومەت باجێکی گونجاوی وەردەگرێت. بەڕاستی شێخ عەبدوسەلام باشترین شێخی ناوچەکەیە، هەتا ماوەیەکیش هیچ گرفتێکی لەگەڵ حکومەتدا نەبووە، دادگەرانە مامەڵەی لەگەڵ رەعیەتەکانیدا کردووەو مەسیحیەکانی پاراستووە[١٠٧].

شێخ عەبدولسەلام لەساڵی ١٩٠٧ ئامادەی کۆنگرەی سەرۆك و شێخە کوردەکان بوو لەشاری دهۆك بەسەرۆکایەتی شێخ موحەمەد نوور قادری، بەمەش شێخ عەبدوسەلام کەوتە چالاکی سیاسی و بەرگری لەمافی کورد، هەروەها لەپشت ئەو بەڵگەنامەیە مێژوویەوە بوو کەلەو کۆنگرەیە دەرچوو، دەڵێ:-

١-لەقەزاکانی دهۆك، زاخۆ، ئاکرێ، ئامێدی زمانی کوردی بکرێتە زمانی رەسمی.

٢-خوێندن لەناوچەی بادینان بەزمانی کوردی بێت،

٣- بەڕێوەبەرو فەرمانبەرەکانی ناوچەی بادینان لەو کەسانە بن کوردی

دەزانن.

٤-باجی بەرانبەر خزمەتی سەربازی وەکو خۆی بمێنێتەوەو دەبێت حکومەت پارە خەرج بکات بۆ چاککردنی ڕێگاو کردنەوەی قوتابخانە لەناوچەی بادینان.

٥- حوکمو دادگەری لەناوچەی بادینان بەپێی شەریعەتی ئیسلام بێت.

٦- وەرگرتنی باج بەپێی شەریعەتی ئیسلام بێتو ئەو باجانە لابرێت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام تێك دەگرێ.

٧- قازیو موفتییەکانی بادینان سەر بەمەزهەبی شافیعی بن(١٠٨).

هەردوو بەڕێزان مەسعود بارزانیو بیرەش لەدملۆجی دەگێڕنەوە ئەو مەزبەتەیە بەئیمزای شێخ عەبدوسەلام نێردراوە بۆ شوێنە بالاکانو ئەنجومەنی نوێنەرانو پیاوماقولان، دانەشی لێنێردراوە بۆ شێخ عەبدولقادری نەهریو ئەمین عالی بەدرخانو شەریف پاشا ئەوانەی ئەوکات سەرۆکی کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردیەکان بوون. من گومانم لەوە هەیە، چونکە ئەگەر ئەو دوو بەڵگەنامەیە لەسەر قسەی هەردوو بەڕێزان لەساڵی ١٩٠٧ نوسرابێت (دملۆجی ساڵی ئامادەکردنی بەڵگەنامەکەی دیاری نەکردووە) ئەوکۆمەڵەو ڕێکخراوانەی ناوی بردوون (کۆمەڵەی هاوکاریو پێشکەوتنو کۆمەڵەی هیڤی) ئەو کاتە دانەمەزرابوون بەڵکو ئەوانە لەدوای شۆڕشی دەستووری ساڵی ١٩٠٨ دامەزران، هەروەها بەڕێزان سەید عەبدولقادری نەهریو ئەمین عالیو ژەنەراڵ شەریف پاشا ئەوکات لەئەستەنبوڵ نەبوون، دەگونجێت ئەو بەڵگەنامەیە لەساڵی ١٩٠٨ ئامادەکرابێت یان نەنێردرابێت بۆ ئەو کەسانەی ناویان هاتووە، هەروەها ساڵی ١٩٠٧ هەردوو ئەنجومەنی نووێنەرانو پیاوماقولان نەمابوونو

سـولْتان عەبدولحەمیـد هەڵیوەشـاندبوونەوەو لەسـاڵی ۱۹۰۸ دووبـارە دایمەزرانـدەوە. (مەکـدواڵ)یـش پێـی وایـە نـاردنی ئـەو مەزبەتانـە دوای دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات بووە لەلایەن ئیتحادیەکانەوە)(۱۰۹) نـاوەرۆکی ئـەو مەزبەتانـە بەڵگەیـە لەسـەر سـەرهەڵدانی دەمـاری نەتەوایـەتی لـەبادینان لەناو زانایانی ئاینیو شێخانی تەریقەت، شێخ عەبدوسەلامیش پەیوەندی تایبـەتی هـەبووە بـەسمکۆو شـێخ عەبـدولقادری نـەهریو عەبـدوڕەزاقو ئەوکۆمەڵـە کوردیانـەی ناومـان بـردن، ئـەو حـەوت خاڵـەی کـوردان بـەڕوونی ئـــەوە دەردەخـــات کەپەیوەنـــدی پتـــەوی هـــەبووە لـــەنێوان خواســـتە نەتەوایەتیـەکانو سـووربوون لەسـەر پیـادەکردنی شـەریعەتی ئیسـلامی. زانایـانی بادینـان بۆچـی داوای چـێبەجێکردنی شـەریعەت دەکـەن؟ ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو نامەیـە ئاڕاسـەتەی ئیتحادیـەکان کـراوە لەسـەر دوورخستنەوەی ڕۆڵی شەریعەتو هێنانە ناوەوەی یاساو باجی ناشـەرعی بۆ ئەو ناوچەیە، بەرگری کـردنیش لـەماف کـوردان هـەر لەروانگـەی پابەنـدی بووە بەئیسلام، لەو کاتەی دملۆجی قایقامی ئامێدی دەبێت چاوی بەشێخ عەبدولســەلامی دەکــەوێتو پرسـیاری لێدەکـات لەســەر هۆکـاری ئــەو چـالاکیانەی بـەقانزاجی کـورد ئـەنجامیان دەدات، شـێخ دەڵـێ: (ئێمـە لەبـەجێهێنانی ئـەرکی ئاینی خۆمـان بـەولاوە هێچمـان نـەکردووە ، ئـەوەش دوورخســـتنەوەی زوڵمـــە لەســـەر گـــەلێکی چەوســـاوەو رزگـــارکردنی لەکۆیلایەتی)(۱۱۰).

مامۆستا (بیڕەش)یش بەدرێژی باس لەچالاکیە سەربازیەکانی ناوچەی بارزانی سالانی۱۹۰۸-۱۹۱٤دەکاتو ویستگە گرنگـەکانی بەرەنگاریمان بۆ دەخاتەڕوو. شەڕی پێرسی یەکـەم لـەپاییزی سـاڵی ۱۹۰۸ ئـەو شـەڕە کاتێك روو دەدات موحەمـەد پاشـای داغسـتانی والـی ئـەو کاتـەی موسـڵ شـێخ

عەبدوسەلام بانگ کردە موسڵ ئەویش ناچێت، حکومەتیش بەتاوانی یاخیبوون و پەیوەندی بەدەوڵەتێکی بێگانە(دەگونجێت رووس بێت) تاوانباری دەکات و بەناوی بزووتنەوەی جیاخوازی شەڕی لەدژی شێخ ڕاگەیاند. فازیل پاشا دوو فەوجی هێزی نیزامی و چەکی ڕەشاش و تۆپی ئامادەکرد بۆئەو هێرشە، مامەش و مەنگوڕ و خۆشناو و نێرۆیی و هورماری و گەردی و بێرەسنی و هەرکی هاوکاری حکومەت بوون بۆ سەر شوێنکەوتوانی شێخ عەبدوسەلام، لەدوای زیان گەیاندێکی گەورە بەهێزەکەی فازیل پاشا شێخ ناچار بوو بکشێتەوە بۆ شاخە سەختەکان و لەوێ خۆی وون کرد و داوای لەهێزەکەی کرد بەرگری نەکەن و بگەڕێنەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆیان. شەڕی (سەریی‌بان) ویستگەیەکی تری بایەخداری ململانێیە، شێخ لەناکاو بەدیارکەوت و لایەنگرانی کۆکردەوە بۆبەرەنگاربوونەوەی حکومەت، ئەمجارە ناکۆکی کەوتە نێوان سەرهەنگ سەفوەتی فەرماندەی سەربازی لەموسڵ و فازیل پاشای والی، یەکەمیان ئارەزووی دەکرد بەهێمنی و ئاشتی چارەسەر بکرێت و دووەم سوور بوو لەسەر چارەسەری سەربازی، هەردوو هێز لەدۆڵێکی گەورە بەیەکگەیشتن و هێزەکانی حکومەت بەسەختی شکان و ژمارەیەکی زۆر ئەفسەر و سەرباز کوژران و سێ تۆپ و ئەندازەیەکی زۆر لەچەك و تەقەمەنی کەوتە دەست بارزانیەکان، لەئاکامی ئەم شەڕە شێخ هاتەوە ناو ناوان و لەشوێنە ڕەسمیەکان و لەناو خەڵك باسی دەکرا، حکومەت لەگەڵیدا پێکهاتەوە، هەروەها دەڵێن حکومەت وازی لەو تاوانبارکردنەش هێنا کەئاغاکان دابوویانە پاڵ شێخ. شێخ لەجاران بەهێزتر گەڕایەوە ئەمارەتی بارزان و کەوتە تۆڵەکردنەوە لەو زێبارییانەی سەروەت و سامانی لایەنگرانی ئەویان تالان کردبوو. نازم پاشا لەجێگای فازیل پاشای داغستانی بووە والی، والی

تازه لەلانگرانی پارتی ئازادیو ئیئتلاف بەرهەڵستکاری ئیتحادیەکان بووە، بۆڕێکەوتن سەفوەت بەگی ناردە بارزان، بەپێی ئەو ڕێکەوتنامەیە دان نرا بەئەمارەتی بارزانو بەناوی بژاردنەوە پارمەتی گونجاویان پێدان. لەسەر داوای شێخ حکومەت بەڵێنی کردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەیدا لەبەرانبەر ئەوەدا کوردەکانیش بەڵێنیان دا ئەو چەکانەی لەحکومەتیان وەرگرتبوو بیاندەنەوە. شێخ عەبدوسەلام ویسامی پلە دووی دەوڵەتی عوسمانی پێدرا. لەدوای کۆدەتای سێیەمی ئیتحادیەکان لەساڵی ۱۹۱۳و گەڕانەوەیان بۆ دەسەلات، سلێمان نەزیف لەساڵی ۱۹۱٤کرایە والی موسڵ، سلێمان نەزیف کورد بووە بەلام پڕوپاگەندەی بۆ تۆرانیە دەکردو لەبەرانبەر کورد دڵڕەق بووە، دەیویست دەست بگرێ بەسەر شێخنشینو ئەمارەتی بارزانو داوای لەشێخ عەبدوسەلام کرد خۆی بەدەستەوە بدات، ئەم قبوڵی نەکردو حکومەتیش لەبەرانیەردا هێزێکی گەورەی ڕێکخست. ئەو هێزە بەکرێگیراوەی لەو هۆزە کوردانە بوو کەلەمەو پێش ناومان بردنو کەوتنە پشتیوانی حکومەت. لەدوای بەرگریەکی گەورە لەشەڕی (بلە) شێخ بۆی دەرکەوت هێزەکەی لەلایەن هێزی حکومەتو هۆزە هاوپەیمانەکانیەوە گەمارۆ دراوە. حکومەت بەبەکارهێنانی تۆپ ڕێگای پاراستبوو هەتا توانیبووی بەرەو لای ڕۆژهەلاتی زێی گەورە بپەڕێتەوە. لێرەوە شێخ بڕیاریدا بۆ ناوچەکانی سنووری ئێران بکشێتەوە، ئەو پاشەکشەیەش زۆر ئەستەم بوو چونکە بەفر ناوچەکەی داپۆشیبوو.شێخ لەساڵی ۱۹۱٤گەیشتە گوندی رازانی بارەگای سەید تەها لەناوخاکی ئێرانی(۱۱۱).

شێخ عەبدولسەلام لەدوای گەیشتنی بەئێران لەمانگی ئاب سەفەری کرد بۆ تەفلیس لەئازەبێجان هەتا لەوێ چاوی بکەوێ بە(بیگراندۆك)ی جێگری قەیسەرو فەرماندەی لەشکری باشوور. هێژا مەسعود بارزانی قەناعەتی وایە

سمکۆ لەو سەفەرە یاوەری کردووە، بەڵام بیڕەش پێیوایە شێخ بەتەنها بەو پەڕی نهێنیو بۆ ماوەی ٤٠ ڕۆژ ئەو سەفەرەی کردووە، سمکۆ بەتەنها بۆ مەبەستی ئاسانکاری سەفەری ئەو پەیوەندی بەرووسەکانەوە کردووە. ف. نێکتین دەڵێ شێخ لەو سەفەرەی داوای هاوکاری لەرووسەکان کردووە بۆ شەڕی دژ بە ئیتحادیەکان. رووسەکان پێیان وتووە واباشترە ئەمە نهێنی بێت، چونکە لەبەرژەوەندی ئەوان دانیە لەو بارودۆخە دوژمنکاری تورکان بکەن، ئەمە پرۆسەیەکی سیاسیە، دوو تا سێ مانگیتر چاوەڕێ بکە، ئەگەر پەیوەندیمان لەگەڵ تورکان باش بوو ئەوە داوای لێبووردنتان لێدەکەین، ئەگەر تێکچووین ئەوە هێزو چەکتان دەدەینێو دەتان گەڕێنینەوە بۆ بارزان[112]. شێخ دوای ئەو چاوپێکەوتنو پەیوەندیە چڕوپڕانە بڕیاریدا سەرلەنوێ بەرەنگاری ئیدارەی تورکی ببێتەوە لە بادینان، بەڵام تورکیا لەڕێگای پیاوێکی هۆزی شوکاکەوە بەناوی سۆفی عەبدوڵڵا چاوەڕێی هەنگاوەکانی دەکرد، لەکاتی گەڕانەوەی بۆسەیەکی بۆ دەنێتەوەو دەستگیری دەکەن. مەکدواڵ قەناعەتی وایە سمکۆ لەپشت دیلکردنی شێخ عەبدوسەلامەوە بووە[113] بەڵام ئەمە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە. شێخیان بردە موسڵو لەوێ لەلایەن دادگای عورفی سەربازیو بەڕینومایی سلێمان نەزیف بڕیاری لەسێدارەدانیدرا، بەر لەدەرچوونی رەزامەندی سوڵتان لەسەر بڕیارەکە لەسێدارە درا. سلێمان نەزیف لەناو موسڵ ئاژاوەیەکی رێکخستو لایەنگرانی شێخ عەبدوسەلامی تاوانبارکرد کەلەپشت ئەو ئاژاوەیەوەن، ئەمەش بۆ بەدەستهێنانی بیانوو هەتا بەبێ یاسا لەسێدارەی بدات[114]. رۆڵی سلێمان نەزیف لەشەهیدکردنی شێخ عەبدوسەلام هەمان ئەو رۆڵەیە کەپێشتر زیاکۆك ئەلپ گێڕای لەلای سوڵتان بۆ دەستبەسەراگرتنی بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشا.

کومەڵە هۆکارێك هەبوون لەناکۆکی نێوان شێخنشینی بارزان لەبادینان و حکومەتی ئیتحادیەکان، یەکێك لەو هۆکارانە ئارەزووی حکومەت بوو بەتایبەت ئیدارەی موسڵ بۆ سوود وەرگرتن لەو ململانێ تەقلیدیەی نێوان ئاغاکان و شێخەکانی بارزان بۆگەڕانەوەی دەسەڵاتی حکومەت بەسەر ئەو شێخنشینەی ببووە ئەمارەتێکی سەربەخۆ. ئیتحادیەکان سوور بوون لەسەر سەپاندنی دەسەڵاتی مەرکەزی بەسەر مەڵبەندی شێخان و بەستنەوەی بەئیدارەی حکومەت لەئاکرێ. ئەوان بەپێچەوانەی نەریتی باوی چەند سەدەی پێشوو کەوتنە سەپاندنی باجی دیاریکراو لەشێخانی بارزان، هەروەها سەرژمێری دانیشتوان لەبارزان بۆسەربازی گرتن و کۆکردنەوەی باجی جیا جیا بەشێوەی راستەوخۆ(١١٥).

یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەموسڵ دەڵێ: شێخ عەبدوسەلام پێی وایە (ئەو حکومەتەی ئێستا کافرەو جولەکەی دۆنمە دەستی بەسەراگرتووە، ئەگەر ئەم بۆچوونانەی کوردان بچێتە دەرەوەی ناوچەی بارزان زۆر مەترسیدار دەبێت و هەڕەشەیە بۆ سەر رژێمی تورکی لەناوچە کوردیەکان)(١١٦). یاریدەدری قونسوڵی بەریتانیش لە(وان) لەئازاری ١٩١٤بۆچوونێکی هاوشێوەی هەیەو دەڵێ:-

زۆربەی کورد لەژێرەوە خۆیان بەدوژمنی حکومەت دەزانن، بەم دواییە حکومەت گەیشتە قەناعەتێکی لەو شێوە بەوەی ناتوانێت مەترسی ئەو شێخانە نەهێڵێ کەنفوزی سیاسی و ئاینی کردەییان لەئایندەی ناوچەکەدا هەیە، ئەگەر بارودۆخی لەباریان بۆ هەڵبکەوێ بەڕێکخستنی کۆنەپەرستانەی بەهێز بەرووی دەسەڵاتی مەرکەزی و دەوڵەت دەوەستن، بەبەردەوامی ناوچەی بارزان هەڵوێستی دوژمنکارانەیان هەبووە لەدژی حکومەتی ئیتحادو تەرەقی و ئەو ناوچەیە مەڵبەندی ئاژاوە بووە، دەڵێن

عەبدوڕەزاق بەدرخان بەرنامەی داڕشتووەو ساڵی پار شێخانی بارزان چوونە پاڵ هەڵویستەکەیی و دەگونجێت حکومەت بەهۆی ئەوەوە بڕیاری سەرکوتکردنی دابن، پێشتر شێخی بارزان لەگەڵ شێخی شەمدینان (سەید تەها- نووسەر) ناحەز بوون بەیەکتر بەڵام وادیارە لەنێو خۆیان رێککەوتوون و کێشەی نێوانیان چارەسەر کردووەو بەرەیەکی یەکگرتوویان دژی حکومەت پێك هیناوە)[١١٧].

بەو شێوەیە حکومەت بزاڤی بارزانی بەبەشێك لەو شۆڕشە گشتگیرە زانیوە کە لەساڵی ١٩١٣وە سمکۆو عەبدورەزاق بەچاودێرو پشتیوانی رووس نەخشەیان بۆ داڕشتووە. هەروەکو بزاڤەکەی مەلا سەلیم بەرلەبڵاوبوونەوەی بۆ ناوچەکانی تر بەهەموو توانا کەوتنە وێزەی، ئەگەر ئەو جولانەوەیە خاڵی هاوبەشیشی هەبووبێت لەگەڵ ئامانجەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی هیچ بەڵگەیەك نیە حکومەت لەسەر ئەوە نیگەرانی دەربخات، هەتا ئەندازەیەك ئاکامی دەرهاویشتەی ناوخۆیی بووە لەگەڵ حەزی حکومەت بۆ سەرکوتکردن و سەپاندنی ئیدارەی خۆجێیەتی. شێخ عەبدوسەلام جەخت دەکاتە سەر رۆڵی سابونچی و پیاو ماقوڵانی موسڵ و ئاغاکانی زێبار لەورووژاندنی حکومەت لەدژی ئەو، بەدملۆجی دەڵێ: (رێگەی بەرانبەرمان گیراوەو کەس نیە بەرگری لەئێمە بکات ...... هەموو پیاوی بەرژەوەندی خۆیانن، وەکو ناحەزەکانمان گوندمان نیە بیدەین بەگەورەکانی موسڵ، بۆیە بۆخۆمان بەرگری لەخۆمان دەکەین، لێ ی دەپرسێت دوژمنەکانتان کێن؟

دەڵێ : بێجگە لەئاغاکانی زیبار کەس دوژمنمان نیە[١١٨].

کارگەیشتە ئەوەی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەموسڵ بڵێ پیاوماقوڵانی موسڵ بەتایبەتی جەمیل سابونچی پاشا چاوی بڕیوەتە

گوندی بارزانیەکان، لەهەوڵی ئەوەدابووە ململانێی بارزانیەکان و ئاغاکانی زیبار بقۆزێتەوە هەتا زیاتر دەست بگرێ بەسەر گوندە کشتوکاڵیەکان، عوسمان ئاغای زیباری چەند گوندێکی دابوو بەسابونچی پاشا هەتا کار بکەمە سەر والی بکات بۆناردنی هێز بۆ سەرکوتکردنی شێخنشینی بارزان[119].

بەڵگەنامەکانی بەریتانی و عوسمانی جەخت لەسەر کۆمەڵێك شت دەکەنەوە لەوانە: ئیتحادیەکان زۆر سوورن لەسەر کۆتایی هێنان بەو سەربەخۆیەی شێخەکانی بارزان، بەڵگەنامەی یەکەم جەختکردنە لەسەر ئەو قەناعەتەی کەپێیان وایە بزووتنەوەی بارزان مەترسیدارە چونکە بەشێکە لەبزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی و هەم کۆسپە لەبەدەم هەوڵی ئەوان بۆ تواندنەوەی نەتەوە ناتوورکەکان لەقالبی نەتەوەی توورکدا. زۆربەی بانگەوازکارانی مافی کوردی لەشێخانی تەریقەتی سۆفیگەری و زانایانی ئایینی دەبنە هێزێکی لەشکان نەهاتوو بۆ بەرگری لەشەریعەت و پەیدابوونی بزوتنەوەیەکی ئیسلامی بەرهەڵستکاری ئیتحادیەکان، هەروەها بەڕوونی دڵڕەقی ئیتحادیەکان دەردەخەن لە سەرکوتکردنی ئەو بزوتنەوەیە، بەڕادەیەك وەزیری ناوخۆ و وەزیری جەنگ داوا لەفەرماندە جەنگیەکان دەکەن هیچ دەرفەت نەدرێ بەشێخ لەگەڵ حکومەت رێك بکەوێ، ئەمە لەکاتێکدا بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر شێخ کەدوورکەوێتەوە لەخوێن رشتن و تەسلیمکردنەوەی ئەو ناوچانەی لەحکومەتی گرتووە لەگەڵ رێزگرتن لەیاسا و ژیانێکی ئاشتیانە لەسایەی رژێمی تازە. دەتوانین هۆکارەکانی ناکۆکی لەبارزانی رۆژانی شێخ عەبدوسەلام بۆ سێ خاڵ کورت بکەینەوە:-

١- ئارەزووی ئیتحادیەکان لەسەپاندنی مەرکەزیەت بەسەر بارزان و

**هەڵوەشاندنەوەی ئەو خودموختاریەی دەیان ساڵە هەیانە.**

**٢- ململانێی نێوان ئاغاکانی زیبارو شێخ عەبدوسەلام لەسەر دەسەڵات**

**٣-ململانێــی نێــوان تۆرانیــەتی عــەلمانیو کوردایــەتی لەبــەرگی ئیسلامەتیدا.**

**بۆ زیاترشارەزایی بفەرموون بۆ ئەم بەڵگەنامانەی خوارەوە:-**

## پاشکۆی بەڵگەنامەکان

بەڕێوەبەرایەتی ئەرکانی جەنگی عمومی میللی سێیەم، بروسکەی هاتوو بەمێژووی ٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٣٢٥

لەفازیل پاشای والی موسڵو دەوروبەری

ج./ ٣٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ٣٢٥ هەروەکو لەسەرەتاو کۆتایی باسم کرد لەدوای تێکشکانی شێخی بارزانو لایەنگرانی، راوەدوونانو هەڵاتنی ئەوان لەشاخەکان ماوەی مانگێکە بەشەوو رۆژ بەردەوامە، لەچەند پێکدادانێکدا لەو سەرۆکە یاخیانەی وەکو فەقێ عەبدورەحمان حاجیكو سارم عەلۆ عارفو یونس کوژراونو عەلی حەسەن بەبرینداری گیراوە، ژمارەیەکی زۆر لەلایەنگرانی کوژراونو سەد کەسیش بەزیندویی گیراون، لەکۆتاییدا شێخ توانیبووی بەهاوکاری سەعیداغای دەسەڵاتدار بەسەر ناحیەی (سال)ی ولایەتی وان رابکاتو بچێتە ئەو هەرێمەی دیانەکانی تەموزو تیاری لێنیشتەجێن لەلیوای هەکاری، ئێستا لەنزیك زاوێتە خۆی بزر کردووە، لایەنگرانی ئەو میجۆ، حیجۆ، خالید، مەلا حەسەن، فەقێ خالیدو چەند کەسانیتر لەدۆستانو بنەماڵەکەیان هاتوونەتە لای سەعید ئاغای ناوبراو. چەندین جار داوامان لەشێخی ناوبراو کردووە پێویستە ئەوانە بگرنو تەسلیم بەحکومەتیان بکەن کەچی دەڵێن لای ئێمە نین، بۆسەلامەتیو پاراستنی سەعید ئاغا نووسراومان بۆ ولایەتی وانو موتەسەریفیەی هەکاری ناردووە هەتا هۆکاری خۆشاردنەوەی ئەوان روون بکەنەوە لەگەڵ زەرورەتی گرتنیان، دەستەیەکی ئەسپ سواریشمان بەفەرماندەی بەگباشی ساڵح بەگ نارد بۆ ئامێدی لەکۆتایی سنووری ولایەت، لەئاکامی ئەم بەدواداچوونە سێ لەو یاخیانە گیرانو گواستمانەوە

بۆ موسڵ، لەگەڵ ئەوەدا هیچ شوێنەوارێکی یاخیبووان لەناو ولایەتەکە نیە بەڵام هەر بۆ وریایی‌دان نەوەکو لەگەڵ مەسیحیەکانی تیاری بێنە ناوشار، نوسراومان بۆ ولایەتی وان نووسیوەو پێمان وتوون پێویستە دەسەڵاتدارانی ولایەت ئەوانە بگرن، دوای ئەوە بڕیارماندا هەموو ئەوانەی بەدوای شێخەوە بوون گەڕاندمانەوە شوێنی خۆیان و ئێستا ئێمە ئیدارەیان دەگێڕین و داوایان لەحکومەتی سوونی ئەوە بووە بگەڕێنەوە سەر ماڵ و شوێنی خۆیان، هەتا لەبارزان و لیوایەکە بەرگری پەیدانەبێتەوە پێگەیەکی سەربازیمان بەئەندازەی دوو تابوور لەهێزە یەدەگەکان لەوێ داناوە. پێگەیەکی سەربازی نیزامیشمان لەشێروان داناو دوایی بۆکاری پێویست گەڕاندمانەوە بۆ موسڵ، هەر کەبیستمان شێخی ناوبراو گەڕاوەتەوە بۆ هەکاری ڕێنومایی توونددمان دا بەفەرماندەی بارزان لەسەر زەروورەتی دەستگیرکردنی، بەڵام بەهۆی هەڵەیەکەوە کارەکە سەری نەگرت، هەروەکو باسم کرد هیچ کەمتەرخەمیەك یان تەمبەڵیەك لەلای ئێمەوە رووی نەداوە، ئەو ڕووداوەی دوایش ئاکامی ترسنۆکی و بێگوێی هەندێ لەپیاوانی هێزی یەدەك و هەندێ لەئەفسەران بووە، ئەوانەشم نارد بۆ دیوانی جەنگ هەتا سزایان بدەن، دابینکردنی هێزو ئامادەکردنی پێویستیەکانم سازدا بەڵام داوای لێبووردن هەتا ئێستا یاخیبوان نەگیراون چونکە سەعیداغا داڵدەیان دەدا، ئەگەر هێزێکی سەربازی لەوێ دانەنرێ یان سەعیداغا دوورنەخرێتەوەو سزانەدرێ ئەوە هەوڵەکانی ئایندەمان بێئاکام دەبێت، بۆیە دەست پێشخەری بکرێ لەناردنی هێزی پێویست و ڕێگەچارەیەك بۆ دوورخستنەوەی سەعیدئاغا لەناحیەی(سال).

تکایە ئاگادار بن

## بەڵگەنامەی ژمارە (١)..REF: FO 95\2458

یاردەدەری قونسوڵیەتی بەریتانی لەوان ١٣ی ئازاری ١٩١٤

گەورەم مالیت باڵوێزی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانی / ئەستەنبوڵ.

گەورەییە بۆمن هێزێکی سەربازی دیاریکراو ئامادەبکەم لەدژی شێخی بارزان و شوێنکەوتوانی.. کەتیبەی سوارەی ژمارە-٢٠-و بەتالیونی یەکەم و دووەمی سەر بەکەتیبەی -١٩- دوو ق. ف بەرگری شاخ و دوو چەکی رەشاش بەشداریان لەو شاڵاوەدا کردووە. ئەمڕۆ ئەو هێزە (وان)ی بەجێهێشت و لەگەڵ هێزەکانی‌تر بەشداری دەکەن لەهێرش بۆسەر بارزان، ئەوان بەهۆی نەخۆشی هێزەکەیان زۆر لاوازەو لە(٥٠٠) پیاو تێپەڕ ناکات.

شێخ بەیەکێك لەو پێنج شەش شێخە بەهێزەی کوردستان دەژمێردرێت، لەناوچە شاخاویەکانی درێژایی سنووری هەردوو ولایەتی وان و موسڵ، نفوزی لەناو شێخەکان و ئاغاکان دا هەیە. دەسەڵاتی حکومەت لەو بەشەی وڵاتی تورکیا لاوازە، قایمقامەکانی ئەو ناوچەیە دەسەڵاتیان لەو گوندەی تیا دەژین تێپەڕناکات بۆدەرەوەی گوند. زۆربەی بەڕێوەبەری ناحیەکانی ئەو ناوچانەش لەئاغاکانن، بەڵام شوێنی رەسمی ئەوان زۆر بەکەمی لەسەر حیسابی دراوسێکانیان یاخی‌بوون و سەرپێچی هەیە، زیاتر لاوازی دەسەڵاتی مەرکەزی لەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی شاخاوی ناوچەکە، بەزۆری رێگای هاتوچۆ لەو وڵاتە بەهۆی دەربەند و رێڕەوی بەردینیەوەیە، لەهەندێ لەو ناوچانە هەتا بۆ رۆیشتنی هێستریش ئەستەمە.

ئامـادەکردنی چـەندین بەرپرسـی ناوچـەکە بۆزەمینەسـازی سیاسـەتی وازهێنـان لەسـەرۆك هـۆزە بچـوکەکان و ئاغاکـان و بۆکاروبـاری نـاوخۆو خۆبواردن لەجەنگی ناوخۆ، قبوڵ نەکردنی دەمارگیری جێگرەویەکی باشە بۆیـان. زۆر سـەرقاڵ دەبـن و نـاتوانن ڕیزەکـانی خۆیـان یەکخـەن و ببنـە کۆسپێکی ترسناك دژی حکومەت. چونکە ناوچەکە بۆحکومەت دەوڵەمەند نیـە. زۆر پێویسـت نـەبووە دەسـەڵات بسـەپێنیّ و سـەپاندنی بـاج دەسـت لـەکاروباری نـاوخۆ وەربـدات. لێـرە زۆربـەی کـورد لەناخـەوە دوژمـنی حکومەتن، بەم دواییە حکومەت گەیشتە ئەو قەناعەتە بەبیّ لابردنی نفوزی ئەو شێخانەی کەخاوەنی نفوزی ئاینی و سیاسی و کردەیین لەناوچەکەدا نـاتوانیّ مەترسـی ئەوانـە لابـەریّ، لەئاینـدە ئـەوان لـەبارودۆخێکی لـەبار دەگەڕێن بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی دەسەڵاتی مەرکەزی ببنەوەو ڕێکخستنێکی کۆنەپەرستانەی دژ بەحکومەت سازبکەن. شێخ بەبەردەوامی هەڵوێستی دوژمنکارانەی هەبووە لەحکومەتی ئیتحادو تەرەقی و ناوچەی نفوزی ئەو مەڵبەندی ئاژاوە بووە، دەڵێن لەگەڵ عەبدورەزاق بەدرخان نەخشەی دژی توورکان داڕشتبوو، ساڵی پار چووبوە پاڵ شێخی بارزان، دەگونجیّ هەر بەهۆی ئەمە بووبێت حکومەت بڕیاری سەرکوتکردنی دابێت، پێشتر لەگەڵ شێخی شەمدینان دوژمنی یەکتربوون بەڵام دیارە هەردوولا ڕێککەوتون لەسـەر چارەسـەرکردنی ناکۆکیـەکانیان بەڕێگـەی ئاشـتی و بەرەیـەکی یەکگرتوویان لەدژی تورك ڕێکخستووە. ئەوەی جێی وەبیرهێناوەیە شێخ عوبێدوڵلای باپیری شێخی شەمدینانی کەبە ٤٠ هەزار چەکداری کوردەوە شاڵاوی بردە سەر وورمیّ بەڵام نەوەکانی ئەو نفوزەیان نیەو تورکەکان بەرەو ئێران دەریان پەڕاندن. ئێستا نفوزی شێخ تەها و نفوزی شێخی بارزان

بەرفروانە، شێخ تەها ئێستا لەناوچەی (رازان)ی ئێرانی لەسنووری تورکی - ئێرانی نیشتەجێیەو چەند گوندێکی هەیە.

هەواڵێکم بەدەست گەیشتووە زۆر لێی دڵنیا نیم دەڵێن ئیدارەی رووسی لەئازەربێجان(ئێران) شێخ تەهای کردووە بەبەرپرسی کاروباری گومرگی ئێرانی لەناوچە سنوورییەکان و مانگانە موچەی بۆبڕیوەتەوە، ئەگەر ئەو هەواڵە راست بێت ئەوا ئەرکی بنەڕەتی سەرشانی حکومەت قەدەغەکردنی هێنانی توتنە لەناوچەکانی ژێرنفوزی ئەوەوە بۆ ئێران، چونکە حکومەتی تورکیا بۆ ئەو مەبەستە زەوی داوە بەگوندنشینەکانی شێخ و داهاتی تووتنی حەرام کرد، ساڵانە بەهەزاران پاوەند (جونەیهی ئیسترلینی= وەرگێڕ) دەخەمڵێنرێت، ئەگەر هەوڵی ئەم دوو شێخە یەکبخرێت( شێخی شەمدینان و بارزان= وەرگێڕ) ئەوا دەتوانن ببنە هێزێکی گەورەو گیروگرفت بۆحکومەتی تورکیا بخولقێنن، بەڵام شاڵاوی ئەم جارەیان پێچەوانەی بزوتنەوە کوردیەکانی‌تر دەرفەتی زۆری نابێت بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت و تاڵانی وەکو ئەوەی لەشاڵاوی سەر وورمێ رووی‌دا. بۆیە هێزەکانی حکومەت لەلایەن کوردەوە تووشی بەرهەڵستی گەورە نابن. واچاوەڕوان دەکرێ ئەو هێرشە بەپەڕینەوەی شێخی بارزان دەست پێ‌بکات بۆ ئێران. لەوێ بچێتە پاڵ ئەو کۆمەڵانەی بەهەڵستکاری رژێمی تورکیان کە لەدەرفەتێك دەگەڕێن بگرێنەوە وڵات و دەست بگرنەوە بەسەر ئەو زەوی‌و سامانەیان کەحکومەتی تورکی دەستی بەسەرداگرتبوو.

بۆ من شەرەفێکی گەورەیە بەوپەڕی رێزەوە ببمە خزمەتکاری گوێڕایەڵتان :

ج. ن. سمیت، ئەفسەری سوارەی سووك

# شۆڕشی بەرفراوانی کوردان

## عەبدوڕەزاق بەدرخان، سمکۆ، سەید تەها

لەسالانی ١٩١٠-١٩١٤ چالاکی بەرچاو هەبووە بۆنەخشەی شۆڕشێکی بەرفراوانی کوردان بەشەرۆکایەتی نەوەکانی بەدرخان بەتایبەت عەبدوڕەزاق بەدرخان، بەڵام بارودۆخی دەولی و ئیقلیمی و هۆکارە زاتیەکانی تایبەت بەکورد (نەبوونی سەرکردایەتیەکی کارزماتی و هوشیارو یەکگرتوو بۆ کورد لەگەڵ گەلالەنەبوونی هوشیاری نەتەوایەتی و زیاد پشت بەستن بەرووس) ڕێگر بووە لەبەردەم سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشە بەرفراوانە، ئەگەر ئەوە زامن بوایە پێدەچوو قەوارەیەکی سەربەخۆی تایبەت بەکورد لەدایك ببوایە، چونکە هەر لەو ماوەیەدا ژمارەیەك لەگەلانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی لەئەورووپا سەربەخۆیان وەرگرت، ئەمە باشترین دەرفەت بوو ــ بەبۆچوونی ئێمە ــ لەرووی دەولی و ئیقلیمی بۆ دروستکردنی ئەو دەوڵەتەوەو قبوڵ کردنی وەکو ئەمری واقیع لەلایەن دەروویەرەوە.

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا زۆر گرنگە بەر لەوەی باس لەبزوتنەوەکەی عەبدولڕەزاق و هاوڕێکانی بکەین هەروا بەکورتیش بێت ئەو بارودۆخە ئیقلیمی و دەولیەی کاتی بزوتنەوەکە بەبیر خوێنەری بەڕێز بهێنمەوە. لەساڵی ١٩١٠بەرهەڵستکاری دژ بەئیتحادیەکان لەگەشەیەکی بەردەوام دابوو، پارتی ئازادی و ئیئتلافی بەرهەڵستکار لەساڵی ١٩١٢توانی سەرکردایەتی کۆدەتایەکی سەربازی بکات و هەتا ناوەڕاستی ساڵی١٩١٣ ئیتحادیەکان لەحوکم دوور بخاتەوە، لەو ساڵەو لەئاکامی کۆدەتایەکی دژ گەڕانەوە بۆ حوکم و سەردەمی سێ دیکتاتۆریەکە (تەلعەت، ئەنوەر، جەمال) دەستی پێکرد.

لەو ماوەیەدا چەندین شۆڕش لەسەر خاکی عوسمانی لەئەورووپای ڕۆژهەڵات سەری هەڵدا، ئەمە هاندەر بوو بۆ ئەرمەن بەپشتیوانی وڵاتی ئەورووپی و بەتایبەتی رووس و ئینگلیزو فەڕەنسیەکان و لەژێر پەردەی چاکسازی لەئەنادۆڵی خۆرهەڵات هەوڵی دامەزراندنی قەوارەیەکی ئەرمەنی بدەن لەهەندێ ولایەتە ئەرمەنیەکان و بەشێکی گەورەی کوردستانی باکور[١٢٠]، گەرچی رووس تێڕوانینی ئاشکرای نەبووە لەمەسەلەی ئەرمەن بەڵام پێیان وابووە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات کە کەمینەی ئەرمەنی عوسمانی تیا دەژی وەکو کراسی عوسمان بەکاری بهێنن، رووس لەساڵی١٩١٢ دۆسیەی ئەرمەنی لەدەوڵەتی عوسمانی هێنایە گۆڕێ"[١٢١]، بەچەك و پارە کەوتنە هاوکاری چەتە ئەرمەنیەکان کەبەفیدائی یان تاشناق ناسرابوون لەخاکی ئەرمەنی ژێردەسەڵاتی رووسەکانەوە دەپەڕینەوە بۆ ناو دەسەڵاتی عوسمانی(١٢٢)، لەساڵی ١٩١٤ دەوڵەتی عوسمانی رەزامەندی دەربڕی لەسەر ئەو پڕۆژەیەی رووسیا بەهاوکاری فەڕەنسا و بەریتانیا خستبوویە روو بەناوی چاکسازیەکانی ئەرمەنی، بەو پێیە دەبوایە لەو هەرێمانە حاکمی ئەرمەنی یان نەسرانی دابنرایە لەژێر ڕێنومایی نوێنەری هێزە ئەورووپیەکان، زمانی ئەرمەنی لەئیدارەو فێرکردن دەسەپێنرێت و دادگای ئەرمەنی بۆئەو کێشانە پێك دەهێنرێت کەیەکێك لەلایەنەکانی کێشەکە پەیوەندی بەنەسرانیەکانەوە هەبێت، وەکو سنووردانان بۆ دەستدرێژیەکانی کوردان لەسەر ئەرمەن، ئەو پڕۆژە چاکسازیانە هیچ قسەیەکیان لەسەر کوردەکان نەکردبوو کەزۆرینەی زۆری دانیشتوانی ناوچەکە پێك دەهێنن، پێشتر ئەمەیان بۆ مەسدۆنیاو بۆسنەو هەرسك و ئەلبانیا و سربیا و قوبرس کردبوو، بەناوی چاکسازیەوە کەوتنە دەستێوەردان و دوایی لەدەوڵەتی عوسمانیان دابڕی[١٢٣]، ئەگەر دەرفەت بۆچاکسازیەکانی ئەرمەن لەئەنادۆڵی

خۆرهەڵات هەبوایە کاریگەری لەسەر کورد کەمتر نەبوو لەکاریگەری بەڵێنی بەلفوڕ لەسەر فەلەستینیەکان، سەرەڕای ئەرمەن رووس بۆ هەیمەنە کردنە سەر کوردستانی رۆژهەڵات و باکور لەسەر حیسابی بەرژەوەندیەکانی کورد وەکو ئامرازێک لەهەوڵی بەکارهێنانی ئاشوریەکاندا بوون، مێژووی دیبلۆماسیەتی قونسوڵیەکانی رووس لەناو دەوڵەتی عوسمانی و باڵوێزیەکانیان لەئەستەنبوڵ پڕە لەدرۆ و دەلەسەو زیادەڕۆیی لەسەر مەرگەساتی ئاشووریەکان بەدەستی وەکو خۆیان دەڵێن (کوردە مسوڵمانە دەمارگیرەکان)[١٢٤]. یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەموسڵ باس لەرۆڵی رووسی دژ بەکورد دەکات، لەبەشێکی نامەی سەرۆکی ئەساقیفەی قدشیانیس– جولەمیرگ ـ دا هاتووە کە بۆ قونسوڵیەی دەنێریٚ و دەڵێ (قەزم نعیس ئۆلیڤەری قونسوڵی رووسی لە وان بەرپرسیارە لەوروژاندنی ئاشووریەکان لە دژی کورد)[١٢٥].

ئەو حاڵەتە گەڕەلاوژەو لاوازیەی لەئاکامی شۆڕشی دەستووری ساڵی ١٩٠٧ پەیدابوو هەتا ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیش بەردەوام بوو، ئەمەش بۆشایەکی سیاسی و ئیداری لەئازەربێجانی ئێرانی و سنوری ئێرانی ـ تورکی دروست کرد. دەوڵەتی عوسمانی لەهەوڵی ئەوەدابوو ئەم حالەتە نائارامیەی سنووری تورکیا ـ ئێران بقۆزێتەوە بۆ دەستبەسەراگرتنی ئازەربێجان و کوردستانی رۆژهەلات. رووسەکان لەو قەناعەتە دابوون ئینگلیزەکان هاندەری دەوڵەتی عوسمانین لەسنوور بەزاندن بۆناو خاکی ئێرانی، ئەمەش بۆفراوانکردنی نفوزی خۆیان لەسەر حیسابی ئێران، رووسەکان چەندین جار داوایان لەئیتحادیەکان کرد لەخاکی ئێران بکشێنەوە بەلاٚم بیٚئاکام بوو، لەراستیشدا ئینگلیزەکان پشتیوانی عوسمانیەکان نەبوون لەو فراوانخوازیەی ئەوان بۆناو خاکی ئێران، بەڵکو

سووربوون لەسەر حالەتی ئارامی سنووری تورکی - ئێرانی. رووس بەوە نەوستا لەساڵی ١٩٠٩ دەهەزار سەربازی نارد بۆ داگیرکردنی ئازەربێجان و لەئاکامدا شارەکانی ورمێ و سەلماس و ماکۆ گیران، لەمەشدا زیاتر مەبەستی دامەزراندنی پەیوەندی بووە لەگەڵ سەرۆکە کوردەکان و بەربەست دروستکردن بووە لەبەردەم سنوور بەزاندنی تورکی بۆ هەرێمەکە. لەبەر مەترسی ئەو نفوزە زۆرەی ئەڵمان لەناو دەوڵەتی عوسمانی ئینگلیز و رووس کەوتنە قەناعەت پێهێنانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی بەپێکهێنانی لیژنەی رێکخستنی سنووری ساڵی ١٩١١ . هەتا ئەڵمان کێشە سنووریەکان نەقۆزێتەوە، بەڵام قەیرانی سنووری عوسمانی لەراستیدا بەشێکی مەسەلەی کوردیە کەهەتا ساڵی ١٩١٤چارەسەر نەکرا، بەکورتی بارودۆخی قەیرانی ناو دەوڵەتی عوسمانی و بارە دەولی و ئیقلیمیەکان هەر بەنائارامی مایەوە(١٢٦)

عەبدورەزاق و سمکۆو سەید تەها تاکە پشتیوانی سەرەکیان لەداڕشتنی نەخشەی بەرفراوانی شۆڕشی کوردان رووس بووە، بۆیە بەپێویستی دەزانین رێڕەوی ئەو ماوەیەی سیاسەتی رووسی تێبگەین بەرانبەر بەکورد، هەموو ئاماژەکان لەو ماوەیە جەخت لەسەر ناڕۆشنی سیاسەتی رووسەکان دەکەنەوە لەبەرانبەر کورد نەك هەر ئەوە بەڵکو دەمارگیریەکی ئاشکرا هەبووە لەلایەن رووسەکانەوە بۆمتمانە نەبوون و پشت نەبەستن بەکورد بەڵکو زیاتر پشت بەستن بووە بەئەرمەن و ئاشووری لەبەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی رووس لەناو دەوڵەتی عوسمانی(١٢٧)، سەرەڕای ئەمانەش لەئامی زوڵمی ئیتحادیەکان . لەسالانی ١٩١٠- ١٩١٤ دەبینین ژمارەیەکی زۆری سەرۆك هۆزی کورد چوونە باوەشی خواستەکانی رووس(١٢٨)، لازاریف دەڵێ ناکۆکی هەیە لەنیوان رێنومایی قونسوڵیەکانی رووس

لەناوچەکەو فەرماندەکانی قەوقازو (تەفلیس)ی پایتەخت کەداوای دروستکردنی پەیوەندی پتەویان دەکرد لەگەڵ کوردو دەیانوت دەبێت لەدژی عوسمانی پشتیوانی لێبکرێ، ڕێنومایی باڵوێزەکانی رووس لەتاران و ئەستەنبوڵ و بەرپرسانی دەرەوە لەبترسبۆك تەواو پێچەوانە بووە و ئەمان پێیان وابوو نابێت هاوکاری ماف نەتەوایەتی کوردان بکرێ یان وەکو کارتی فشار دژی دەوڵەتی عوسمانی بەکاربهێنرێ. وەزارەتی دەرەوەش جەختی لەسەر پابەندی بەم سیاسەتە دەکردەوە، چونکە دەیویست سوور بێت لەسەر بەڵێنەکانی لەبەرانبەر بەریتانیا کەلەرێکەوتننامەی لێك تێگەیشتنی سالی١٩٠٥ پێی دابوو[١٢٩]، وادی جوەیدە لە(نێکتین) دەگێڕێتەوە کەکاتی خۆی قونسوڵی رووسی بووە لەورمێ و پسپۆڕ بووە لەکاروباری کوردی دەڵێ: لەراستیدا رووسیای قەیسەری سیاسەتێکی رۆشنی نەبووە بەرانبەر بەکورد، هەر بۆنمونە لەناو هێزەکانی ئێمەدا لەقەوقازیا هەتا بەنەخشەی ورد رادەگات کوردی زانی باشیشیان نەبووە[١٣٠].

عەبدورەزاق بەدرخان کەسایەتیەکی گرنگ و خاوەن خۆزگە بووە، دەیویست لەژێر چاودێری رووسیا ببێتە میری هەموو کوردستان، گرنگترین نەخشەی ئەو بۆبەدیهێنانی ئەمارەتی کوردستانی سەربەخۆ بریتی بوو لە:-

١-قەناعەت پێهێنانی رووس و ئێرانیەکان بەوەی کاردەکات بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی نەتەوایەتی.

٢-دامەزراندنی بنکەیەك لەکوردستانی ئێران هەتا ببێتە پێگەیەك بۆ رزگارکردنی هەموو کوردستان.

٣-قەناعەتی پتەوی هەبووە جولانەوەی کورد پەرت و بڵاوە و بەو شێوە ناتوانێ کورد بگەیەنێت بەئاوات.

٤-کۆڵەکەی بنەڕەتی لەرزگارکردنی کوردستان بریتی‌یە لەشۆڕسی ڕۆشنبیری.

٥-هاوپەیمانیەتی کوردان رووسیایە نەك ئینگلیز

بەر لەوەی لەلایەنی بەهێزو لاوازی نەخشەکەی عەبدوڕەزاق بەدرخان تێبگەین، خراپ نیە ئەگەر شتێك دەربارەی ژیانی ئەو سیاسەتمەدارە کوردە وریایە ناسراوە بزانین، باشترە لەو بەڵگەنامەی وەربگرین کەنامەیەکی خۆیەتی و لەساڵی ١٩١٠بۆ(گاریکۆف)ی باڵوێزی رووسی لەئەستەنبوڵی نوسیوەو داواکارە ڕێگەی پێبدرێت کۆچ بکات بۆ رووسیا و لەتەفلیس بژی:-

من ناوم عەبدوڕەزاقی کوڕی نەجیبی کوڕی بەدرخانە، تەمەنم ٤٦ساڵە، دوای فێربوونی زمانی فەڕەنسی لەئەستەنبوڵ ویستم بچم بۆپاریس بەڵام سوڵتان عەبدولحەمید نەیهێشت چونکە نەیدەویست کوڕانی بەدرخان بچنە ئەورووپاو ئەستێرەی بەختیان بدرەوشێتەوە، ناردمی بۆ دەرەوەی تورکیا و وەکو سکرتێری سێیەمی باڵوێزخانەی عوسمانی لەبترسبۆگ دایمەزراندم، دوای ساڵێك کرامە سکرتێری دووەمی باڵوێزخانەی عوسمانی لەتاران، لەکاتی سەرقاڵیم بەگواستنەوە بۆ تاران بەماوەیەکی کەم تاوانێکیان دایە پاڵ من و بەفەرمانی سوڵتان لەسامسۆنەوە گەڕامەوە بۆ ئەستەنبوڵ، دوای ئەوە هەوڵم دا بچم لەتەفلیس بژیم هەتا نزیك بم لەئێریڤان و کوردستان و دوور بم لەبەلای سەلتان چونکە لەلای زۆربەی دیبلۆماسەکانی رووس لەئەستەنبوڵ کەسایەتیەکی ناسراو بووم، هەرکە گەیشتمە تەفلیس بەرپرسان و پیاوماقوڵانی شار بەگەرمی پێشوازیان لێکردم، سوڵتان بەمە نیگەران بوو، بەفرۆفێڵی سوڵتان کەوەکو باقی بەرپرسانی‌تر پێی ناسراون کەوتە فشار بۆسەر بەرپرسانی حکومەتی رووس، بەڕێگەی یەکێك

لەبەرپرسانەوە ئاگادار کرام کە مافم نیە نەلەئێران و نەلە تورکیا و نەلە رووسیا دابنیشم، پۆلیس منیان گرت و بردمیانە باتۆم لەوێوە چوومە ئینگلتەرە بەلاّم سولّتان بەبەلّێنی باق وبریق باوکمی قەناعەت پێهێنا لەسەر گەڕانەوەم بۆ ئەسەنبوڵ بەسەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی تەشریفات دامەزرام و ١٤ساڵ خزمەتم کرد. بەچەندین مەدالیای رێزلێنان خەلاّت کراوم لەناویاندا مەدالیای پلە یەکی عوسمانیم وەرگرت. گەیشتمە پلەی بالاّ و لەناوەندە رەسمیەکانی ئەوروپا کەسایەتیەکی باشم بەدەست هێنا، وسامی (ستانسلاڤی)یم وەرگرت، لەو ماوەیە ریزوان بەگی بەڕێوەبەری پۆلیس تیرۆر کرا، خۆم و خانەوادەکەم لەسەر ئەو مەسەلەیە تاوانبارکراین، سولّتان کاسەی تووڕەیی خۆی بەسەرماندا ڕژاند، نزیکەی هەزار کەس لەخانەوادەی بەدرخانی بەرەو گرتووخانە بران یان دوورخرانەوە بۆ تەرابلوسی رۆژاوا، چونکە سولّتان دەترسا بنەماڵەی بەدرخان دەست بگرن بەسەر کۆشکی دەسەلاّت... دوای ١٨مانگ نارەحەتی بەندیخانە ئیتحادیەکان هاتنە سەر حوکم، ئەوانە لەگەڵ سولّتان جیاوازیان نەبوو، زاڵم بوون بەئێمە، لێبوردنی گشتیان دەرکرد بۆ هەموو گیراوە ئەرمەنی و بولغارو تورکەکان بەلاّم وەکو تاوانبار مامەڵەیان لەگەڵ ئێمە دەکرد، دوو مانگ دوای شۆڕشی دەستووریش من لەگرتووخان مامەوە هەتا لێبووردنی تایبەتیان بۆ دەرکردم، لەو قەناعەتەدام تووركیا نەبەمن و نەبەمیرە کوردەکانی وەکو من چاك نابێت... بۆیە داوا لەبەرێزتان دەکەم من وەکو رەعیەتێکی رووسی قبوڵ بکەن، لەکاتێکدا بالّوێزخانەی رووسی باشم دەناسێ، بەدڵسۆزی خزمەتی رووسیای نیشتیمانی خۆم دەکەم... تکایە رێگەم پێبدەن لەتەفلیس نیشتەجێ ببم)[١٣١].

لـەم ژیاننامـە تایبەتیـەی عەبـدوڕەزاق بەدیاردەکـەوێ کـە ئـەم ١٤سـاڵ لـەدیوانی تەشـریفات و لەئاسـتێکی بـەرز خزمـەتی کـردووە، دیـارە جێـی متمانەی سوڵتان عەبدولحەمیدو دڵسۆزی ئەو بووە ئەگینا چۆن توانیویـەتی ئەو ماوە زۆرە خزمەت بکات لەگەڵ سوڵتانێك کەزیاد لەپێویست بایـەخی بەلایەنی ئەمنی داوە، دوایی بۆ لەو ماوەیە بەئاراستەی داواکاری مافی کورد نەجولاوە؟ یان بەرلەوەی لەبەرژەوەندی خانەوادەی بدرێت بۆچی پشتیوانی لەبەرهەڵستکاران نـەکردووە........؟ بەمافی خۆمـانی دەزانین بپرسین ئایا عەبدوڕەزاقی ئیداری و خاوەن خۆزگە دەبێ نەیتوانیبێت لەپایـەی حکومی شتێ بەشتێ بکات و پەنای بۆشێوازی شۆڕگێڕی بردبێت بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی لەدەستی چوو بوو.

(باسـل نێگـتین) لەسـاڵی ١٩٠٩لەنامەیـەکیدا بۆرۆژنامـەی (مانجەسـتەر گاردیـان) دەنووسـێ: عەبـدوڕەزاق هاتـە بترسـبۆرگ و پرۆژەیـەکی دەوڵـەتی کـوردی پێبوو بـەڵام رووسـەکان پرۆژەکـەیان قبـوڵ نـەکرد[١٣٢]، ئـەو سـاڵی ١٩٠٩ لەگرتووخانەدا بووە، دەگونجێ ئەو ساڵە بەهەڵـە نووسرابێت. بەڵام لازاریـف دەڵـێ: لەتشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩١٠داوای پیشـکەش کردبـوو بێتـە هاوڵاتیـەکی رووسـی و لـەئێریڤان دابنیشـێت، چـونکە ئیتحادیـەکان تەنگیان پێهەڵچنیوە، لەسەرەتاوە داواکەیان قبوڵ نـەکردو دوایـی رێگـەیان پێدا هات و لەئێریڤان نیشتەجێ بوو.

عەبدوڕەزاق لەساڵی١٩١١ توانیبووی سەردانی شارو گوندە کوردیەکانی ئێران بکات بۆ هاندانی کورد بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی تورکی و هاوکاری نـەکردنی هێزەکـانی ئـەوان لـەدژی ئێـران، هـەروەها مەسـەلەی شۆڕشـێکی بەرفراوانی لەگەڵ کوردەکانی ناو خاکی ئێران هێنابووە گۆڕێ، عەبـدوڕەزاق وریـایی دابـووە کـوردان ئەگـەر هێزەکانیـان یـەك نەخـەن ئـەوە ئەرمـەن

بەپشتیوانی دەوڵەتانی ئەورووپی دەوڵەتی ئەرمەنی لەسەر خاکی کورد دادەمەزرێنێت، ڕەزامەندی سەرۆکە کوردەکانیش بۆپڕۆژەکەی عەبدوڕەزاق پەیوەستە بەپشتیوانی رووسیەوە، عەبدوڕزاق لەباسی سەفەرەکەیدا دەڵێ (لەماکۆوە هەتا ولایەتی موسڵ پەیوەندیمان کردووە بەسەرۆکە کوردەکانەوەو مەسەلەی کۆتایی هێنانمان بەزوڵمی تورکی باس کردووە)[133]، عەبدوڕەزاق بەگ لەناو ئەو سەرکردە کوردانەی پەیوەندیان بەئەوە هەیە ناوی سمکۆ دێنێ‌و بەیەکێك لەشوێنکەوتووانی خۆی باسی دەکات لەگەڵ سەید عەلی خێزانی‌و سەرکردەکانی هەکاری‌و دەڵێ زانایان‌و شێخانی دهۆکیش کۆبوونەتەوە بۆلێکۆڵینەوە لەسەر ئەو پڕۆژەیە، دوایی دێتە باسی چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ سەید تەهاو سەردار ماکۆ (مورتەزا قولی خان) قەناعەتی وایە ئەمیان بۆ بەرژەوەندی نەتەوایەتی دڵسۆز نیە، ناوی کورد بەگ دێنێ‌و دێتە سەر پەیوەندیەکانی بەشێخانی بارزان‌و ژەنەراڵ شەریف پاشا لەپاریس[134].

لەکۆتایی ساڵی ١٩١٢ یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەحەلەب لەراپۆرتێکی‌دا باس لەبزوتنەوەیەکی دژ بەتوورکان دەکات لەکوردستانی باکور(١٣٥) گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی ئەوە مەترسی دروست دەکات لەسەر رژێمی تورکی، خانەوادەی بەدرخان حوسین پاشاو حەسەن پاشاو عەبدولکەریم پاشا بەچڕی خۆیان ئامادە کردووە، شارەکانی جەزیرە، سەعرەت، مهاباد، موسڵ مەڵبەندی بزوتنەوەی بەدرخانیەکانە، کوردەکانی ئەوە بەشەی کوردستان لەهەموو ناوچەکانی‌تر بێزارتربوون لەدەسەڵاتی ئیتحادیەکان‌و بەباشترین شێوە خۆیان ئامادەکردووە بەرەنگاری دەوڵەت ببنەوە، چونکە گەندەڵی لەناو ئیتحادیەکان بڵاوببۆوە لەگەڵ رەچاونەکردنی پێویستیەکانی ناوچەکەو هەستی نەتەوایەتی کوردی‌و هاوسۆزی بۆ

سولّتان عەبدولحەمید(١٣٧)، حکومەت بۆمەبەستی بەگەڕخستنی هەوڵی کوردان بۆ شەڕەکانی بەلقان لەساڵی ١٩١٢ لەدیاربەکر کۆنگرەیەکی ڕێکخست بۆ شێخ و زانایانی کوردستان و فەرماندەکانی لەشکری حەمیدیە سەر لەنوێ ڕێکخرابوونەوە بەناوی (کتائب فرسان القبلیە الخفیفە) کۆنگرەکە کۆتایی هات بەبێ ئەوەی کورد هیچ هاوکاریەکی بەرجەستە پێشکەش بکات، سەرەڕای ئەمە بزوتنەوەی ئەرمەن بەهێز بوو، ئەمە کوردانی هاندا داوای هەمان ماف بکەن کەئەرمەن داوای دەکرد، بەهۆی نوشستی هێنانی سوپای عوسمانی لەبەلقان، لەساڵی ١٩١٢ دەوڵەتی مەرکەزی هەیمەنەی خۆی لەدەست داو زۆربەی ولایەتەکانی ئەوروپای عوسمانی بوونە وڵاتی سەربەخۆ، یاریدەدەری قونسوڵی بەرتانی لەحەلەب لەراپۆرتێکی دا دەڵێ: زۆربەی کوردان بێدوودڵی لەو قەناعەتەدان ئینگلیز چۆن پشتیوانی لەبزوتنەوەی سەربەخۆخوازی بەلقان کرد ئاوا پشتگیری لەبزوتنەوەی سەربەخۆخوازی کوردیش دەکات و ولایەتەکانی دیاربەکرو جەزیرەو سەعرەت دەخاتە سەر وڵاتی رافیدەین کەبەنیازە لەدوای کەوتنی ئیتحادیەکان دایبمەزرێنی"(١٣٨)، کوڕانی بەدرخانیش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئینگلیز پاراستبوو، حوسین پاشا هەموو سەرۆك هۆزو شێخەکانی ئاگادار کردبۆوە لەدوای تاوانەوەی بەفر خۆیان ئامادە بکەن بۆشۆڕشێکی بەرفراوان کە لەنیسانی ١٩١٣ دەست پێدەکات، پڕپاگەندەی واهەبوو رووس بایی ٢٠٠هەزار چەکدار چەك و تەقەمەنی پێویست دەدا بەکورد لەدژی ئیتحادیەکان(١٣٩).

عەبدوڕەزاق لەهەوڵی راکێشانی شێخانی کوردستانی باشوور دابوو، بەقسەی یاریدەدەری قونسوڵی لەساڵی ١٩١٣ لەوان کۆنگرەیەك هەبووە بۆ شێخان و زانایانی ئیسلامی کوردستان بۆ گفتوگۆ لەسەر هاوکاری

شۆڕشەکەی بەدرخان، هەروەها توانیبووی پشتیوانی شێخانی ئێزیدیو مارشەمعۆنی سەرۆکی تایفەی ئاشووری بەلای خۆیدا رابکێشێ، پەیوەندیشی کردبوو بەسەرۆکەکانی تاشناقو پیاوماقوڵانی ئەرمەن بەڵام ئەمان مەترسیان هەبووە لەپشتگیری بەدرخان، عەبدورەزاقو سەرکردە کوردەکانیتری هاوڕێی لەساڵی ١٩١٣ز دەیانووت لەحالەتی راگەیاندنی شۆڕشی بەرفراوانی کوردی دابنو زیاتر لەهەزار چەکدارمان هەیە(١٤٠).

لەو ساڵە عەبدوڕەزاق کۆتایی بەبەرنامەڕێژیەکەی هێنا کەبریتی بووە دەسپێکردنی چالاکی سەربازی لەسنووری توورکی ـ ئێرانی.

بەپێی ئەو نەخشەیە یەکێك لەسەرۆك هوزە چالاکەکانی سەر سنوور بەناوی سەعید بەگ هێرش دەباتە سەر ناوچەی ئوجاغ، عەبدورەزاقیش سەرکردایەتی هێزێك دەکات بۆ رزگارکردنی بۆتان، سەید تەهاش سەرکردایەتی هێزەکەی دەکات بەئاراستەی باشقەڵا، لەهەمان کات سمکۆ هێرش دەباتە سەر ناوچەی سەرا لەسەرسنوور(١٤١).

لازاریف بۆمان دەگێڕێتەوە عەبدوڕەزاق چی بەقونسوڵی رووسی وتووە: ( ئێمە هەموو شتێکمان ئامادە کردووە، چاوەڕوانی پیاوی نیشتمانی موسا بەگ دەکەم لەوانەوە سەردانی ئێران بکات بۆدانانی رێوشوێنی کۆتایی، دەتوانین وان بگرینو لەوێ هاوسۆزی زۆربەی سەربازە کوردەکانی ناو سوپای عوسمانی لەگەڵماندان بۆئەو پرۆژەیە، ئەمە سیاسەتی دروست نیە ئێمە ناتوانین بەرەنگاری هێزەکانی توورکیا ببینەوەو هێرش بەرین، هێندە ساویلکەش نین لەم بارودۆخە پشت بەرووس ببەستین، بەخێرایی دەڕۆم بۆئێرانو داوا دەکەم بمکاتە حاکمی کوردستانو پەیمانیان دەدەمێ توورکان لەخاکی ئێرانی لەکوردستان دەردەپەڕێنم، نەسر ملوك (حاکمی ئازەربێجان= نووسەر) دەناسمو لەکۆنەوە دۆستایەتیم لەگەڵیدا هەیە،

ئەگەر داوایەکەیان قبوڵ نەکردم ئەوکات بەزەبری هێز سەلماس یان ورمێ داگیر دەکەم‌و دوایی بروسکەیەك بۆ شا دەکەم‌و دڵسۆزی خۆمی بۆ بەدیار دەخەم‌و ئامادەی دەردەبڕم بۆ دەرپەڕاندنی تورك لەخاکی ئێران‌و کاردەکەم بەراوێــژ لەگــەڵ قونســوڵی رووســی. رزگــارکردنی کوردســتان پێویســتی بەپێگەیەکی دەست پێکردن هەیە، کوردستانی ئێرانیش گونجاوە ببێتە ئەو پێگەیــە، لەکوردســتانی تورکیــا هــەموو شــتێك ئامادەیــە ئــەوان تــەنها پیویســتیان بەیــەك ئیشــارەتە، بــەڵام لــەوەدا کــورد هــەموو یــەك دەنگــن کەپێویستیان بەرووسە(١٤٢).

نەخشــەی عەبــدوڕەزاق‌و حەســەن‌و حوسـەین کـوڕانی بـەدرخان نـەبوو بــەواقیع‌و شۆڕشــی چــاوەڕوانکراوی کــوردان هەڵنەگیرســا، دیــارە ئــەم سەرنەگرتنەش چەند هۆکارێکی هەیە، لازاریف هەڵسەنگاندنێکی باشمان دەداتـێ لەســەر نەخشــەکەی عەبـدوڕزاق‌و ئەولێڵیــەی بەتێگەیشـتنی خـوی لەسەر چەند خاڵێك دیاری دەکات. یەکەم:- نەخشەی عەبدوڕەزاق یەکی نەدەگرتــەوە لەگـەڵ ئـەو ناکۆکیـەی هـەبووە لـەنێوان سـەرکردە کوردەکـان، بەرپرسـانی تـورك ژمارەیـەك لەسەرکردەکانی کوردیـان لـەدژی بزوتنـەوەی کــوردان بـــــــــەکاردەهێنـــا. دووەم:- خوێندنـــەوەی عەبـــدوڕەزاق بـۆلاوازی ئێــران خوێندنەوەیــەکی نــاواقیعی بـوو. لەســاڵی ١٩١٢ز هێــزی دەسەڵاتی مەرکەزی لەئێران لەزیاد بوون دابوو، بەرپرسانی ئێرانیش لەگەڵ توورکان رێککەوتبوون لەسەر بەرهەڵستی نەخشەی عەبدوڕەزاق‌و سمکۆ، ئێرانیــەکان پشــتیوانی هیزەکــانی توورکیــان دەکــرد لــەزانیاری‌و لۆجســتی بۆراوەدوونـــانی ســـەرکردەکانی بزووتنـــەوەی کـــوردی، لەســـاڵی ١٩١٢ز رووســەکان سمکۆیــان کردبــووە حــاکمی قوتــور(شــارێکی ســەر ســنوورە) حاکمی تەفلیس کەفەرماندەی سوپای رووسیش بووە لەقەوقازو مەدالیای

زێزلێنانی داوەتێ، پارەی تایبەت دراوە بەو پاسەوانانەی لەژێر فەرماندەی سمکۆ دابوون، بەڵام هەریەك لەتورکیاو ئێران رازی نەبوون ئەو پلەو پایە دراوە بەسمکۆ، سێیەم:- عەبدوڕەزاق هەڵسەنگاندنێکی واقیعیی و زانستییانەی نەبووە بۆ هێزی خۆیی و توانای تورك لەناوچە سنوورییەکان چونکە لەگەڵ ئەو بارودۆخە نالەبارەی کوردی ئێرانی تێکەوتبوو، پێیان وابوو دەوڵەتی عوسمانی سوونیەو خۆیان بەدۆستی تورك دەزانیی و توورکیاش لەبەرانبەر مەترسی هەوڵەکانی ئەرمەن کەبەناوی چاکسازیەوە دەستبەسەراگرتنی ناوچە کوردیەکانیان مەبەست بوو، بۆیە کەوتبووە بەکارهێنانی بانگەوازی جامیعەی ئیسلامی دەیویست کورد بەلای خۆیدا رابکێشێ و عەبدوڕەزاق و هاوڕێکانی بکاتە ئامرازی دەستی رووس بۆ جێبەجێ کردنی نەخشەی ئەرمەنی، هەر بۆنمونە عەبدوڕەزاق لەساڵی ١٩١١ز دەگاتە وورمێ، قونسوڵی توورکی بەو هێزەی لەبەردەستی دابوو لەوێ عەبدوڕەزاق دەگرێ، دوای هەوڵی زۆری قونسوڵی رووسی ئازاد دەکرێ(١٤٣) (عەبدوڕەزاق)یش لەیاداشتەکانیدا دەنووسێ:-

کاتێك گەیشتمە ورمێ هەوڵم دا بچمە قونسوڵیە بەڵام قونسوڵ لەوێ نەبوو، تێگەیشتم شار بەتەواوی لەبن دەستی قونسوڵی تورکی دایە، هەوڵم دا بەشێوەیەك متمانەی قونسوڵی تورکی بەدەست بهێنم. دوای دوو رۆژ قونسوڵی رووسی گەڕایەوە ورمێ منیش چووم داوای لێبکەم پەنام بدات، ماوەی هەفتەیەك لەوێ گیرم خوارد، ئەو ماوەیە بەهەموو شێوازێك قونسوڵی رووسی هەوڵی دەدا دەرم بهێنێ، هەتا هەڕەشەی هێرش کردنە سەر قونسوڵیەی کرد.

هەتا دوایی قونسوڵی تورکی هاتە قونسوڵیەی رووسی و فەرمانی لێبووردنی سوڵتانی خوێندەوە لەسەر لێبوردنی من. بەڵام قونسوڵی

رووسی لەگەڵ ئەوەدا قونسوڵی تورکی مەفرەزەی زۆری لەدەوری قونسوڵیەو دەوری شار دانابوو قونسوڵی توانیبووی ڕێوشوێنی فڕاندنم ڕێك بخات، لەوێ بۆم دەرکەوت بەرپرسانی ئێرانی هەموو پشتگیریەکی قونسوڵی تورکیان کردووە لەدژی من(١٤٤).

چوارەم:- عەبدوڕەزاق لەپشتبەستن بەرووس هەڵە بووە، رووسەکانیش لەگەڵ ئەو راستگۆ نەبوون، بۆنموونە عەبدوڕەزاق دەڵێ:- گیرکۆف هاوڕێیەکی بەئەمەك و هاوپەیمانی کوردە، کەچی لازاریف لەهەمان گیرکۆف دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی (عەبدورەزاق دەیەوێ هاوکاری رووس بەدەست بێنێ لەو رووداوانەو هەندێ گۆڕانکاری بۆبەرژەوندی کورد ... رێگەدان بەکورد بۆدانانی پێگەیەکی شۆڕش ئەمەیان شتێکە... بەڵام نابێت رێگە بدەین بەسەرهەڵدانی دەوڵەتی کوردی چونکە دوایی ئەو دەوڵەتە دەکەوێتە ژێرکاریگەری جامیعەی ئیسلامی) هەندێ لەکورد مینۆرسکی بەدۆستی کورد دەزانن کە بەعەبدوڕەزاق دەڵێ پیاوێکی ئینتهازی و بەسەید تەها دەڵێ پیاوێکە جێی متمانە نیە، هاوکاری بزوتنەوەی کوردی بەهەڵە دەزانێ چونکە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان دەبێتە هۆی نائارامی لەسنوورەکانی نێوان رووس لەگەڵ هەریەك لەئێران و دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش زیان دەدات لەبەرژەوەندی ستراتیژیەتی رووسی لەو هاوپەیمانیەی لەگەڵ بەریتانیا لەساڵی ١٩٠٥ز وە هەیەتی، هەروەها بەبەردەوامی وەزارەتی دەرەوە جەختی لەسەر بەکارنەهێنانی کورد دەکردەوە وەك کارتی فشار چونکە کورد فاکتەری نائارامین(١٤٥). لەدوایشدا ناکۆکی جەوهەری هەبووە لەنێوان عەبدوڕزاق و سمکۆ لەسەر شێوازی کارکردن، سمکۆ لەعەبدوڕەزاق نیگەران بوو بەوەی پارەی کۆمەڵەی جیهانزانی بەکارهێناوە بۆ کڕینی چەك بۆ هەندێ لەلایەگرانی هەتا لەسەر سنوور بۆناو خاکی

توركیا لەوان و ئەرزرۆم کاری سەربازی سنووردارئەنجام بدەن، سمکۆ بزوتنەوەیەکی چەکداری بەرفراوانی بەچاکتر دەزانی[١٤٦].

کورد لەنێوان خۆیاندا یەکدەنگ نەبوون لەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشێکی بەرفراوان، بەشێکی هۆکاری نووشستیمان لەرەخنەکانی لازاریف بۆباسکردن، سەرەڕای ئەوانە جیاوازیەکی زۆری هەبووە لەبۆچوونی حەسەن و حوسێن و عەبدوڕەزاقی برازایان، عەبدوڕەزاق دەیویست بەتەنها سەرکردایەتی خانەوادەی بەدرخانیەکان بکات و حیساب بۆ مامەکانی نەکات، بۆ نمونە لەیاداشتەکانی‌دا لەو کەسایەتیانەی پەیوەندی پێوەکردوون ناویان ناهێنێ، ئەوە بەهۆی ساردی نێوانیانەوە بایەخیان پێ‌نەداون، ئەمە لەکاتێکدا کوردستانی باکور بەتایبەتی ناوچەی بۆتان ملکەچی نفوزی حوسین بەگن و بەو ئەندازەیە عەبدوڕەزاق لەوێ ناسراو نیە، جیاوازی ریشەیی هەیە لەنێوان بۆچوونی عەبدورەزاق و مامەکانی لەسەر شۆڕشێکی بەرفراوان. عەبدوڕزاق هاوپەیمانیەتی رووسی پێ‌چاك بووەو بڕوای بەپێشەنگیەتی رۆشنبیری رووسی و دەوڵەتی رووسی هەبووە وەکو هاوپەیمان بۆ کورد، چەندین جار دووپاتی کردوتەوە کەشێخ عوبێدوڵڵای نەهری هەڵەبووە لەوەی پشتی بەئینگلیز بەستووە، دەبێت بەسەرپەرشتی رووس بۆدەوڵەتی سەربەخۆی کورد تێبکۆشین، بەڵام حەسەن و حوسین قەناعەتیان وابوو پێشتر ئینگلیز یارمەتی ئالی سعود و خدێوی میسری داوە بۆسەربەخۆیی لەدەوڵەتی عوسمانی. ئێستاش بەرژەوەندی هەیە لەکوردستان و هاوسنووری ولاتی رافدین و یارمەتی دەرە بۆ هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی یان سوود وەرگرتن لەباشی پەیوەندی بەریتانیا بەدەوڵەتی عوسمانی بۆبەدەستهێنانی حوکمی زاتی بۆ کورد لەچوارچێوەی توركیا. حەسەن و حوسەین لەکوردستانی باکورو عەبدولکەریم مەکتوبچی

برایان لەموسڵ پەیوەندی باش و پتەویان هەبووە بەقونسوڵیەکانی بەریتانی لە دیاربەکروموسڵ و وان(١٤٧). بەمەبەستی قوڵکردنەوەی ناکۆکی نێوان سەرکردە چالاکەکانی کوردو ئیتحادیەکان سەرلەنوێ لێبوردنی گشتیان بۆشێخ عەبدولقادری نەهری راگەیاندو هەموو دەرفەتێکی هاتووچۆیان لەناوچە سنووریەکانی نێوان تورکیا و ئێران پێدا، ئەمەش هەنگاوێك بوو بۆبێ هێزکردنی نفوزی سەید تەهای برازایی و عەبدورەزاقی هاوپەیمانی رووسی لەناو هۆزە کوردەکاندا(١٤٨). لەتشرینی یەکەم و کانوونی ١٩١٢ز جولانەوەیەکی تری کوردی هەبووە بەدەر لە نەوەکانی بەدرخان بەسەرۆکایەتی بوسراوی لەتەرابلس و کوڕەکەی ئیبراهیم پاشای میللی و مستەفا پاشا ناوێك لەجەزیرە، ئەو بزوتنەوەیە دژایەتی ئیتحادەیەکانی دەکرد چونکە هۆکاری مردنی ئیبراهیم پاشا و کوڕە گەورەکەی بوون و هەروەها شەریعەتیان خستۆتە پەراوێزەوە، سوڵتان عەبدولحەمیدیان لەسەر کار لابردووە کە تاکە پەیوەستی نێوان کوردو تورك بووە، نوشستی عوسمانیەکان لەشەڕی بەلقان بوسرایی و کوڕانی ئیبراهیم پاشای قەناعەت پێکرد (کەرۆژی تووركان لەئاوابوونە)، بەپێی راپۆرتی هێزا (فانتانا) یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەحەلەب (شێخ بوسرای و نەوەکانی ئیبرهیم پاشای میللی و مستەفا پاشا ٢٠٠هەزار چەکداریان ئامادەکردووە و بەم زوانە لەبیری هێرشکردنە سەر حەلەب دان، سەرکردەکانی بزووتنەوەی کورد قەناعەتیان وایە چارەنووسیان بەستراوەتەوە بەعەرەبەوە و ئەوان ئێستا ئامادەن بەیعەت بدەن بە یەکێك لەشەریفەکانی مەکە ئەگەر خەلافەت رابگەیەنن(١٤٩)، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر پەرت و بڵاوی جولانەوەی کوردی لەرووی ئامانج و لێدوانەوە، بۆیە ئیتحادیەکان بۆ لەباریەك بردنی رقی کوردو پووچەڵکردنەوەی شۆڕشێکی بەرفراوان سیاسەتێکی نەرمیان

بەرانبەر کورد پیادە کرد، لەسنووری دەسەڵاتی هەردوو برا حەسەن و حوسێن لەئازاری ساڵی ۱۹۱۳ز راپەڕینێکی جەماوەری لەشاری جەزیرەو میدیاد پەیدا بوو، حکومەتی ئیتحادیەکان لەرێگەی حەسەن پاشای والی دیاربەکرەوە لەهەوڵی گەڕاندنەوەی ئاسایش دابووە بۆ ناوچەکە. لەواقیعدا ئەو راپەڕینە لەشەڕی نێوان دەرویش ئاغاو قایمقامی میدیاد کەوتەوە، حوسێن پاشا داوای لەحکومەت کرد یەکەم جار خۆیی و دوایی لەو کوردانەی ئەو دوو شارە ببووری کە بەشداریان لەو راپەڕینە کردووەو ژمارەیان دەگەیشتە ٦٠کەس، لەو راپەڕینە قائمقامی جەزیرەو میدیادو دوو لەبەڕێوەبەری ناحیەکانی ناوچەکەیان دەرکردو داوایان لەکورد کرد ئەو باجە حکومیانە نەدەن کەلەسەریان دانراوە(۱۵۰) هەر خێرا رەزامەندیان لەسەر ئەو داواکاریانە دەربڕی، بەمەش نفوزی حوسین پاشا زیادی کرد(۱۵۱) ئیتحادیەکان هەموو هەوڵی خۆیان خستەگەڕ هەتا نەیەڵن گڕی راپەڕین بپەڕێتەوە بۆ دەرەوەی بۆتان، هەر لەو ماوەیە چەندین بەرپرسی حکومی سەردانی ناوچەکەیان کردو نیەت پاکی خۆیان بۆ کورد دەرخست کە هەموو کێشەکانیان بەئاشتی بۆچارەسەر دەکەن، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەحەلەب دەڵێ (لەم رۆژانەدا حکومەت زۆر رێوشوێنی گرتۆتەبەر بۆ رازی کردنی کورد) حکومەت ئەوەی مەبەستی بوو دەستی کەوت لە لەباریەك بردنی راپەڕینەکە بەر لەوەی بەشەکانیتری کوردستان بگرێتەوە، بەئەمری خوا دوای دوو مانگ حوسین پاشا بەدرخان مرد، بەمەش زیانێکی گەورە لەجولانەوەکە کەوت کەئامادەکاری هەبوو بۆسەرهەڵدانی شۆڕشێکی بەرفراوان، حەسەن پاشای برا بچوکیش وەکو کاکی خاسیەتی سەرکردەیی تیا نەبوو، قونسوڵی بەریتانی لەدیاربەکر زۆر بەوورە دابەزیوی بینیویەتی، وتوویەتی کورد بەتەنها داوای ئەو مافە رۆشنبیریە دەکەن

لەگـەڵ دامەزرانـدنی بەرپرسـانی کـوردە لەناوچـەکە لـەکورد خـۆیو کەمکردنەوەی باجو گواستنەوەی کاربەدەستە گەندەڵەکانی کوردستان(١٥٢)

لەسـەر کارئاسانی ئیتحادیـەکان لەدەستبەسـەراگرتنی شۆڕشـی کوردو خاوکردنـەوەی رقـی کـوردانو لەگـەڵ ئـەو گۆڕانکاریـە رووکەشـیەی لەسیاسـەتی دوژمنکارانـەی ئـەوان هاتـەدی بەرانبـەر کـورد بەپێچـەوانەی مامەڵەی پێشوو مەکدواڵ دەڵێ:-

ئیتحادیـەکان لـەدوای چـەند ساڵ لەدەسـەڵاتیان تێگەیشـتن لەسروشـتی بـەرەنگاریو گەیشـتنە ئـەو قەناعەتـەی سیاسـەتی عەبدولحەمیـد بەرانبـەر کـوردان راسـت بـووە، بۆیـە ناچـاری لاسـایی کردنـەوەی ئـەو بوونـەوە. بەمەسـتی قەناعـەت پێهێنـانی سـەرکردەکانی کـورد لەفەرمانـدەکانی حەمیدیەی لێك هەڵوەشاوەی پێشوو ئیتحادیەکان موحەمەد سادق نەهریان نـارد بۆئێران هـەتا فەرماندە کوردەکانی پێشووی سەرکردەکانی حەمیدیە بگەڕێنـەوە بۆتورکیـا و لەشـکری حەمیدیـەی لێـك هەڵوەشـاوە دووبـارە دابمەزرێنێتـەوە بـەناوی (کەتیبـەی هۆزەکـان بـۆ سـوارەی سـووك). ئیمتیازاتـەکانی پێشـووی بۆسـەرۆك هۆزەکـان گەڕانـدەوە، هـەروەها ئیتحادیـەکان بـەبێ دوودڵـیو بـۆ سـەرنەگرتنی یەکیـەتی نێـوان کـوردو ئەرمـەنو نزیـك نەبوونـەوەی کـورد لـەرووس، لەگەڵ راکێشـانی کـورد بـەلای خۆیاندا دروشمی جامیعەی ئیسلامیان بەرز کردەوە(١٥٣).

پـارتی ئـازادیو ئیئـتلاف لەئەسـتەنبوڵ لـەحوزەیرانی ١٩١٢ز بەهەڵگەڕانەوەیەکی سەربازی هاتنە سەر حوکم، نەتەوەکانی تری ناتورك نفوزیـان لـەو پارتـەدا هـەبووە، مـاوەی ساڵێك کوردستان لەسایەی پارتی ناوبراو جۆرێك لەکرانەوەی بەخۆوە بینی، ئیئتلافیەکان کەوتنە بانگەوازی جامیعـەی ئیسـلامی لـەناو کـوردان، لـەو ماوەیـەدا هەریـەك لەشێخ

عەبدولقادری نەهری و مەلا سەعیدی نەورەسی سەردانی کوردستانیان کردو داوایان لەکوردان ئەوە بووە بەرووی ئەو پیلانە بوەستنەوە کە دەوڵەتی عوسمانی بەو دەردە برد، هەروەها جەختیان لەسەر برایەتی ئیسلامی دەکردەوە لەناو گەلانی ئیسلامی، بۆرازیکردنی کورد حکومەت ئەو زەوی‌یانەی دەستیان بەسەراگرتبوو دەکرینەوەو بۆچارەسەکردنی گیرووگرفتەکانی کوردستان بەخۆڕایی دەیاندا بەئەرمەن، گەرچی ئەم سیاسەتە جیٚبەجیٚ نەکرا، بەڵام ئەمە بەڵگەیە لەسەر جدیەتی حکومەت بۆ رازی کردنی کورد بەشێوەیەکی کاتی(١٥٤)

لەکوردستانی ئێرانیش بارودۆخ لەبارنەبوو بۆهەڵگیرسانی شۆڕشی کوردایەتی. مەکدواڵ دەڵیٚ بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی شوێنەواری گەشەسەندنی نەتەوایەتی لەدایك نەبوو، لەراستی‌دا لەو زەمانە هەستی کوردایەتی لەکوردستانی ئێران رێك نەخرابوو بەڵکو لێرەو لەویٚ هەوڵی تاك تاك هەبوو بۆبەدەستهێنانی ئەندازەیەك لەحوکمی زاتی، لەدیارترین ئەو هەولانە لەساڵی ١٩٠٠ قازی فەتاح پرۆژەیەکی لەجیاتی کوردەکانی موکریان دابوو بەحکومەتی ئێرانی داوای کردبوو هەتا دەرفەتێکی‌تر ئەندازەیەك لەباج لەسەر خەڵکی لاببریٚ‌و هەروەها حاکمی کوردستان لەمهاباد بێت. حکومەتی ئێرانی قازی فەتاحی گرت هەتا دوای شۆڕشی دەستووری بەرنەبوو. دوایی قازی فەتاح گەڕایەوە مهابادو سەرکردایەتی کۆمەڵەیەکی لەپێناو دەستوور(ئەنجومەن) گرتە ئەستۆ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجومەن لقی لەزۆربەی شارەکانی کوردستانی ئێراندا کردەوە، بەڵام جولانەوەی دەستووری لەتوێژێکی سنووردار دا مایەوە، جەماوەری کورد یان بایەخی پیٚنەدا یان پشتگیریان نەکرد، ئاغاکانی کوردستانیش لەگەڵ دەسەڵاتی مەرکەزی کەوتنە دژایەتی دەستوور، ئاغاکان لەپشتگیری

حکومەت هەڵوێستی ڕۆشنیان هەبوو بەڵام سمکۆ لەسەرەتاوە بەئیشارەتی ئیتحادیەکانی تورکیا لەخوی و سەلماس هاوکاری لایەنگرانی بزوتنەوەی دەستووری دەکرد، هەروەها هەڵوێستی ئاغاکان بەتەواوی لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی بوو، لەسەرەتاوەو بەئیشارەتی ئیتحادیەکان لەخوی و سەلماس سمکۆ پشتیوانی لەبزوتنەوەی دەستووری دەکرد، بەڵام کەپەیوەندی بەرووسەوە بەهێز کرد کەوتنە هاوکاری سەردار (ماکۆ) مورتەزای قولی خان دژی لایەنگرانی بزوتنەوەی دەستووری(١٥٥).

بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی بارودۆخی کوردستانی ئێران لەباربوو بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردی بەڵام نەبوونی هوشیاری نەتەوایەتی و سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو کەبتوانێ جەماوەری کورد جۆش بدات و ڕینومایی کورد بکات هەروا بەبێ ئاکام مایەوە. بارودۆخی کوردستانی بن دەستی عوسمانی باشتر نەبوو لەهی بن دەستی ئێرانی، هەموو ڕاپۆرتەکانی رووسی و بەریتانی لەسەر ئەوە یەکدەنگن ئەو بەشەی کوردستان لەبارێکی زۆر خراپ دابووە، گەندەڵی ئیداری و شلەژانی باری ئاسایش باری بەسەر ئەوێدا کێشابوو، لەساڵی ١٩٠٩ز رووسەکان بەشێکی ئازەربێجان (بەشێکی کوردستان)نیان بەبیانووی دەرپەڕاندنی تورکان داگیر کرد (میر شوجاع ئەلدەولە)یان وەکو حاکم لەسەر دانا. ئەویش ئیرادەی لاوازی قونسوڵ و فەرماندە سەربازیەکانی رووس فەرامۆشیان کردبوو. حکومەتیش دەیویست دەسەڵاتی خۆی بگەڕێنێتەوە ناوچەکە، خەڵکی و بەتایبەتی جوتیاران دەبوایە چەندین باج بدەن، حکومەتیش دڵڕەقانە دەستی دابووە کاری سزادان و گرتن و دەرپەڕاندن، ئاغا کوردەکانیش لەلای خۆیانەوە بەلایەك بوون بەسەر شانی گوندەکانەوە(١٥٦).

لەناوچـە سـنووریەکانی ئێرانـی ـــ عوسمـانی زۆر خـراپتر بـوون لەشوێنەکانی‌تر، چـونکە ببـووە شـوێنی تـەراتێنی هێزەکـانی تورکیـا بـۆ دەسـەڵات سـەپاندن‌و داگیرکـردن. چـەند شـەڕێکی نـاوخۆی نێوان هۆزەکـان زیـاتر بارودۆخەکـەی بـەرەو خـراپتر بـرد، هـۆزە کوردەکـانی ناوخـاکی عوسمانیش ئەو بارە نالەبارەیان قۆستەوەو بەناوی تۆڵەسەندنەوەو خوێن‌و تـالآنی‌و دەستبەسەراگرتن ناو بەناو شالآویان دەهێنایە سەر کوردستـانی دیـوی ئێـران بەتایبـەتی بـۆ سـەر ورمـێ‌و خـوی. لازاریـف لەباسـی ئـەو بارودۆخـەدا دەڵـێ: لـەدوو ساڵی دوایـی بـەر لەشـەڕی جیهـانی بـارودۆخی ناوچە کوردیەکان لەبایەزیـد هـەتا کرماشان بەئەندازەیەك خراپ بوو داوای پاراستنی رووسیایان دەکرد هەتا لـەرووی هـاولآتیبوون‌و بـاج‌و پاراستنەوە لەبەرانبـەر گەنـدەڵی ئیـداری ببنـە بەشـێك لەرووسیا. هەنـدێ لەشـێخەکانی کورد وەکو سەلیم پاشای زیلان‌و مامە سدیق‌و حوسێن پاشای حەیـدەرانلی داوایـان کردبـوو بێنـە ژێـر چـاودێری قونسـوڵی رووسـی(١٥٧). یاریـدەدەری قونسـوڵی بـەریتانی لەحەلـەب لەراپۆرتەکەیـدا جـەخت دەکاتـە سـەر ئـەو مەسەلەیەو دەڵێ:-

شـێخە کوردەکـانی کوردسـتانی ئێـران سـکالآیان هـەبووە لـەباری ناهەمواری گوندەکانیان‌و ئەو باجە حکومیە زۆرانـە، شێخەکانی دیبوکری‌و بـەگزادە بەڕاشکاوی لەهەرەسهێنانی ئیدارەی حکومـەت دەدوان، سـەربازە تورکـەکان ژمارەیـەکی زۆری کوردیـان دەپاراسـت لـەئێران هـەتا دەسـتی ئیسـتیقلالی کاربەدەسـتە فارسـەکانیان نـەگاتێ کـە لێـرەو لـەوێ ژمارەیـان زیادی دەکرد راپەڕینیش بەم دواییـە دەستی پێکرد. شێخەکانی بـەگزادەو دیبوکری دەڵێن هۆزی ئێمە دەتوانێ ٢٠هەزار چەکدار ئامادە بکەن‌و ئێستا ١٥هـەزار چـەکی ماوزەڕمـان هەیـە، کـورد ئامـادەی شۆڕشـن بـەڵام

سەرکردایەتیەکیان دەویْ لەدەست ئیدارەی مشەخۆری فارسەکان دەری بهێنیْو ئێستا کورد ئامادەن بێنە ژێر ئیدارەی بەریتانی(١٥٨).

## کوردستان لەسالأنی شەڕی یەکەمی جیهانی

هێژا د.کەمال مەزهەر لەکتێبە بەبەهایەکەی (کوردستان لەسالأنی شەڕی یەکەمی جیهانی‌دا) زۆر بەدرێژی باسی بارودۆخی کوردانی کردووە لەماوەی شەڕ. سەرەڕای ئەوەش پێویستە ئێمە لێرەدا بەکورتی لەسەر هەندیْ لەرووداوەکان بوەستین، بەر لەوەی شەڕ دەست پیْبکات ناکۆکی نێوان ئیمپراتۆریەتی بەریتانی‌و ئەڵمانی لەبەرژەوندی ئەڵمانیا کۆتایی هات‌و هاوپەیمانیەتی نێوان ئەڵمانیاو عوسمانی لە ٢ی ئابی ١٩١٤بەسترا. سێگوچکەی دیکتاتۆریەت تەلعەت، ئەنوەر، جەمال بەتەواوی کەوتنە سەربازگەی ئەڵمانی. لەهەفتەی یەکەمی شەڕ گوێبیستی بیْلایەنی هەڵوێستی عوسمانیەکان بوون، بەلاْم لەتشرینی دووەمی ساڵی١٩١٧ ئەڵمانیا قەناعەتی بەدەوڵەتی عوسمانی هێنا شەڕ لەسەر هاوپەیمانەکان (رووسیا، بەریتانیا، فەرەنسا) رابگەیەنیْ، ئەڵمانیا بەهیوا بوو دەوڵەتی عوسمانی هاوپەیمانەکان بەتایبەتی رووسیا ناچار بکات بەشێکی زۆری هێزەکانی لەشەرگەی باشووری قەوقاز سەغڵەت بکات‌و بەریتانیەکان ناچار بکات بەشێکی زۆری هێزەکانیان لەبەرەی میسر بهێڵێتەوە، ئەمەش هەڵوێستی مەیدانی ئەڵمانیا بەهێز دەکات(١٥٩).

مسۆگەرکردنی دۆستایەتی کورد لەماوەی شەڕ جیْی بایەخی بنەڕەتی ئەڵمانیاو هاوپەیمانەکان بوو، بۆیە ئەڵمان بەشێکی توانای هەواڵگری سەربازی خۆی تەرخان کرد بوو لەرێگەی پشتیوانی کردنی پرۆژەی

جیهادو بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی بۆ راکیشانی کورد. لەگەڵ ئەوەشدا کورد تاکە ئامانجی ئەو بانگەوازە نەبووە، بەلام لەگەلانی‌تری ناو دەولەتی عوسمانی زیاتر تەئسیری لەکورد کرد، هۆی بەدەستهێنانی ئەم سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆنزیکی کوردستان لەئەستەنبوڵ و هەستی ئەوکاتەی دۆستایەتی ئەوان بۆ ئیسلام. ئەمەش داینەمۆی هاوکاری کوردان بووە بۆ توورك. بۆیە رووسیاش کەوتە پشتگیری میلیشیاتە ئەرمەنیەکان بۆئەنجامدانی شەڕی قڕکردن لەکوردستان. لەدوای تێکشکانی دەولەتی عوسمانی لەشەڕی (ساری قامیش) لەنیسانی ١٩١٥ ئەو شەڕی قڕکردنە دەستی پیکرد(١٦٠).

لەگەڵ گەیشتنی هێزەکانی بەریتانی بۆبەغدا مێجەرسۆن ئەرکی راکێشانی هۆزە کوردەکانی پی‌سپێردرا، لەدوای داگیرکردنی خانەقین سۆن کرایە ئەفسەری سیاسی لەخانەقین و بەپارە لیوایەکی لەخانەقین لەکورد پێکهێنا ژمارەیان دەگەیشتە ٢٠٠چەکدار، هەروەها هەمان سەرکەتنیشی لەگەڵ هۆزەکانی کەلهوڕ بەدەستهێنا، بەمەش ئەمنیەتی هێڵی بەیەکگەیاندنی نێوان بەغداو کرماشانی مسۆگەر کرد، بەکەلهوڕ لەسەنجابیەکانی دۆستی ئەلمانیای‌دا، بەلام هەر لەسەر سیاسەتی بی‌متمانەیی بەکورد بەردەوام بوون . هەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆسیالزمی ١٩١٧بەماوەیەکی کەم بەر لەکۆتایی هاتنی شەڕ مینۆرسکی پێشنیاری بۆ حکومەتەکەی کردبوو حوکمی زاتی بدات بەکوردان یان بۆ دوای شەڕ بەلێن بدات ئەو مافە دەدات، بەلام ئەمە درەنگ بوو هەروەها نەیتوانی بۆچوونی کوردان لەبەرانبەر رووس بگۆڕی(١٦١).

لەڕێکەوتنامەی نهێنی سایکس بیکۆی ساڵی ١٩١٦ی لەسەر دابەش کردنی مومتەلەکاتی عوسمانی لەسەر ئەو بەرنامە تەقلیدیەی سیاسەتی

بەریتانی دەڕۆیشت کەراستەوخۆ خۆبواردن بوو لەسنووری نفوزی رووسی. عێراق لەسەر نفوزی بەریتانی و کوردستانی باشوور درابوو بەفەرەنسا و کوردستانی باکور بەرووسیا، ئێرانیش دەوڵەتێکی دۆستی بەریتانیایەو دەبێت یەکیەتی خاکی پارێزراو بێت، لەدوای شۆڕشی کۆمۆنیستی رووسیا پاشەکشەی کردو رێکەوتننامە نهێنییەکان لەناویاندا رێکەوتنامەی سایکس بیکۆی ریسواکرد، بەریتایاش لەپێناو کوردستانی باشوور فەڕەنسای قەناعەت پێهێنا ئەویٚ بۆ بەریتانیا بیتو لەبەرانبەردا دەست نەخاتە کاروباری فەڕەنسا لەسوریا.

سەرەڕای بەنهێنی دابەشکردنی کوردستان گرنگترین ئاکامی شەڕ لەسەر کورد ئەو لەناوبردنو برسیەتیە بوو کەلەناو کورد بڵاوبۆوە، تۆرانیەکان بەلاسایی دەوڵەتە ناسیونالستەکانی ئەوروپا (کەلەسەر یەك رەگەزو لەناوبردنی رەگەزەکانی‌تر(جینۆسایدا) دامەزرابوون) بە قڕکردن بێت یان دەستبەسەراگرتنی رۆشنبیری کەوتنە لەناوبردنی کورد، بەبیانووی روودانی شەڕی رووسی و داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن رووسەکانەوە (٦٠٠) هەزار کوردیان گواستەوە بۆ بەشەکانی‌تری تورکیا، ئەمەش بەبیانووی شەڕ، لەڕاستی‌دا بۆمەبەستی بەتورککردنی کوردو گواستنەوەو نیشتەجیٚ کردنی کورد لەناوچەیەك کەرێژەیان لەسەدا دە تێپەڕ نەکات، بەمەش ملوێنێك کورد بەهۆی شەڕی یەکەمی جیهانیەوە کوژران و ئاوارەبوون(١٦٢). فەرماندە سەربازیەکانی رووس کەلەژێر کاریگەری سەرکردە سەربازیە رەگەزپەرستو کوشتارچیەکان و کەنیسەی رووسی ئەرتۆدەکسی دابوون لەکوردستان وێرانکاری و تاڵان و ئابڕۆبردنی (کوردانی کافرو بکوژانی ئەرمەن) دەستی پێکرد، بەم شێوەیە شەڕی لەناوبردن لەشاری قامیلیشەوە دەستی پێکرد بۆ وان و بایەزیدو بەخوی و رەواندزو

خانەقین دا تێپەڕی. هێزەکانی رووسی خەڵکی ناوچەکەیان ناچاری دەربەدەری کرد، بەتەنها لەبایەزیدو دەوروبەری دەیەکی دانیشتوانەکەی مابوونەوە و سەدان گوند وێران کران. هێزە کرێگرتە ئەرمەنی و رووسیەکان لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری کۆمۆنیستی و لەکاتی پەڕینەوەیان لەبەرەی ئەرزرۆم . زەنجان هەزاران ئافرەت و منداڵی کوردیان کوشت. رۆژانی ١٤،١٥ی مایسی ١٩١٥ شاری وان گەورەترین قەسابخانەی مسوڵمانە کوردەکانی بەخۆوە بینی بەدەستی ئەو هێزە کرێگرتە ئەرمەنانەی پێش هێزەکانی رووسی کەوتبوون، رووس بەڵێنی دابوو شاری وان بگۆڕێ بۆ پایتەختی ئەو دەوڵەتەی بەڵێن بوو بۆ ئەرمەنەکانی دروست بکات، نزیکەی ٢٥٠هەزار لەو ئەرمەنانە کۆبوونەوە کەبچنە پاڵ دەوڵەت و لەشکری ئەرمەنی و بەپشتیوانی لەشکری رووسی دەوڵەتی ئەرمەنیان راگەیاندو نەخشەی هێرشی ولایەتی بەدلیس و دیاربەکرو پاککردنەوەی راگەیەنرا. بەڵام هێزەکانی رووسی لەبەرانبەر دژە هێرشی عوسمانیەکان شکان(١٦٣). راپۆرتەکانی بەریتانی جەخت کردۆتە سەر کوشتارو لەناوبردنی کوردان بەدەستی هێزەکانی ئەرمەنی و رووسی لەخانەقین. راپۆرتی ئەفسەرێکی ئینگلیزی باسی کوشتنی ٥٠٠ کوردی شاری خانەقین دەکات، ئەمە سەرەرای قوربانیە زۆرەکانی گوندەکانی دەورووبەری، سەدان کورد لەترسی کوشتاری جەماعی هەڵهاتن بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئینگلیز(١٦٤)، رەواندزیش هەمان دەردی سیرینکای ساڵی ١٩٩٧ لێبەسەرهات کەهێزەکانی سربی نازی ئەنجامیان دا، (ئەندرانیک)ی بێویژدانی ئەرمەنی تینوو بەخوێنی کورد نزیکەی ٦٠٠٠منداڵ و ئافرەتی ئەو شارە (کاتێک کە پیاوەکانیان لەسوپادا بوون)ی هەموویانیان کوشت، لەکۆی ٣هەزار منداڵ تەنها ٦٠منداڵ مابۆوە(١٦٥). رووس و ئەرمەنەکان ٣٠گوندیان لەبرادۆست

وێرانکرد. هەزاران کەس لەخەڵکی بادینان لەترسی ئابرۆی خۆیان بەرەو موسڵ هەڵاتن‌و بەشێکیان لەشەقامەکانی موسڵ لەبرسانا مردن، ناوچە مێژوویەکانی کورد لەلایەن شاڵاوی ئەرمەنی ـ رووسی بەئامانج گیرابوو، لەسەدا هەشتای خەڵکی سلێمانی لەئاکامی مەرگەسات‌و بەتایبەتی برسیەتی لەناوچوون(١٦٦)، ئەو شەڕە پڕ لەمەرگەساتەی لەماوەی شەڕی یەکەمی جیهانی تووشی کورد هات بەدەستی ئیتحادیەکان یان رووس‌و ئەرمەن لەتاوانە گەورەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو(*)، وەکو توێژەرەوەو سەرکردەکانی ئەرمەن وجولەکە ئەرشیفیان لەسەر ئەو شەڕە کاولکاریانە کۆکردۆتەوە کەتووشیان هاتووە لەسەر توێژەرەوەو سەرکردەو مەڵبەندە کوردیەکانی ناوخۆو دەرەوە پێویستە ئەرشێفی جینۆسایدی وەکو (هۆڵۆکۆست) هەبێت لەسەر ئەو مەرگەساتانەی ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانی تووشی کورد بووە لەگەڵ بەڵگەنامەی جینۆسایدی ئەنفال بەناوی (مەڵبەندی کوردی بۆ جینۆساید).

بەکورتی ماوەی دەسەڵاتی ئیتحادیەکان لەکوردستان پڕیەتی لەشۆڕش‌و ئەو ماوەیە سەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردیە، ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە ڕۆڵی پێشەنگ‌و گەورەی شێخانی تەریقەت (بەتایبەت نەقشبەندی‌و قادری) و زانایانی ئیسلامی بەدیاردەخا لەبزووتنەوەی کوردایەتی، دەوڵەتانی ناسیونالستی لەهەریەك لەعێراق‌و ئێران‌و تورکیا لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیەوە هەتا ئێستا سیاسەتی ئیتحادیەکان پەیرەو دەکەن لەسەرکوتکردنی کورد، بەهەمان بیانووی ئیتحادیەکان‌و بەچەکی هاوچەرخ...

# پەراوێزو سەرچاوەکان

---

١-ساطح الحصري ، ص ٩١-٩٢

٢-سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٣.

3-Bernard Lewis Islam in history london 1973.pp133-135

(*) لەکارخستنی دەستوورو بەدەستوور رازی نەبوون بابەتێکەو نەگونجانی دستووری ناوبراو لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام بابەتێکیترە. ئایا قەناعەتێکی لەو جۆرەش گەڵاڵە نابێت کە سوڵتان دەستووری نەویستووە نەك رازی نەبوون بەدەستوورەکەی ئەو رەوتە، بەڵگەشمان هەنگاوو دەرفەتەکانی دوای هەڵوەشاندنەوەی دەستوورە، سوڵتان لەتەمەنی ٤٠ساڵەی دەسەڵاتی‌دا زیاتر لە٣٥ ساڵ ئەنجومەن‌و دەستووری نەبووەو هیچ هەوڵێکیش لەلایەن سوڵتانەوە لەو ماوە درێژە بەجدی لەئارادا نەبووە بۆ پێکهێنانی ئەنجومەن‌و گەڕانەوە بۆدەستوور. ئیسلام رەوتی ئیسلامی بەوە سەربەرز نابێت هەموو نمونەیەکی باش‌و خراپی دەسەڵات لەناو کەلەپووری ئیسلامی بەپیرۆز وەربگرێت، مادام لەبەرگی ئایینیەو بەرانبەرەکەی رەوتێکی دژە ئایینە هەموو پاساوێکی بۆبهێنینەوە.

٤-بەکارهێنانی ناوی( Jeunes Turcs= توکیای لاو) ئاماژەیە بۆ بانگەوازکارانی چاکسازی رۆژاوایی کەبۆ یەکەم جار لەساڵی ١٨٦٧ لەرۆژنامەیەکی بەلچیکی ناوی هاتووە. بێگومان ئەمە لاسایی کردنەوەی بەریتانیای لاو، ئەڵمانیای لاو، فەرەنسای لاوە کەبۆ بانگەوازکارانی چاکسازی ئەو زلاتانە لەسەدەی نۆزدە بەکاردەهات. بڕوانە :

Bernard Lewis TheEmergence of Modern Turkey pp. 150-152

٥- زين نورالدين، نشوء القومية العربية، مع الدارس في العلاقات العربية - التركية،

بيروت، دار النهار، ١٩٧٢، ص٨٤

Lewis pp . 197-199 6-

٧- مالمسيانز: القومية الكردية، و د. عبداللة جودت في المطلع القرن العشرين، ترجمة شكور مصطفى، ص١٥، نفس المصدر، ص١٩٤-١٩٥

8-Elie kedourrie "young Turks'Freemasonsand Jews"middle EastStudies'N. o3,1973'pp

٩-توفيق على بيرو ، العرب و الترك ص٨٤-٨٨ .

10-Elie kedourrie "young Turks'Freemasonsand Jews" middle East Studies 'N.03'1973'PP96-97

١١- محمد فريد بك، تاريخ الدولة العلية،ص ٧١١-٧١٣، جريدة المعظم، ٢٠نيسان ١٩٠٩.

١٢-المنار ، جزء ٤، ١٩١١.

13-Kutlay'p.203

14-Kutlay'p.197

15-Stevan Shaw History of Ottoman Empire and Modern Turkey'vol.2'pp.291-292

16-ElieKedourrie'pp96-97' Stevan Shaw History of Ottoman Empire and ModernTurkey'vol.2'pp299-301

١٧-مالميسانيز، ل٢٠-٢٢.

18-NaciKutlay'Itthad Terakki'Bebun Yayinlari Ankara'S.82-85.

١٩-مالميسانيز، ل١٧-١٨-٣١.

٢٠- هەمان سەرچاوە، ل٢٧-٢٨.

21-Ittihad' Terakki Ve Kurtler pp.203-204

**٢٢-كێشەی كورد، ل١٨٩ . قوتابخانەی هۆزەكان (عشیرت مكتبلری) لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە لەساڵی ١٨٩٢ دامەزرا، ئەمەش بۆپێگەیاندنی كادیری سیاسی و ئیداری لەناو ئەو هۆزە عەرەبی و كوردیانەی سیاسەتی جامیعەی ئیسلام لەخۆی دەگرتن، لەولایەتەكان كاریان دەكرد، ماوەی خوێندن حەوت ساڵ بوو، خوێندكار سەرەڕای زانستی شەرعی زانستەكانی ئیدارەو سەربازی و زمانەكانی توركی و عەرەبی و فارسی و فەرەنسی دەخوێند، لەسەر قسەی (یوگین رۆگمان)ی توێژەرەوە ئەزموونێكی سەركەوتوو بووە لەدروستكردنی كادیر لەو ولایەتانەی دۆستایەتیەكی بەهێزیان** هەبووە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی. Eugene L. Rogman Asiret Mektebi: Abdulhamid Its School for Tribes (1982-1907) International Jounal of Middile 28 (1996) 107-183.

23-Rohat Alakom Bir KurtDiplomatinin Firtanali Yellari:Genaral Serif pasa(Stokholm:Apec1995)'pp44-45

٢٤-لازاریف ل٢٢٦-٢٢٧.

٢٥-مالمیسانز، ل٥٠،

26-kutlay'pp.82-85

**عەبدوڕەزاق لەیاداشتنامەكەیدا دەڵێ كەپەیوەندی بەهێزم هەبووە لەگەڵ شەریف پاشا لەپاریس و بەڕەزامەندی حكومەتی رووسی بەشداری كۆنگرەی ساڵی ١٩١١ی**

پارتی ئیئتلاف دەسەڵاتدار بووم لەپاریس و سێ مانگ لەپاریس ماومەتەوە ، (بڕوانە: بیرەوەری عەبدوڕەزاق بەدرخان، خڕکردنەوەو ئامادەکردنی جەلیل جەلیلی، ل٣٠-٣١
٢٧-مالیسانز، ل٣٤-٣٧.
٢٨-فی سبیل کردستان، ترجمه، ر. علی، بیروت١٩٨٧،ص٢٥
29-Kutlay'p.134-135
30-Kurd ve Ittihad 'p.135
31-Fo 195/2317 No.9 March 9'1909'British vice consul Diarbekir
32-Bitlisli Kemal Favzi Istanbul 'Firat yayilari'p.15
33-Kutlay'p.178-179

٣٤-لازارف، کێشەی کورد، ل٢٣٣-٢٣٤.
-Fo195-\2317 Enclosure in Mr.Heards Despactch of january 3rd 1909(Beruit)
٣٦-لازاریف، کێشەی کورد، ل٢٣٣-٢٣٤. توێژەرەوەی کورد سیامەند عوسمان لەدامەزراندنی رێکخراوە کوردیەکانی ئەو ماوەیە زیاتر جەخت دەکاتەوە سەر لایەنی سەربازی لەدامەزراندنیان و دەڵێ (ئەو رێکخراوانە لەسەر شێوازی نیمچە سەربازی دامەزراون ئەمەش بەچاولێکەری کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی تورکی کەئەویش لەلای خۆیەوە لاسایی رێکخراوی کاربۆناری ئیتالی کردبۆوە کەسیاسی چەکداری بووە) بڕوانە:
Siyamend Othman (Kurdish Nationalism: Instigators and Historical Influences) Armenian Review, Spring (1989) volume 42 Number 1\65, p.49.
37-Fo195-\2317 Enclosure in Mr.Heards Despactch of January 3rd 1909(Beruit)
٣٨-لازاریف ل٢٢٧.
39-F.O 195/2317 No.12 Diarbekir April 7'1909 Enclosure No.3 "Genaral Notes Between Van and Mosul "B.Dickson
40-Rohat Ziya Gokalpp'n Buyuk Celesi Kurtler (Hstanbul"Firat Yayinlari 1992'pp.69-70
41-F.o195/2317 No.12 Diarbekir April 7'1909 Enclosure No.3"General Notes Between van and Mosul "B.Dickson

42-F.o 195/2317 Enclosure No.3,Report on Affairs in Sulaimania, 13 Jun 1909; No.21 from British Vice Consul' Van 15 December 1909 J.Morgan

43-Kutlay'p.159

44-F.O 195/2317'No.4 Enclosure No.2..Despatch' March13 1909 British Vice Consulate Van

45-F.O 195/2317'No 12'April 7'1909 British Vice Consul';Salih Haider "land Problems of Iraq ,, Doctoral Dissertation; London University ,1942pp 288-291;

46-Nole,p.10

47-Martin van Burinessen Agha,Shaikh and state:Omthe Social and Plitical Organization of Kurdistan (Utrech:1978,

د.كمال مظهر، كردستان في سنوات حرب العالمية الاولى، ص٨٣-٨٦، صديق دملوجي، امارة بهدينان، موصل١٩٨-٦٩.

٤٨-رۆژی کوردستان، ژ١,٦، حوزەیرانی ١٣٢٩| ١٩١٣.

٤٩-رۆژی کوردستان ژ٣,١ی حوزەیرانی ١٣٢٩\ ١٩١٣.

٥٠- جليل جليلي، نهضة الكرد الثقافية، ص١٣٢٩\١٩١٣.

٥١-هەمان سەرچاوە، ٤٥-١٤٢.

٥٢-م.س لازاریف، کێشەی کورد، وەگێڕانی د. کاوس قەفتان، بەغدا، ل٥٣٠-٥٣١

٥٣-حەمە رەسوڵ هاوار، سمکۆ (سمایل ئاغای شکاک)، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥، ل١٦٨.

54-EM Eral Turkey, Great Powers and the BaghCompany (NewYork:MacMIllan Company,1923)

السلطان عبدالحميد، مذكرات السلطان عبدالحميد، ترجمة وتقديم ، محمد حرب القاهرة، دار الانصار، ١٩٧٨.

55-House of Lords ,Parliamentary Debates,5th Session,2'(1911)'pp586-587

٥٦-لازاریف، ل١٧٧-١٧٨، ٢٠٣-٢٠٥.

57-Fo 195/2317"Report on Frontier Qustion in Around Urima and Salmas ",13 June 1909, Britih Vice Consulate van; لازایف، ل٣٢٥

58-British Document on Forigen Affairs(BDFA),"The Near and Middle East",vol..17,pp.383385

٥٩-لازاريف، ل١٥٧.

60-Bell.p.41

٦١-احمد عثمان ابوبكر، اكراد الملي و ابراهيم باشا، بغداد ١٩٧٣ص٣٢-٢٥.

٦٢-احمد عثمان، نفس المصدر، ص٤١.

٦٣-لازاريف، ل٦٢.

64-Sevket Beysanogu Diyarbekir Tarihi (Diyarbakir: Diyarbakr ,Kultur Ve Sanat Yayinlari'1996),2 Cilt'pp.747-748.

٦٥-احمد عثمان، ص٤٨.

٦٦-احمد عثمان،ص٤٩.

67-Beysanogu Diyarbekir Tarih,2 Clit,sayfa'.748.

68-Fo 881/9458j.No.11693

69-Cabinet 27/206 "British Desiderata in Turkey in Asia Minor"Report.Appendex iv 'March 15'1915'p.101

٧٠-لازاريف ل١٨٣

٧١-كمال مظهر احمد، كردستان فى سنوات الحرب العالمية الاولى،ص٩٧-٩٨.

٧٢-احمد عثمان، ص٤٨-٥٦.

73-Fo 195/2317No.12Diarbekir,April 7,1909 BritishViceConsul

74- Fo 195/2445 ,Kurds,Aleppo,December 1,1912; Enclouser. In Cosul

75-Brueinessen

76- Fo 195/2317, EnclouserNo.1,ViceConsul Diarbekir,7,April ,1909

77-Sevket Beysanoglu Diyarbakir Taihi,2 celt Diarbekir:Kultur Ve Sanat Yayinlar 1996,p.751

78- Beysanoglu,pp752-754

79-Robert Olson,The Emergrence of The Kurdish Nationalist Movement (Austin:Texas Univ.Press 1989,pp;MartinVan Bruinssen Agha<sssshikh and state, Utrechet, 1979,pp.278-27


(*) لەراستیدا ناكۆكی نێوان شێخ سەعیدو ئیتحادیەكان زیاتر لەچوارچێوەی ناكۆكی دیراسە بكرێ دروست ترە، هەمان قەناعەت روون دەكاتەوە، نەك لەچوارچێوەی بزافێكی خاوەن خوزگەو بەشێك لەبزاڤێكی سیاسی كورد، چونكە ئەم ناكۆكیە ئەگەر

نەخنكێنرایە لەوانە بوو بزاڤێكی بەرچاوی لێبكەوتایەوە بەلآم ئێمە قسە لەئەوە دەكەین رووی داوە.

80- FO 195\2317,,Report on Affairs in Sulaimani,, 10 January,1909 B.Dickosn; \FO2308 No. 2 January 14 ,1909,B.Dickson

81-Irade- Hususi 22Za 1311\102, 21\o3\311,;Y.M.TV. 278 T07 lef 1,30\03\321

٨٢-هاوار، ل٢٠٣-٢٠٤.

٨٣- =هاوار ل٢٠٣-٢٠٤.

84-Y.MTV 114\31 وێنەیەك لەسەر جوفرەی هاتوو لەولایەتی موسل

85-Y.MTV. 114\31

٨٦-چەند بەڵگەنامەیەكی مێژوویی، و/مستەفا نەریمان، رامان (٢،٢) ، دهۆك، ٢٠٠١. گۆڤاری (الارشاد) بەناوی ئیتحادو تەرەقی لقی بەغدا دەدەچوو، ژمارە ١٩، نیسانی ١٢٣٥. كۆمەڵێك پروپاگەندەی دژ بەدوو شێخەی تیایە، گۆڤارەكە رای خۆی دەربریووە بەوەی دەستبەسەراگرتنی ئەو شێخانە بەلەناوبردنی رەمزی تاكڕەوی دەزانێت (لایەنگرانی سوڵتان عەبدولحەمید) .

87-FO.195\2310 No.2January 14,1909 British Vice Consul Mosul, Bell, p43,Edmonds ,Kurds, Turks,and Arabs,p77-78

عبدالمنعم الغلامي الضحايا الثلاث ، موصل، ،١٩٥٢،ص٧-٣٣و هاوار،ص١٤٨-١٥١

٨٨-هاوار ل ١٥١-١٧١.

89-FO 195 2310 No.2 January 14,1909. Vice Consul Musul

٩٠-هاوار، ل١٤٥-١٤٧، ١٧١.

٩١-شێخ مەحمودی قارەمان، ل١٤٧-١٥٠.

92-FO 195 2312 No.37 Milkie Young, Vice Consul Mosul Feruary 19,1909

93-FO 195 2310 No.37 Milkie Young, Vice Consul Mosul Febuary 19,1909

94-FO.95\2317,,Report on Affairs in Sulamani,, 10 June1909 B.Dickson.

95-FO.95\2317,,Report on Affairs in Sulamani,, B. Dickson. .January 10,1909.

96-FO.95\2310 No.19 Teleg. British Vice Cossuul Mosul, October 17,1909

97-FO.95\2310 No.19 Teleg. British Vice Cossuul Mosul October 17,1909

98-The Kurds, p.101; Jwaideh, p.328

٩٩- کێشەی کورد، ل٣٤٠-٣٤١.

100-Kutlay,p.163.

101-FO.195\2447\45; Kutlay, p.170.

102-Kutlay,p.193

بەڵام قەدری جەمیل پاشا(سلۆپی) تێڕوانینێکی‌تری هەیە لەجولانەوەکەی مەلا سەلیم‌و پشتگیری لەرای کوتلای‌و جەلیلی ناکات. سلۆپی لەوەسفی بزاڤی مەلا سەلیم دەڵێ (مەلا سەلیم دژی ئەفکاری پێشکەوتووخوازی داهێنراوی عەلمانیەت وەستابۆوە...لەساڵی ١٩١٣ لەولایەتی سیرت دژی حکومەت شۆڕشی کرد لەدوای ئیمزاکردنی ڕێکەوتن لەگەڵ هەندێك لەزانایان‌و سەرۆك هۆزەکان.... بەهۆی بایەخ نەدانی هاوپەیمانەکان بەبزاڤەکەی لەبازنەی هۆزەکانی خێزانی تێ‌نەپەڕی. حکومەتی تورکیای لاویش زۆر بە لەناوبردنی ماندوو نەبوو. بڕوانە ( فی سبیل کردستان، ل٣٤)

103-FO 195\2311 No.12 Enlosure No. 3.

لازاریف، ل٣١٩، لەسەر زاری یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لەوان دەڵێ : کاتێك مەلا سەلیم‌و هێزەکەی گەمارۆی بەدلیس دەدەن، مەزهەر بەگ والی عوسمانی نامەیەك بۆ مەلا سەلیم دەنێری‌و داوای لێ‌دەکات بێتە شار هەتا وتووێژی لەگەڵدا بکات لەسەر ئامانجی شۆڕشگێڕەکان. بەڵام مەلا سەلیم لەسەر داوای خۆی سووردەبێت‌و داوای وەفدی والی قبوڵ ناکات‌و دەڵێ دەبێت والی تەسلیمی موجاهیدان بێت، ئەوان بەهەموو چەکەکانیانەوە بچنە ناو شار، بەڕای قونسوڵی بەریتانی ئەو نەیویستووە دەست بگرێ بەسەر بەدلیس، بەڵکو ویستوویەتی ئیتحادیەکان بەزەبری هێزی خێزان ناچار بکات مەزهەر بەگی والی کە بەئیشارەتی ئەنوەر پاشای وەزیری ناوخۆ قەناعەتی بەبەکارهێنانی هێز هەبووە لەکار بخەن‌و لەجیاتی ئەو سیرت عەبدولخالق بکەنە والی، ئەمەش بەئیشارەتی ئەنوەر پاشای وەزیری ناوخۆ کەسوور بووە لەسەر یەکلایی‌کردنەوەی سەربازی لەگەڵ کورد، والی تازە هێزێکی میللی لە٨٠٠ چەکدار لەخەڵکی بەدلیس پێك هێنا بۆ بەرگری لەشار، ئەم هێزەش لەمووش‌و وان بەهێزی سەربازی پشتیوانی دەکرا، کوردەکان ناچار بەئاراستەی خێزان کشانەوەو هێزەکانی توورکیا دوایان کەوتن. FO371/2130, British Vice Covsul Van 22 March 1914:FO 371/2130, British Vice Consul Van,No7, April

4, 1914.

104-FO 193\2317,,General Notes on A Journey Between Van and Mosul,, B Rechardson. June 1o,1909 Diyar Bakir.,

(*) دکتۆر خۆبەدوور دەگرێت لەووردەکاری هۆکاری نوشستی شێخانی تەریقەت لەسەرکردایەتی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان کە لەدوای کەوتنی میرنشینە کوردیەکان ببونە پێشەنگی جولانەوەی کوردی دژ بەدەسەلاتدارانی تووركی و ئەنقەرەوتاران و بەغداو داگیرکەری بەریتانی، خواستو ئامانجی ئەوان روون بووە وەکو قەناعەتی گشتی شەقامی کوردی ئەو کات بەلام خوێندەوەو تەشکیلەی خەباتکارانی کورد لەسایەی ئەوان و بەگەرخستن و سازدانی جەماوەری کورد لەئاستی رووبەرپوو بوونەوەکان زۆر تەقلیدی و گەرەلاوژەیی بووە، سەرەڕایی نەبوونی پرۆژەی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئیداری و ئابووری لەلایەن سەرکردەکانی شێخانی تەریقەتی سۆفیگەری، راستە هۆکاری دەرەکی رۆڵی بەرچاوی هەبووە لەو نوشستی ئەوان بەلام ئەو هۆکارانەی باسمان کرد لەگەڵ تێنەگەیشتنی ئەوان لەهاوکێشەی ململانێی هێزە کاریگەرەکان رۆڵیان کەمتر نیە لەو کەوتنە یەك بەدوای یەکانەی شۆرش و راپەرینەکان کورد بەسەرۆکایەتی شێخانی تەریقەت.ئەزمەنی سەرکردایەتی شێخانی تەریقەت و دواتر ئەوەی سەلماند کە بانگەشەی بەرگری لەئیسلام و شەریعەت لەلایەن پێکهاتەیەکی تەریقەتی سۆفیگەری یان خێلەکی یان.... هتد بێئاکام دەبێت مادام هەلگرانی ئەو بانگەشەیە پرۆژەیەکی هەمەلایەنەیان پێ نەبووە بۆبەدیلی سیستەمی ئەو قۆناغە.. نهێنی سەرکەوتن لەو پرۆژەدایە بەنەزم و ژیرانەو واقیعانە دەیخەنە روو لەروانگەو هەڵهێنجراوی لەئیسلام نەك داکۆکی لەئایین وەکو کائینێکی بەرجەستە بەرگری لێ بکەیت.

١٠٥- مسعود البارزاني، البارزانيو الحركة التحررية الكردية، الانتفاضة البارزان الاولى (١٩٣١-١٩٣٢)، كردستان ١٩٨٦، ص ١٦-١٧.

١٠٦-بي رەش، بارزان و الحركة الوعي القومي الكردي، ١٨٢٦-١٩١٤، كردستان، خەبات١٩٨٧، ص٨٤-٨٥.. الدملوجي، ص٨٩-٩١.

107- FO 193\2317, No 4 March 31,1909 Enclosure No 1,Vice Cosul Van.

١٠٧-الدملوجي، ص٩٨.

109-he Modern Hitory of Kurds, p98.

١١٠- =الدملوجي، ص٩٣.

١١١-= الدملجي، ص٩٣.

١١٢-بي رەش، ص١٣٦.

113-he Modern Hitory of Kurds, p100-101

١١٤-الدملوجي، ص١٠٢، ١٠٤.

115-Mchdowall, pp100-101.

116-FO 195\2310 No.24 October 30, 1909 M Young
British Vince Consul Mosul

117-FO 195\2458 British Vice Consul Van, March 13,1941.

عەبدورەزاق بەدخان، بیرەوەری، ل٣٥.

١١٨-الدملوجي، ص٩٢.

119-FO 195 \2310 No 24,October 30,1909 Milke Young British Vice Consul

120-Stanford J.Shaw History of Ottomon Empire and Modern Turkey,(Cambridige; university press,1917) von 2 pp203-207.

121-Stanford J.Shaw History Of Ottmoman Empire and Modern Turky, Cambridge; Universty Press, 1977 vol .2,pp350-357

١٢٢- مذكرات السلطان عبدالحميد، ترجمةو تعليق محمد حرب، القاهرة١٩٨٧، ص٥١-٥٣.

Jwaideh, pt , p 350-352

122-FO, 195\2317 No.4 march 13, 1909 British Vice Consulate Van Bertarm Dickson to G.Lowther.

١٢٣السلطان عبدالحميد، مذكرات، ص٥٤.

124-FO 195\2449\ 45 Telegram .No.28.Aleppo British Vice Consul M.Fontana

125-Fo 195\ 2449\45 Henry Hony.Vice Cosul Mosul.

١٢٦-لاواريف، ل٣٠٦-٣٠٧.

١٢٧-هاوار، ل٥٢،

128-Longrigg, p.67-68

١٢٩-لازاريف، ل٥٣.

130-Jwaideh,p.250-251.

١٣١- بیرەوەری عەبدوڕەزاق بەدرخان، خڕکردنەوەو ئامادەکردنی، جەلیل جەلیلی، ل١٥-٢٠. لەوێدا عەبدوڕەزاق دەڵێ (ئیتحادیەکان زۆر هەوڵیاندا بەپارەو پلەو پایەی حکومی بەلای خۆیاندا رامکێشن بەلام بێئام ئاکام بووە، دڵنیام کردنەوە مـن

لەبەدیهێنانی ماف کورد بەو لاوە هیچم ناوێ (بڕوانە، ل٣٧-٣٨). بەلام لازاریف لەسەرچاوەیەکی بالوێزخانەی رووسی لەتارانەوە بیستوویەتی و دەگێڕێتەوە، لەسالی ١٩١٢عەبدوڕەزاق گفتوگۆی هەبووە لەگەل ئیتحادیەکان بەمەستی ئاسانکاری بۆگەڕانەوەی و عەبدوڕەزاق رازی بووە بەمەرجێ پارچە زەویەك و ٢٠٠٠لیرەی بدەنێ، بەلام تورکان قبولیان نەکردووە (بڕوانە: کێشەی کورد،ل٣٢٣)، (فانتانا) ، یاریدەدەری قونسولی بەریتانی لەحەلەب قەناعەتی وایە ناکۆکی نێوان ئیتحادیەکان و عەبدوڕەزاق دەگەڕێتەوە بۆ کەمکردنەوەی موچەی مانگانەی حکومی کە لەسەردەمی سولتان عەبدولحەمید ٤٠لیرە بووەو ئێستا تەنها ١٠ لیرەی دەدەنێ (بڕوانە :

FO 195\2445 ,,kurds,,No 81Desember, 29, 1912 Aleppo.From R.Fontana to G. Lowther.

132-The Manchester, Guardian, Sepember 25, 1950.

١٣٣-بیرەوەری، ل٣٣-٣٤.

١٣٤-هەمان سەرچاوە، ل

135- FO 195\2445 No.78 Aleppo Dec 14,1912.

136-FO 195\2182,, Cureent Events In Mosul Vilayet,, No.10 April 23,1913 H.C.Hony Vice Consul Mosul. No.78 Enclosure in R.Fantana,s Despach. To G.Lother December 14,1912

137-FO 195\2445 No. 18 December 14,1912,R. Fantana Vice Consul Aleppo.

138-FO 195\2445 No. 18 December 14,1812,R. Fantana

139-FO\195\2445\45 British Vice Consul Mosul.

140-FO 195\2449\45 British Vice Consul Van.12 May 8,1913; Macdowall,p99

141-FO 195\2449\45 British Vice Consul Van.12 May 8,1913.

١٤٢-کێشەی کورد، ١٥٠-١٥١.

١٤٣-هەمان سەرچاوە، ل٢٥٣-٢٥٤، ٣٢٣-٣٢٥.

١٤٤-بیرەوەری، ٢٨-٢٩.

١٤٥-کێشەی کورد، ل٥٣٠-٥٣١. ٥٤٦.

١٤٦-هاوار، ل١٦٨.

147-FO 195\2449\45 In disclosure in Consul Fantana,s Despatch NO 17 23\3\1913; FO 195\2182 NO. 12 Current Events in Mosul Vilaet,, British Vice Consul mosul,H,C. Hony April 23,1913.

148-Mcdowall,p100.

149-FO,195\2445 Enclosure No.5 in Number 1,November 25,1912, FO 195\2445 Enclosure No. 78 In Vice Consul Fantna,s Despatch Desember 14,`912.

150-FO 195\2449\45 Vice Consul Aleppo, R Fontana April 22,1913.

151-FO 195\2182 No.10 Current Events in Mosul Vilayet,,British Vice Cosul Mosul H.C Ho.ny April 23,1913

152-FO 195\2182 No.10 Current Events in Mosul Vilayet,,British Vice Cosul M

H.C Ho.ny April 23,1913

153-A.Modern history of Kurds,p.102-3

١٥٤-لازاريف،، ل٣٢١

155-A.Modern history of Kurds,p.102-

156-British Docoment on Foreign Affairs, pt.1.Ser .B, Ter Nwar and Middle East, Von. 19 Enclosure in Document No.88 Tabriz, November 18,1913.

١٥٧-كێشەی كورد ل ١٩٢-١٩٣

158-FO 195/2499/45 No.12 February 10, 1913 Aleppo. From R Fantana.

١٥٩-د.كمال مظهر ، كردستان فی سنوات ، ص١٤٠-١٤١.

160-David Loiyd George, War Memoirs, 6 Vols !V (Boston; Little 6 Brown and CO,1934), p144-146; FO 371\3397 Fortnightly Report, MAY 15, 1918.

**كردستان فى سنوات الحرب العالميه الاولى، ص١٧١-١٧٣. (شيومان) ئەفسەری هەواڵگری سەربازی ئەڵمانی بووە، سوپایەكی لەبەكرێگیراوە كوردەكان ئامادە كردبوو بۆداگیركردنی هەمەدان، هەموو چەكدارێكی پیادە ١٥ تومان و سوارەش ٣٠ تومانی پێ‌دەدا، مەجید سەڵتەنەی حاكمی ئەو هەرێمەی ئێرانیش هاوكاری دەكرد، بەڵام عوسمانیەكان لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤ دەستیان بەسەرداگرت و پرۆژەكەی شیومان نووشستی هێنا. لازاریف ، ٦٠-٦١.**

161-Iraq, 1900-1950 p.96.

١٦١-بلـه.ج. شـێركۆ، القضية الكردية ماضي الكرد وحاضرهم، بيروت ١٩٨٦ ، ص٧٢-٧٥ .

163-Jwaideh, pp.363-369.

164-Colonial Office,Report of the Administration for 1918 khanaqin District , londan, HMS 1919 p.32-33; FO Fortnight Report, No. 4,December,1917.

165-Jwaideh pt.I. pp365-366; K. Mayson, Central Kurdistan,, Geogrraphical Journal, No.54(1919) pp.331-332.

166-K.Mayson,C Edmonds, The Kurds, p28

عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، بيروت، ١٩٨٤، ص٩١.

**(*) شالاوی رووسی بۆ هەرێمەکانی کوردستان لەساڵی ١٩١٦ بەشێکی گەورەی نەهامەتیەکانی کوردستانی لەسالانی شەڕی یەکەمی جیهانی بووە، هۆزە کوردیەکانی کوردستانی باشوور بەفاکتەری جیهاد لەبەرەی شاربازێڕو پێنجوینو لەبەرەی ڕەواندز بەشداری کاریگەریان هەبووە دژی شالاوی رووسی، سەرەڕای کەم بارانی سالانی ١٩١٦و ١٩١٧ قاتو قڕیو بێبەرهەمی کشتوکالی رووسەکانو توورکە ئیتحادیەکان وەکو دوو زلهێزی دەرەکی ئەوکات کوردستانیان کردە ولاتی وێرانەو مەرگەسات، هەتا کۆتایی سەدەی رابردووش بیرەوەریەکانی سالانی گرانیو سەفەربەرلك بەشێکی گرنگی مێژووی میللی ئێمەیان پێك دەهێنا.**

## کـــوتکـــــــــــــــــــکراوەکان

ACH : Acting High Commissioner , جێگری نوێەری باڵا

ADV . Min. : Advisor to Minihter , راوێژکاری وەزیر : I

A Administratave Imspector , موفەتیشی ئیداری لەلیوا

APO : Assistant Political Officer, یاریدەدەری ئەفسەری رامیاری

BDFA : British Documents on Forign Afftairs , بەڵگەنامەکانی بەریتانی تایبەت بەکاروباری دەرەوە

BOAS : bulletin of the School of Orental and African Studies ,

BHCF : British High Commission Files , بەڵگەنامەکانی نوێنەری باڵا

Cab. Pap : Cabimet Papers , کۆنووسی دانیشتنەکانی حکومەتی بەریتانی

CC : civil Commissioner ئەفسەری سیاسی مەدەنی

CO : Colonial office , وەزارەتی موستەعمەرات

Desp : Despatch , نامە رەسمیەکان

FO :Foreign Office , وەزارەتی دەرەوە

HC : High Commissioner, نوێنەری باڵا

Memo : Memorandum , بیرخەرەوە

PMC : Permanent Mandate Commiossion , لیژنەی ئینتدابی هەمیشەیی

Raf ; Royal Air Force, هێزی ئاسمانی پاشایەتی (بەریتانی)

S.S.O : Special Service Officer ئەفسەری هەواڵگری

S.S.COI: Secretary fot State for Colonies وەزیری

کاروباری موستەعمەرات

S.S . For India : Secretary for State for India

Teleg : telegram بروسکە

## سەرچـــــــــــــاوەکـان( * )ا

# سەرچاوە کوردیو عەرەبیو فارسیەکان


١-ئیبراهیم ئەحمەد ،، بیرەوەریەکانم : دامەزراندنی لقی کۆمەڵەی (ژ.ک)، گزینگ، ژمارە، ١٣.

٢-احمد عثمان ابوبكر، اكراد الملي و ابراهيم باشا، بغداد، ١٩٧٣

٣-ارخان محمد على، السلطان عبدالحميد الثاني، كويت،

٤-ئەردلان، بارزانو نهێنیەکانی، بەغدا، چاپخانەی مەعاریف.

٥-اورخان محمد علي، السلطان عبدالحميد الثاني و احداث عهده، كويت

٦-امير جلادت، القضية الكردية، ماضي الكرد و حاضرهم، بيروت١٩٨٦.

٧-ئەمیری حەسەن پوور، ستالین: قەیرانی شۆڕش، گزینگ، ژمارە ١٣.

٨-باسل نيكتين، الاكراد، ت/ صلاح البرواري، منشورات مجله (ئاسۆ) ١٩٩٢.

٩- البارزاني: مسعود ، البارزاني والحركة التحررية الكردية، الانتفاضة البارزان الاولى، كوردستان١٩٨٦

١٠- البارزان والحركة التحررية الكردية - ثورة بارزان ، كوردستان١٩٨٧

١١- ثورة البارزان ، ١٩٤٣- ١٩٤٥

١٢-بەدرخان: عەبدوڕەزاق، بیرەوەری، خڕکردنەوەو ئامادەکردنی ، جەلیل جەلیلی،

١٣-بەدلیسی: شرفخان، شرفنامە، وەرگێڕدراوی کوردی، نەجەف١٩٧٢

١٤- بلة، شێرکۆ، القضية الكردية، ماضي الكردو حاضرهم، بيروت١٩٧٦

١٥-حەمەی باقی، شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلای نەهری ١٨٨٠ لەبەڵگەنامەی قاجاریدا،هەولێر ٢٠٠٠

١٦-بیرەش، بارزانو حركه الوعى القومى الكردى ١٨٢٦- ١٩١٤، كردستان، خەبات١٩٨٦

١٧-بلوریان، ئاڵەکۆك، بەسەرهاتەکانی ژیانی سیاسیم، ستهوکۆڵم،

١٨-برزنجی: لەتیف، شێخ مەحمودی نەمر، کاروان، ژمارە ٢٦، ١٩٨٤

١٩- بني المرجة: موفق، صحوة الرجل المريض، موسسة الصقر،

٢٠-پاکیزە رەفیق حیلمی، یادی سەد ساڵەی لەدایك بوونی مامۆستای کوردایەتی رەفیق حیلمی، رابوون،

٢١-پشدەری: عەبدوڵلا ئەحمەد، یاداشتەکانم، بەشی یەکەم، بەغدا ١٩٩٢

٢٢-پەڵەموتی: مستەفا، بەئاواتی سەربەخۆیی، ترجمه انور سڵتانی،

٢٣-خەباتی گەلی کورد لەیاداشتەکانی ئەحمەد تەقی، بەغدا ١٩٧٠.

٢٤-الطالباني: جلال، كردستان و الحركة القومية الكردية، بيروت ١٩٧١.

٢٥- جان دۆست، ئاڤین مەگری نەدەن بلا ئەز سبەها مەهابادی ببینم، رامان، ٢٠٠

٢٦- جليلي: جليل: من تاريخ الدول والامارات الكردية في الامبراتورية العثمانية في النصف الاول من القرن التاسع عشر، ديمةشق١٩٨٧

٢٧ـ نهضة الاكراد الثقافية والقومية، وەرگێڕانی باقی نازێ، بيروت،.

٢٨-جمال میرزا عەزیز، لەتاریکیەوە بۆرووناکی، بەڵگەنامەکانی شۆڕشی ١٨٨٠، سلیمانی ١٩٩٩.

٢٩-چیاوك، مەعروف، مأساة البارزان، بغداد١٩٤٥.

٣٠-الحاج: عزيز، القضية الكردية في العشرينات، بيروت١٩٨٤.

٣١-حسامی: کەریم، گزینگ، ژمارە ١٣، ١٤

٣٢- حسرتيان: م، كردستان تركيا بين الحربين، ت: سعداللة ملا، بيروت١٩٨٧.

٣٣- حسن المصطفى، البارزانيون وحركات بارزان، بيروت ١٩٦٣.

٣٤-الحسيني: عبدالرزاق، تأريخ العراق السياسي الحديث جزء الثاني، بيروت"

٣٥ـ تأريخ العراق الجديد، صيدا، ١٩٧٠.

٣٦-حیلمی: رەفیق، یاداشت، بەرگی یەکەم و دووەم و سێیەم ، بەغدا ١٩٨٨

٣٧-خالفين: ن ، الصراع على الكردستان، بغداد ١٩٦٣.

٣٨-خواجە: ئەحمەد، چیم دی، سلێمانی،

٣٩-لازاريف، م، المسألة الكردية،ت/ جعفر خياط، بيروت١٩٩١

٤٠- کێشەی کورد، و/ د.کاوس قەفتان، بەغدا ١٩٩٨.

٤١-الدملوجي: صديق، امارة بهدينان، موصل١٩٥٢

٤٢-قاسملو: د. عبدالرحمن، كوردستان و الاكراد، بيروت،١٩٧٠

٤٣ـ اربعون عاما من الكفاح من اجل الحرية، ت: د.عزالدين مصطفى الرسول، جزء الاول،

٤٤-قەفتان: د.کاوس، چەند لێکۆڵینەوەیەك لەمێژووی بابان، سۆران، بۆتان . بەغدا ١٩٨٥.

٤٥-زکی: موحەمەد ئەمین ناودارانی کورد،

٤٦- تأريخ الدول و الامارات الكرديه، ترجمه/ محمد على عونى ، القاهره ١٩٤٥ .

٤٧- تأريخ السلمانية وانحائها، ت/ الملا جميل الروژبياني ، بغداد ١٩٥٠.

٤٨-رۆژبەیانی: جەمیل، شێخ مەحمودی حەفیدزادە، کاروان، ژمارە (١٣) ١٩٨٧.

٤٩-عەباسی وەلی، دەسەڵاتی سیاسی و حاکمیەت لەکۆماری کوردستان دا ، گزینگ، ژمارە ١٣

٥٠-عەبدوڵا مەردۆخ، کۆمەڵەی ژ. ك و کۆمەڵی هیوا، گزینگ ١٣

٥١- د. عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات و الاحزاب في نصف القرن،

بغداد،١٩٨٩
٥٢- عبدالزيز سلمان النوار، تاريخ العراق الحديث، القاهرة١٩٦٨
**٥٣–عەولە، ساڵێك بوو كورد ئازاد ئەژیا، سوید ١٩٨٨.**
٥٤- عمر عارف، ياداشتهاي أز كردستان ، خاطرات روف ضيا الدين، سنندج١٣٦٧.
**٥٥– غالب: سەباح، دوو دەلاقەی بێهەڵوێست، چاپخانەی هەڵوێست، ١٩٨٤.**
٥٦- الغلامي: عبدالمنعم، الضحايا الثلاث، الموصل ١٩٥٢.
**٥٧– سوجادی: عەلائەدین، شۆڕشەكانی كوردو كۆماری عێراق، بەغدا ١٩٥٨**
٥٨- سون: ميجر ، رحلة (منتكر) الى بلاد مابين النهرين و كردستان، ت/ فوْاد جميل، بغداد١٩٧٠
**٥٩– سەردەشتی: یاسین، دوو تەلەگرافی كاربەدەستی ئێرانیو خۆفرۆشێكی كوردو ساغكردنەوەی مێژووی رووداوی چەككردنی شارەوانی مهاباد، رامان، ژمارە ١٢٠ مایسی ٢٠٠٠.**
٦٠- سعاد روف محمد، نوري سعيد و دوره في السياسة العراقية حتى العام ١٩٤
٦١- سلۆپی: زەنار، في سبيل كردستان، مذكرات، بيروت١٩٨٧.
٦٢- السلطان عبدالحميد، مذكرات السلطان عبدالحميد، ترجمة و تقديم محمد حرب، القاهرة
**٦٣– سەمەدی: سەید موحەمەد، ژێ كاف چی بوو؟ چی دەویست؟ چی لێ بەسەرهات، مهاباد١٩٨١.**
**٦٤– شەمزینی: د. عەزیز، جولانەوەی رزگاری نیشتیمانی كوردستان، و/ فەرید ئەسەسەرد، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٥.**
٦٥- الشاوي: عبدالعزيز، الدولة العثمانية، دولة اسلامية مفترى عليها، الجزْ الرابع ، القاهرة ١٩٨٠.
**٦٦– صالح ئەمین، كوردو عەجەم، مێژووی سیاسی كوردەكانی ئێران، ١٩٩٢**
٦٧- القيسي: ا.س، ياسين الهاشمي و دوره فى السياسة العراقية، ١٩٢٢- ١٩٣٦. بغداد ١٩٧٥.
**٦٨– كريس كۆچيرا، مێژووی كورد لەسەدەی ١٩و ٢٠ و/ موحەمەد ریانی ، تاران ١٣٦٩.**
٦٩- د.كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات حرب العالمية الاولى، ت/ محمد ملا عبدالكريم، بغداد، ١٩٧٧.
٧٠- دور الكرد في الثورة العشرين، بغداد ١٩٧٨.
**٧١–چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی كورد، بەشی یەكەم.، بەغدا ١٩٨٥.**
**٧٢– كەمال نووری مەعروف، شێخ مەحمودی نەمر : خەباتی دژی ئینگلیز، پێشكەوتن، ژمارە () كانوونی دووەم ١٩٨٠**

٧٣- گادانی: جەلیل، ٥٠ ساڵ خەبات، کورتە مێژوویەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بەرگی یەکەم ، هەولێر.

٧٤- گەورانی: علی سیدۆ، من عمان الی العمادیە جولــە فی کردستان الجنوبیە، القاهرە ١٩٣٩

٧٥- نەبەز: جەمال ، ژێکاف و ئایدەلۆژی هوردە بۆرژوای رۆشنبیری ناسیونالست لەکوردستان،

٧٦- کوردستان و شۆڕشەکەی، ستکهۆلم١٩٨٥.

٧٧- ندیم، س، حرب العراق ١٩١٤-١٩١٨، بغداد

٧٨-نجف قولي بسيان، من مهاباد الدامية الى ضفاف اراس، ت/ تيلي امين،

٧٩-نەوشیروان مستەفا ئەمین، حکومەتی کوردستان . کورد لەگەمەی سۆڤیەتی‌دا، رێبەندانی ١٣٢٤-١٣٢٥، هۆڵندا ١٩٩٣.

٨٠-محمودی مەلا عێزەت، دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دوکۆمێنت، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥، بەگی سێیەم.٩.٧٨- کۆماری میللی مهاباد ، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی ، سوید ١٩٨٦.

٨١- محمد فتحي عثمان، من اصول الفكر السياسي الاسلامي، بيروت١٩٨٠

٨٢- محمد فريد بك، تأريخ الدولة العلية العثمانية، بيروت١٩٨٣،

٨٣- مەردۆخی: ایە اللە ، علمە و ادبە کورد، تاران ١٩٨٥.

٨٤- موکریانی: حوسێن حوزنی ، مێژووی میرانی سۆران، هەولێر ١٩٦٢.

٨٥- مینۆرسکی: الاکراد، ت/ د. معروف خزندار، بغداد، ١٩٦٨

٨٦- هاوار: حەمە رەسوڵ ، سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شوکاک) ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥.

٨٧- شێخ مەحمودی قارەمان و... لەندەن١٩٩١.

٨٨- هەورامی: ئەفراسیاو ، هەندێك بەڵگەو بۆچوون لەسەر کۆمەڵەی ژێکاف، بەشی دووەم، لەرووسیەوە وەرگێڕدراوە، رابوون (سوید)، ژمارە ٢٣ ، ١٩٨٨.

٨٩- هەژار، چێشتی مجێور،

٩٠- هێمن ، تاریك و روون، بەغدا ١٩٧٤.

٩١- حقائق دفنية عن محاكم الزعيم القاضي محمد و صدر القاضي و سيف القاضي، ترجمة عبدالله بابان، خەبات عدد، ٤٥٧٦ . دەقی کوردیەکەی لە خەباتی قوتابیان ژمارە ٣٦ی ٢٠٠٠/٨/١٤ بڵاوکراوەتەوە.

٩٢-چەند بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و/ وەرگێڕانی لەتورکیەوە: مستەفا نەریمان، رامان

ژماره ۲-۲ ساڵی ۲۰۰۱.

۹۳- مجله الارشاد، الصادره باسم الاتحاد و الترقی/ فرع بغداد، عدد۱۹ نیسانی ؟ .. ۹٤- بانگی کوردستان، ژماره ٦، ۸ی ئەیلولی ۱۹۲۲ ـ ژماره ۸، ۲۹ ئەیلولی ۱۹۲۲، ژماره ۹ی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۲.

۹٥-ژماره جیاجیاکانی (ڕۆژی کوردستان)

(*) لیستی هەموو سەرچاوەکانی ئەم کتێبەم بەهەرسێ بەرگەوە کە نووسەر ئامادەی کردبێت لەبەردەستدا نەبوو، ئەوەی بەئەرکی لەچاپدانی عەرەبیەکەی بەئەستۆ گرتبووە دیار بوو لەپەراوێزەکانی کتێبەکە لیستێکی گشتی بەکۆمەڵێك ناتەواوی ئامادەکردبوو. من لێرەدا لەدوای هەندێك پوختکردنەوە لیستی کوردیو عەرەبیوفارسیەکەیم دابەزاند بەڵام لیستی سەرچاوە ئینگیزیو تورکیەکان زۆر بوونو جێگەی زۆری دەگرت هەڵمان گرت بۆدوابەرگ . خوێنەر ئەگەر پێویستی پێی بێت دەتوانی لەپەراوێزەکانی ئەم کتێبە یان لەسەرچاوە عەرەبیەکەی بەدەستی بخات، کەهی هەرسێ بەشەکەیە.

وەرگێڕ

# سوپاس و پێزانین

★ بەڕێز ماموٚستا حەمید بڵباس کەبەهەوڵو خەمخۆری ئەو ئەم بەرهەمە بەچاپ گەیشت، بەڵان بەداخەوە لەسەروبەندی بەدواداچوونی ئاکامی هەوڵەکەی بەڕێزیان لەبەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە، هەواڵی مەرگی ناوادەی ئەو گەیشت، ڕێزمو پێزانینم بۆ هەوڵو خەمخۆری خۆیو بنەماڵە بەڕێزەکەیان.

★ بەڕێز وەزیری رۆشنبیری.

★ بەڕێزان بەڕێوەبەرو کارمەندانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپو بڵاوکردنەوە.

★ هەموو ئەو هەوڵە دڵسۆزانەی هاندەرو ئاسانکاربوون لەگەڵمدا بۆ بەرهەمهێنانی ئەم بەرهەمە.

★ دایکی وارڤین کەبەشێکی زۆری کاتی ئەوانو منداڵەکانم گرتووە لەکاتی سەرقاڵیم بەم بەرهەمەوە.

ك.بابان زادە

## پێشکەش بێت :

- بەوانەی دونیایەك ئەزموون، پەند، وانە، ئاسۆڕوونیو چراخان لەمێژوو بۆ ئێستاو ئایندە دەست دەخەن، مێژوو لەلایان زۆر گەورەترە لەسەربوودەو حەکایەتی رۆژانە.

- بەوانەی بڕیارو چوارچێوەی پێشوەخت بۆ مێژوو بڕیار نادەن، وەکو خۆیی بەم فرە رەهەندیەی هەبووە دەی بینن.

- بەهەموو ئەو هاوڕیانەم، بەو خوێندکارانەم کە هێندەی من مێژوویان خۆش دەوێت.

- بەهەر چوار جگەرگۆشەکەم ، بەساتەوەختی ئایندەی رۆشنی ئەوان.

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٥ی

# بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیری

| ز | ناوی کتێب | ناوی نووسەر / وەرگێر | بابەت | جۆری چاپ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٠١ | بەئاشتی کردنی پەروەردە | عەبدولعەزیز عومەر | پەروەردەیی | چاپکردن |
| ٣٠٢ | پیاسەیەك بەکووچەکانی قەدەردا | ئاوێزان نوری | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٣ | گۆڤاری تێکست ژمارە (٥) | چاپ وبڵاوکردنەوە | گۆڤار | چاپکردن |
| ٣٠٤ | دەنگی بلوریی دەق | عەبدولخالق یەعقوبی | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٠٥ | رۆناك | جگەرخوێن | شیعر | چاپکردن |
| ٣٠٦ | بۆ زمان | د.عیزەدین مستەفا | زمانەوانی | چاپکردن |
| ٣٠٧ | دوورگەی بێداری | تەها ئەحمەد رەسوڵ | شانۆگەری | چاپکردن |
| ٣٠٨ | داستانی خەبات و ماڵئاوایی | شێخ حسێنە سوورە | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٠٩ | ماچی گوڵشەن و کانیاوەکانی کوردی | ئەحمەد هیرانی | ئەدەبی | چاپکردن |
| ٣١٠ | شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ | عەبدولقادر ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٣١١ | کورد لەچەند تۆمارێکی مێژوویدا | کەیوان ئازاد ئەنوەر | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣١٢ | فەرهەنگی کورد ناسین | مەلا عەبدولخالق شوانی | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ٣١٣ | شیخ محمد خال مفسرا | عمر علی محمد | ماجستێرنامە | چاپکردن |
| ٣١٤ | دیوانی مەزلوم | ئا/ ئومێد کاکە رەش | دیوانی شیعر | چاپکردن |
| ٣١٥ | دیوانی فۆلکلۆری ناوچەی ئەردەڵان | ئا/ح. موسەنن | فۆلکلۆر | چاپکردن |
| ٣١٦ | ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجییەکان | محەمەد رەئوف ساڵح | رامیاری | چاپکردن |
| ٣١٧ | کێشە نەتەوەییەکان و رووداوە سیاسیەکانی کوردستان و جیهان | د. کەمال مەعروف | لێکۆڵینەوەی سیاسی | چاپکردن |
| ٣١٨ | دڵۆپەی ئەو شیعرانەی قژیان زەردو چاویان شینە | جەبار سابیر | شیعر | چاپکردن |
| ٣١٩ | ئاخاوتنی هەنووکەیی | هەڵکەوت عەبدوڵڵا | لێکۆڵینەوە | چاپکردن |
| ٣٢٠ | کورد لەزەردەشتییەوە بۆ ئیسلام | سامان عوسمان | مێژوویی | چاپکردن |
| ٣٢١ | رۆژنامەڤان | فەرەیدون سامان | رۆژنامەوانی | چاپکردن |
| ٣٢٢ | بیرەوەرییەکانی ژیانی ژێر دەستی | فوئادی تاهیر سادق | بیرەوەری | چاپکردن |
| ٣٢٣ | بیبلۆگرافیای چاپکراوەکانی ب.گ. چاپ و بڵاوکردنەوە | ئا: جەبار سابیر | بیبلۆگرافیای | چاپکردن |

لەنەتەوەی تورك زیاتر هیچ نەتەوەیەكی تر بۆی نی‌یە داوای مافە نەتەوایەتیەكانی خۆی بكات.

(عصمت ئینۆنۆ)

ئەنقەرە لەوانەیە بتوانێت دەریاكان وشك بكات بەلام ناتوانێت ماسیەكانی ئاوی ڕاو بكات.

(یەشار كەمال)

ئەو دەستانە بشكێ كە دەست درێژی دەكەنە سەر سەرپۆش.

(دروشمێكی پارتی [illegible])

ژمارەی سپاردنی (٢٩٥) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی ژین ﴾

نرخی (١٥) دینارە